# لوك

**...ئاگەهیا مە وەکو وی تەختەڕەشێ ڤالاێیە بەری کو مامۆستا بهێتە د پولێ ڤە...**

سۆفیا دەمژمێر هەشت و نیڤێ شەڤێ ژ نوو گەهشتە مال. هەلبەت ئەو نێزیکی دەمژمێر و نیڤان ل سەر ژڤانێ خوە گیرو بوو، ئەرێ ما وێ ژڤانەك هەبوو؟ ب ڕاستی وێ چ ژڤان نەبوون، بەلکو ب تنێ بۆ شیڤێ ل مال نەبوو و بەری هینگێ وێ نامەیەك بۆ دایکا خوە نڤیسابوو و گوتبوویێ کو دێ ل دەمژمێر حەفتێ ئێڤاری زڤڕمە مال.

- "سۆفیا، ب ڤی ڕەنگی ناچیتە سەری، ئەز نەچاربووم تێلەفۆنا پرسگەهێ بکەم و پرسیارا ناڤێ زەلامەکی یێ دبێژنێ ئەلبێرتۆ کو ل تاخێ کەڤن یێ باژێری دژیت بکەم، لێ وان ب من کرە کەنی."

- "ئەز نەشیام زووتر بڤەگەڕمە مال، چونکی ئەم نێزیکی ئاشکەراکرنا نهێنیا مەزن ببووین."

- "ئەڤە چ چیرۆکن تو دبێژی؟"

- "باوەر بکە. ئەز تە پشتڕاست دکەم."

- "ئەرێ تە ئەو داخوازکرە ئاهەنگا ژ دایکبوونا خوە؟"

- "ئوو نە! من ژبیرکر!"

- "باشە. گوهێ خوە بدێ، پێدڤیە سۆباهی تو هەڤنیاسینا من و وی بکەی. نابیت کچەکا وەکو تە یا گەنج بچیتە دەڤ زەلامەکێ ژ خوە مەزنتر."

- "ئەلبێرتۆ نە زەلامەکێ هۆسایە تو هزرێن شاش ژێ بکەی یان ژێ بترسی، بەلکو یا پێدڤیە تو ژ بابێ هێلدێ بترسی؟"

- "ڤێجا هێلد کیە؟"

- "کچا زەلامەکی یە کو نوکە یێ ل لوبنانێ. چ زەلامەکێ نەفرەتکریە! دبیت ئەو کونترۆلێ ل سەر هەموو جیهانێ بکەت."

- "ئەگەر تو ب زووترین دەم هەڤنیاسیا من دگەل ڤی ئەلبێرتۆی نەکەی، ئەز ناهێلم ئێدی تو بچیە دەڤ وی. ئەز ئارام نابم هەتا وی نەبینم."

هزرەك هاتە د سەرێ سۆفیایێ دا، هەر یەکسەر بەرەڤ ژوورا خوە ڤە چوو.

دایکا وێ لێ کرە ڤێژی: "بەلێ پا... دێ هۆسا کیڤە چی؟"

بلەز سۆفیا زڤڕی ڤە ژوورا ڕوونشتێ.

سۆفیا زڤڕی و کاسێتەکا ڤیدیویێ د دەستێن وێ دا بوو و گوت: "نوکە دێ زانی کا خولکێ وی یێ چەوایە. هیڤی دکەم پشتی هینگێ بەلا خوە ژ من ڤەکەی."

- "چیە وی کاسێتەکا ڤیدیویێ ژی دایە تە؟"

- "بەلێ. بەحسێ باژێرێ ئەسینایێ دکەت."

دەمێ سۆفیایێ کاسێتا ڤیدیویێ کریە بەر ئامیرێ خواندنا ڤیدیویان، وێنەیێن ئەکرۆپۆلێ ل سەر شاشا تێلەڤزیونێ دیاربووین. دایکا وێ حێبەتی ما ب دیتنا ڤان دیمەنان، نەخاسم پشتی ئەلبێرتۆ ل سەر شاشێ دیاربووی و بۆ سۆفیایێ دئاخفتی.

لێ سۆفیایێ ژ نوو تیبینیا تشتەکی کر کو جارا بەری هینگێ ئاگەهـ ژێ نەببوو: جهێ ئەکرۆپۆلێ یێ پڕبوو ژ گەشتیاران و دناڤ وان دا کەسەکی لافیتەك هەلگرتبوو و ناڤێ هێلدێ ل سەر هاتبوو نڤیسین. پاشی ئەلبێرتۆ ب سەر ئەکرۆپۆلێ کەفت و ل گوپیتکا ئاریوپاگێ ڕاوەستیا، کو ئەڤە هەر ئەو جهە بوو یێ ڤەشە پۆلسی گوتارەك پێشکێشی

خەلکێ ئەسینایێ کری، ل دووڤ دا ئەلبێرتۆی بەرێ خوە دا کامیرەڤانی و دگەل سۆفیایێ ئاخفت.

ب خورتی دایکا وێ شیا د دوو ڕستەیێن ل دووڤ یەك دا بێژیت.

- "ئەز باوەرناکەم... ئەڤە ئەلبێرتۆیە؟ ئەڤە چیرۆکا وی یا کێڤریشکێ یە. بەلێ سەحکێ ئەو یێ دگەل تە دئاخڤیت. هەروەسا من نەزانیبوو کو قەشە پۆلس یێ چوویە ئەسینایێ."

ئەو پارچا ڤیدیویێ نێزیکی وی دیمەنی دبوون دەمێ باژێرێ ئەسینایێ دهاتە گوهۆڕین بۆ ئەسینایا کەڤن. سۆفیا ژ جهێ خوە ڕابووڤە و چوو ڕاوەستاند، چونکی چ مفا د ئەفلاتۆنی و ئاخفتنێن وی دا نینە بۆ دایکا وێ، یا گرنگ ئەوە دایکا وێ ئەلبێرتۆ دیت.

بۆ دەمەکی، بێدەنگیێ پەڕێن خوە ب سەر ژوورێ دا ئینان، پاشی سۆفیایێ ب تۆڕەی ڤە گوت: "چیە یا ژ تەڤە زەلامەکێ جوان و کەشخەیە."

- "بەلێ پا ئەو زەلامەکێ سەیرە. دیمەنێن ڤیدیویێ ل ئەسینایێ تومار دکەت و پاشی کاسێتا وێ بۆ کچەکێ فرێدکەت کو ب یەکجاری نانیاسیت. باشە ئەو کەنگی چوویە ئەسینایێ؟"

- "ئەز نزانم..."
- "بەلێ پا ئەو..."
- "چ؟"
- "ئەڤە وەکو وی مایجەری یە یێ بەری نوکە دناڤ کۆلکێ دارستانێ دا دژیای."
- "دبیت ئەڤە ئەو ب خوە بیت."
- "بەلێ ئەو نێزیکی پازدە سالان بوو کەس تێڤە نەدژیای."
- "دبیت چووبیتە گەریانەکێ، بۆ نموونە چووبیتە ئەسینایێ."

دایکا وێ سەرێ خوە هەژاند.

- "ئەز دبێژم جارەکێ ل سالێن حەفتێیان من دیتبوو، بەلێ پا ئەو گەلەك ژ ڤی ئەلبێرتۆی مەزنتر بوو یێ ئەڤرۆکە من دیتی. ناڤەکێ سەیر ژی هەبوو."

- "کنوکس؟"

- "چێدبیت. دبیت ناڤێ وی کنوکس بیت."
- "یان ژی دبیت ناڤێ وی کناگ بیت؟"
- "نەخێر. لێ تو بەحسێ چ دکەی، ئەڤ کنوکس و کناگ کینە؟"
- "کنوکس ناڤێ ئەلبێرتۆیە و کناگ ژی بابێ هێلدێ یە."
- "بابەت ل بەر من بەرزە بوو."
- "باشە هندەك شیڤ مایە."
- "بەلێ هندەك گوشتێ مایی، لێ دڤێت بچی گەرم بکەی."

نێزیکی دوو حەفتیان بورین بێ کو سۆفیا چ دەنگوباسان ژ ئەلبێرتۆی بزانیت. د وی ماوەی دا سۆفیایێ کارتەکا پیرۆزباهییێ ب ناڤێ هێلدێ دیت، لێ چ کارتێن پیرۆزباهییێ نەگەهشتنە وێ ب خوە سەرەڕای کو ژڤانێ جەژنا ژ دایکبوونا وێ یێ نێزیك بووی.

وێ ڕۆژێ پشتی نیڤرۆ، سۆفیا ل پاسێ سووار بوو و چوو تاخێ باژێری یێ کەڤن و دەرگەهێ مالا ئەلبێرتۆی قوتا. لێ ئەو ل مال نەبوو. سۆفیایێ نامەیەکا دی ل بەر دەرگەهێ مالا وی دیت کو ئەڤ دێرە ل سەر نڤیسای بوون.

*"پیرۆزباهیێن خوە ب هەلکەفتا جەژنا ژ دایکبوونا تە پێشکێشی تە دکەم، هێلد! ئەم یێ نێزیکی ساتەکێ هەستیار دبین، ساتەکێ ڕاستەقینە کچا من. چەند ئەز هزرێن خوە د ڤێ چەندێ دکەم، هند کەنیا من دهێت هەتا خوە دلێ من خراب دبیت. چ پێنەڤێت ڤێ چەندێ پەیوەندی ب بێرکلی ڤە هەیە."*

بەری سۆفیا ژ وێرێ بچیت، ئەو نامە هەلگرت و کرە د سندوقا پۆستەی یا ئەلبێرتۆی دا. باشە! نابیت ئەو چووبیتە ئەسینایێ؟ چەوا ئەو دێ وێ بجه هێلیت کو هێشتا ب هزاران پرسیارێن بێ بەرسڤ د سەرێ وێ دا مایینە؟

ل ڕۆژا 14 خزیرانێ، دەمێ ئەو ژ قوتابخانێ دزڤڕی، وێ هێرمس دناڤ باخچەی مالا خوە دا دیت. سۆفیا بەرەڤ وی ڤە چوو و ئەو ژی ب غاردان بەرەڤ سۆفیایێ هات و هەردووکان هەڤدوو هەمبێز کر. سۆفیایێ ئەو هۆسا دابوو بەر سینگێ خوە دابێژی ئەو

بەرسڤا پرسیارێن وێ هەموویان دزانیت. سۆفیایێ نامەیەك بۆ دایکا خوە نڤیسی و ئەڤ جارە ناڤونیشانێن مالا ئەلبێرتۆی تێدا دیارکربوون.

سۆفیا ب ناڤ باژێری کەفت و هزرا خوە د ڕووژا پاشتر دا دکر، نە ب تنێ ژبەرکو ڕۆژا جەژنا بوونا وێ یە، بەلکو جەژنا قەدیس یوحەنایە ژی و ئەو دێ هەردوو جەژنان کەتە یەك. زێدەباری ڤێ چەندێ، سوباهی جەژنا ژ دایکبوونا هێلدێ یە ژی. هەستەکێ سەیر دگوتە وێ کو دێ تشتەکێ مەزن ڕوودەت. دێ هەرچەوا بیت، ژ نوکە وێڤە کارتێن پیروزباهییێ ژ لوبنانێ بۆ وێ ناهێن.

ب ڕێکێ ڤە، دەمێ ئەو دناڤ باخچەی وی تاخێ کەڤن ڕا بورین، هێرمس ل بەرامبەر کورسیکەکا داری ڕاوەستیا. هۆسا دیارە وی دڤیا بێژیتە سۆفیایێ ل ڤێرێ بڕوونە خوارێ، ژبەر هندێ سۆفیایێ گوهداریا وی کر و دەستێ خوە د سەر گەردەنا وی ڕا دئینا و بر و تەماشەی چاڤێن وی دکر. دەمێ شەپیلکێن وی لڤلڤین، سۆفیایێ هزرکر ئەو دێ ڕەویت، بەلێ پا ئەو نەڕەوی، بەلکو گوت: "جەژنا بوونا تە پیرۆز، هێلد".

سۆفیا د جهێ خوە دا هشك بوو، ئەرێ ئەڤە سە بوو ئاخفتی؟

نە نە، ئەڤە جۆرەکێ خەیالێ یە تووشی وێ بووی، ژبەرکو هندی هزرێن خوە د هێلدێ دا دکەت. بەلێ پا دەنگەکی د ناخێ وێ دا دووپات دکر کو وێ ئەڤ ئاخفتنە ژ سەی یێن گوهلێبووین.

پشتی بێهنەکێ، هەموو تشت وەکو بەرێ زڤڕین. هێرمس دوو سێ جاران ب دەنگەکێ بلند ڕەوی، دیارە وی دڤیا وێ گومانێ ل دەڤ سۆفیایێ نەهێلیت کو بەری نوکە وەکو مرۆڤان ئاخفت بوو. پشتی هینگێ ئەو بەرەڤ مالا ئەلبێرتۆی چوون. ل ئەسمانی، هندەك عەورێن مەزن خوە دابوو یەك، هۆسا دیارە دێ ڕەوشا سەقای هێتە گوهۆڕین.

هێشتا ئەلبێرتۆی ب دروستاهی دەرگەهـ نەڤەکری، سۆفیایێ دەست ب ئاخفتنێ کر.

- "چ چڤێلیا نەکە، هیڤی دکەم. تو گەمژەیەکێ مەزنی و تو ژی ڤێ چەندێ باش دزانی؟"

- "نوكه بۆ من بێژه چ چێبوويه؟"
- "وی مایجەری هێرمس ژی فێری ئاخفتنێ کر."
- "باشه. ئەو شیا ڤێ چەندێ بکەت؟"
- "بەلێ."
- "باشه هێرمسی چ گوت؟"
- "هزرا خوه بکه!"
- "جەژنا بوونا تە پیرۆز، یان ژی تشتەکی ب ڤی شێوەی."
- "تو ب سەرکەفتی."

ئەلبێرتۆی سۆفیا داخواز کره د ژوور ڤه، ئەڤ جاره هندەك جلکێن هۆسا کربوونه بەر خوه کو گەلەك ژ یێن جارا دی د جودا نەبوون بەلکو ب تنێ کێمتر هاتبوونه نەخشاندن. دەمێ سۆفیا چوویه د ژوور ڤه، گوت: "بەلێ پا ئەڤە هەموو سحبەت نەبوو، بەلکو هێشتا یا مایی."

- "مەرەما تە چیه؟"
- "ئەرێ تە چ نامە د سندوقا پۆستەی دا نەدیتن؟"
- "بەلێ، لێ من یەکسەر هاڤێتە د تەنەکا گلێشی دا."
- "باشه بیرکلی چ ل وی کریه هەتا هۆسا بکەتە کەنی؟"
- "دێ خوه گرین دا بزانین کا چ گوتیێ."
- "باشه ما ئەڤرۆکه تو بۆ من بەحسێ فەلسەفا وی ناکەی؟"
- بەلێ، ئەڤرۆکه دێ بەحسێ وی بۆ تە کەم."

ئەلبێرتۆ روونشت و دەست ب ئاخفتنێ کر.

- "جارا دوماهیێ من بۆ تە بەحسێ دیکارت و سپینوزای کربوو کو هەردوو د خالەکێ دا د هەڤپشك بوون، ئەو ژی هەردوو فەیلەسۆفێن راشیونالیزمی بوون."

- "و راشیونالیزمی ئەو کەسه یێ باوەریێ ب دەستهەلاتا رەها یا ئەقلی دئینیت."

- "بەلێ. فەیلەسۆفێ راشیونالیزمی هزر دکەت ئەقل بنیاتێ هەموو زانست و زانینێ یه. هەروەسا ئەو د وێ باوەرێ دایه دەمێ مرۆڤ دهێتە سەر دنیایێ هندەك زانین و بیرۆکه

دگەل هەنە "بیرۆکەییێن زکماکی" و دناڤ ئاگەهیا وی دا هاتینە هەلگرتن بەری کو چ سەربۆر و تاقیکرن د ژیانێ دا هەبن. هەرچەند ئەڤ بیرۆکەیە د ڕۆهنتر بن، پتر دێ دگەل کەتواری گونجن. ئەرێ بیرا تە دهێت کو ب هاریکاریا بیرۆکەیا بونەوەرێ تەمام، دیکارت گەهشتە وی دەرئەنجامی کو یا پێدڤیە خودایەك هەبیت."

- "چیە تو هزر دکەی ئەز هۆسا زوو تشتان ژبیر دکەم."

- "باشە، ئەڤ جۆرێ هزرکرنێ تشتەکێ نموونەیێ بوو ژ بۆ فەیلەسۆفێن چەرخێ هەڤدێ کو بەری هینگێ ب شێوەیەکێ نە هند بەربەلاڤ د چەرخێن ناڤەڕاست ژی دا هەبوو. بیرا مە دهێت سۆکرات و ئەفلاتۆنی ژی باوەری ب ڤێ چەندێ هەبوو. لێ ل دەستپێکا چەرخێ هەژدێ هێدی هێدی تووشی ڕەخنەگرتن و ڕەتکرنێ بوو، نەخاسم ل سەر دەستێ خوەدانێن ڕێبازا ئیمپریسیزمی* یێن دیتنەکا تایبەت هەی کو دگوت مە چ ئاگەهی یان زانین ل دور چ تشت و ڕوودانان نابیت هەتا ب ڕێکا هەستێن خوە هەست پێنەکەین."

- "باشە، ئانکو دێ ئەڤرۆ بۆ من بەحسێ فەیلەسۆفێن ئیمپریسیزمی کەی؟"

- "دێ پێکۆلێ کەم. فەیلەسۆفێن سەرەکی یێن ئیمپریسیزمی ئەڤەنە: لوك و بێرکلی و هیوم، هەرسێ ژی بریتانی بون. لێ فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی یێن مەزن: دیکارت یێ فڕەنسی، سپینوزا یێ هۆلەندی و لیبینزێ یێ ئەلْمانی بوون. ژبەر هندێ هەتا ڕادەیەکی ئەم دشێین ئیمپریسیزما بریتانی و ڕاشیونالیزما کێشوەری "مەرەم ژێ کێشوەرێ ئەوروٚپا" ژێکجودا بکەین."

- "باشە دێ شێی دووبارە بۆ من بەحسێ ڕامانا پەیڤا ئیمپریسیزم کەی؟"

- " ئیمپریسیزمخواز ئەو کەسە یێ هەموو پێزانینێن خوە ب ڕێکا هەستان ژ جیهانێ وەردگریت. ل ڤێرێ پێدڤیە بیرا خوە ل شێوازێ ئەڕستۆی یێ کلاسیکی بینین دەمێ گوتی: "چ تشت دناڤ ئاگەهیا مرۆڤی پەیدانابن ئەگەر بەری هینگێ هەستێن مە هەست پێ نەکەن". هەلبەت ڤێ بۆچوونێ ڕەخنەیەکا ڕاستەخو ل تیورا بیرۆکەیان یا ئەفلاتۆنی دگرت دەمێ دگوتی: "دەمێ مرۆڤ ژ دایك دبیت، کومەکا بیرۆکەیان ژ جیهانا بیرۆکەیان

---

* ئیمپریسیزم Empiricism ب زمانێ عەرەبی ژی دبێژنێ "الفلسفه التجريبيه" ڕێبازەکا فەلسەفی یە دبێژیت هەموو زانینا مە ژ ئەنجامێ تاقیکرن و هەستێن مە دهێت نەك ب ڕێکا ئەقلێ مە.

دگەل خوە ئینااینە". ڤێ جارێ لوکی ئاخفتنا ئەرستۆی بکارئینا داکو پێ ڕەخنێ ل دیکارتی بگریت."

- "چ تشت دناڤ ئاگەهیا مرۆڤی پەیدانابن ئەگەر بەری هینگێ هەستێن مە هەست پێ نەکەن."

- "بەری ئەم بهێینە د ڤێ جیهانێ دا، مە چ هزر یان بیرۆکە ل سەر نەبوون. ئەگەر مە بیرۆکەیەك یان هزرەك ل سەر تشتەکی هەبیت کو هێشتا مە تاقی نەکر بیت، ئەو بیرۆکەیە یا شاشە. بۆ نموونە، ئەقلێ مە دێ ل تشتەکێ ڤالاْ گەڕییێت و چ بدەستڤە نائینیت ئەگەر بەردەوام ل زاڕاڤێن "خودا" و "نەمری" و "ماددەیێ ڕەسەن" بگەڕییێت، چونکی چ مرۆڤان خودا نەدیتیە یان ژی ژیانا هەتا هەتایێ و نەمری تاقینەکریە هەتا بزانیت یا چەوایە، هەروەسا چ مرۆڤان ئەو ماددەیێ ڕەسەن ژی نەدیتیە یێ فەیلەسۆف دبێژنێ "ماددەیێ بنەڕەت". ب ڤی ڕەنگی، ل دەمێن خوە یێن ڤالاْ ئەم دشێین چەندین نامێن زانست و زانینێ بنڤیسین بێ کو ل دوماهیێ چ ئەنجامێن زانینێ یێن نوو و کەتواری بهەلگرن، دبیت ئەڤە جۆرەکێ هەڤڕکیەکا بلیمەت ژی بیت، لێ د ڕاستی دا ب تنێ شێوازەکێ داڕێژتنا فەلسەفی یە نەك زێدەتر کو پێکۆلێ دکەت دووبارە ل هەموو تشتان بگەڕییێت ژ بۆ بدەستڤەئینانا هندەك تشتێن هوور و بچووك، هەروەکو کا چەوا دەمێ کەسەك ب بێژنگێ دناڤ هەڕی و تەڤنێ دا ل زێڕی دگەڕییێت، لێ ل دوماهیێ ژ بلی هندەك دنکدکێن گەلەك کێم یێن زێڕی چ دی نابینیت."

- "ئەم دشێین بێژین ئەڤ دندکە هندەك سەربۆرێن ڕاستەقینەنە؟"

- "ئەگەر هۆسا ژی نەبیت، هەر چ نەبیت هندەك بیرۆکەنە کو پەیوەندی ب سەربۆرێن مرۆڤان ڤە هەیە. فەیلەسۆفێن ئیمپریسیزمی پێشنیار دکر دووبارە چاڤخشاندنەکێ ل هەموو بیرۆکەیێن مرۆڤی بکەن داکو پشتڕاست بن ل سەر بنەمایێ سەربۆران هاتینە وەرگرتن. ل ڤێرێ ئەم دێ یەك یەکە بەحسێ وان فەیلەسۆفان کەین."

- "باشە گوهێ من یێ ل تە."

- "یەکەم فەیلەسۆفێ ئینگلیزی، ناڤێ وی جون لوك بوو کو د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن 1632 هەتا 1704ێ زاینی دا ژیایە. لوکی گرنگترین پەڕتووکا خوە ل سالا 1690ێ ل ژێر ناڤێ "تاقیکرنەك ل سەر تێگەهشتنا مرۆڤی" بەلاْڤکربوو کو پێکۆل دکر

دوو مژارێن سەرەکی ڕۆهن بکەت: مژارا یەکی ل دور هندێ بوو کا ئەرێ بنیاتێ بیرۆکە و هزرێن مە ژ کیڤە دهێت، مژارا دووێ ژی ل دور ڕاستگوییا هەستێن مەیە، ئانکو ئەو تشتێن هەستێن مە بۆ دیار دکەن کا د ڕاستن یان نە."

- "پرۆژەیەکێ بالکێشە!"

- "دا دەست ب خواندنا مژارا وی یا یەکێ بکەین: لوکی باوەرێ ب وێ چەندێ هەبوو کو هەموو بیرۆکە و هزرێن د سەرێ مە دا، بەرهەمێ سەربۆرێن مە یێن جودا جودایە. ئاگەهیا مە بەری هەست ب تشتێن دەوروبەر بکەت، وەکو لیستەکا ڤالا Tabula Rasa بوو."

- "پێدڤی ناکەت تو ب لاتینی باخڤی."

- "بەری ئەم تشتەکی ببینین یان هەست پێبکەین، ئاگەهیا مە وەکو تەختەڕەشێ ڤالایە بەری کو مامۆستا بهێتە د پولێ ڤە و تشتەکی ل سەر بنڤیسیت. هەردیسان لوکی ئاگەهی ب هۆلەکا بێ کەلوپەل هەڤبەر دکر. مرۆڤ هێدی هێدی ب هاریکاریا هەر پێنج هەستێن خوە: دیتن و بێهنکرن و تامکرن و گوهلێبوون و دەستکرنێ هەست ب جیهانا دەوروبەر دکەت. هەستێن زارۆکێن بچووك پتر د چالاکن و هەست ب تشتان دکەن، ژبەر هندێ ل ڤێرێ ئەو تشت پەیدادبیت یێ لوکی دگوتیێ "بیرۆکەیێن هەستکرنێ یێن سادە". لێ ئاگەهیا مە ڤان بیرۆکەیان ب شێوەیەکێ نەرێنی وەرناگریت، بەلکو ل هەمبەری وان دڕاوەستیت و ددانتە دبن دانوستاندن و شرۆڤەکرنان دا و دکەتە جهێ گومانێ. ژ ئەنجامێ ڤێ چالاکیا بیرتیژی، ئەو تشت پەیدادبیت یێ لوکی دگوتیێ "بیرۆکەیێن ڕەنگڤەدایی"، ل ڤێرێ لوك "هەستکرن" و "هزرکرن"ێ ژێکجودا دکەت، ژبەر هندێ پێدڤیە ئەم د هشیار بین."

- "د هشیار بین؟"

- "لوکی جەختی ل سەر هندێ دکر کو هەست دشێن هاریکاریا مە بکەن ئەم هندەك هزرێن سادە وەربگرین. بۆ نموونە دەمێ مرۆڤ سێڤەکێ دخوت، نەشێت هەست ب سێڤێ هەموویێ بکەت، بەلکو ب ڕێکا هژمارەکا هزرێن سادە ژ نوو دزانیت کا ساخلەتێن وێ سێڤێ هەموو د چەوانە، ڕەنگێ وێ یێ کەسك، بێهنا وێ یا خوش و نوو، تاما وێ یا پیچەکێ ترش. هەردیسان دەمێ مرۆڤ سێڤەکێ ب تنێ ژی دخوت نەشێت ڤان هەستان هەموان

وەربگریت ب تنێ پشتی هینگێ نەبیت دەمێ هژمارەکا سێڤان دخوت کو لوك دبێژێت ژ نوو مرۆڤ دزانیت کا پێکهاتەیا تەمام یا سێڤێ یا چەوایە."

- "هەر چ نەبیت، مرۆڤ دشێت خوە پشتراست بکەت و بێژیت ئەو تشتێ مرۆڤی دیتی، گوهلێبووی یان تامکریێ، هەر ب وی ڕەنگی نە یێن ئەم هەست پێدکەین."

- "بەلێ و نەخێر. ڤێ چەندێ بەری لوکی دا پرسیارەکێ کو بەرسڤێ ل سەر بدەت. وی بەری نوکە ل پرسیارا یەکێ دیارکر کا ژێدەرێ بیرۆکەیێن مە ژ کیڤە دهێت. نوکە ژی یێ پرسیار دکەت ئەرێ ژ ڕاستا جیهان یا ب وی شێوەیە یێ ئەم دبینین؟ تو دبینی سۆفیا ئەڤ پرسیارە نە گەلەك یا ڕۆهن و ئاشکەرایە، ژبەر هندێ نابیت ئەم بلەز خوە پاڤێژینە دەرئەنجامان، ب ڕاستی ژی ئەڤ خالە گەلەگ یا گرنگە و نابیت فەیلەسۆفێ ڕاستەقینە چ جاران وە بکەت، ئانکو لەزێ د دەرئەنجامان دا بکەت."

- "باشە گوهێ من یێ ل تە و ئەز چ نابێژم."

- "لوکی هەستێن مە دناڤبەرا ساخلەتێن "سەرەکی" و ساخلەتێن "ناڤنجی" دا دابەش دکرن. بۆ ڤێ چەندێ ژی وی پشتا خوە ب بۆچوونا فەیلەسۆفێن بەری خوە گەرم دکر، بۆ نموونە دیکارتی."

- "ئانکو چەوا؟"

- "ساخلەتێن سەرەکی یێن هەستان دەربڕینێ ژ قەبارە و سەنگ و شێوە و لڤین و هژمارێ دکەت. ئەم دشێین بێژین هەستێن مە پێزانێن پێدڤی دەربارەی ڤان ساخلەتان ددەتە مە. هەردیسان دەمێ ئەم دبێژین ئەڤ تشتە یێ شیرینە، تەعلە، کەسکە، سۆرە یان یێ گەرم و تەزی یە، ئەڤ ساخلەتە ب بۆچوونا لوکی دهێنە هەژمارتن ژ ساخلەتێن ناڤنجی یێن هەستان. ئەڤ جۆرە ساخلەتە، ئانکو ڕەنگ و بێهن و تام و دەنگ، ساخلەتێن ڕاستەقینە یێن ناڤخویا وان تشتان بۆ مە دیار ناکەن، بەلکو ب تنێ ڕاستیا وان یا دەرەکی کارتێکرنێ ل سەر هەستێن مە دکەت."

- "ئانکو هەریەك دەربڕینێ ژ بۆچوونا خوە یا تایبەت دکەت."

- "هەلبەت. هەموو کەس دشێن ل سەر ساخلەتێن سەرەکی وەکو قەبارە و سەنگ د هەڤڕا بن و گەنگەشێ ل سەر نەکەن، چونکی ئەو دەربڕینێ ژ ناخێ وی تشتی ب خوە دکەن. بەلێ پا ساخلەتێن ناڤنجی وەکو ڕەنگ و تامێ، ژ کەسەکی بۆ کەسەکێ دی و ژ

گیانەوەرەکی بۆ گیانەوەرەکێ دی د جودانە، ژبەرکو ئەو پشتا خوە ب سروشتێ هەستێن وی تاکەکەسی ب تنێ گەرم دکەت."

- "دەمێ جوانا پڕتەقالەکێ دخوت، وێ تامێ ژێ دئینیت دێ بێژی یا لەیمونەکا ترش دخوت هندی مرچ مرچێ ژێ دئینیت، لێ هەمان پڕتەقال بۆ من یا شیرینە."

- "ل ڤێرێ کەس ژ هەوە یێ دروست و کەس یێ شاش نینە. ژبەرکو ب تنێ هوون یێ دەربڕینێ ژ کاریگەریا پڕتەقالێ ل سەر هەستا خوە یا تامکرنێ دکەن. بۆ ڕەنگی ژی مرۆڤ دشێت هەمان تشت بێژیت. بۆ نموونە، دێ بێژین تو حەز ژ ڕەنگێ سۆری ناکەی بەلێ پا جوانا هاتە دەڤ تە و کراسەکێ سۆر یێ ل بەر، ل وی دەمی نابیت تو ڕەخنێ لێ بگری و مایێ خوە د زەوقا وێ بکەی، ژبەرکو هوون هەردوو ب یەك چاڤ تەماشەی وی ڕەنگی ناکەن، ژبەر هندێ کەس ژ هەوە نەشێت بێژیت کراس یێ جانە یان کرێتە و بۆچوونا خوە ل سەر یا دی زالێ بکەت."

- "بەلێ پا خەلك هەموو دزانن کو پڕتەقال یا گرۆڤرە."

- "بەلێ. ئەگەر پڕتەقالەکا گرۆڤر د دەستێن تە دا بیت، مەحالە هزر بکەی شێوێ وێ یێ چوارگوشەیە. دبیت تو هزر بکەی کا یا ترشە یان شیرینە، بەلێ پا تو نەشێی هزر بکەی سەنگا وێ هەشت کیلونە ل دەمەکی کو سەنگا وێ ب تنێ دوو سەد گرامن. دبیت تو ب پشتڕاستی ڤە هزر بکەی کو سەنگا وێ چەند کیلویەکن، لێ تو دێ یا شاش بی دەمێ وە دبێژی. دەمێ کومەکا خەلکی هەر یەك ب شێوەیەکێ ژمارەیەکێ بۆ سەنگا وێ دبێژیت، چ پێنەڤێت ژمارا کەسەکی ژ وان دێ پتر نێزیکی سەنگا وێ یا ڕاستەقینە بیت. ئەم دشێین ڤێ نموونێ ل سەر هەموو تشتان پڕاکتیزە بکەین وەك هژمارا تشتێن دەوروبەر و بارێ وان یێ ڕاوەستیان و لڤینێ."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "دەربارەی کەتوارێ ئەسمانی ژی "درێژبوون"ێ، لوك ژی پشتا خوە ب بۆچوونا دیکارتی گەرم دکەت و دانپێدانێ ب هەبوونا هندەك ساخلەتان دکەت کو د شیانێن ئەقلی دا هەیە هزر تێدا بکەت."

- "نە هند تشتەکێ ب زەحمەتە ئەگەر هەموو کەس ل سەر ڤێ خالێ ڕێبکەڤن."

- "ژ لایەکێ دی ڤە، لوك ڕێکێ ل هەمبەر زانینەکا ڕاستەخو یان نیشاندەر ڤەدکەت، ئەو د وێ باوەرێ دایە کو هندەك ڕێسایێن ئەتیکی یێن سەرەکی بۆ هەموو تشتان بکێر دهێن. ئانکو دگەل وی تشتی یێ هەڤڕایە یێ دبێژنێ "مافێ سروشتی" کو ئەڤە ژی یەکە ژ ساخلەتێن فەلسەفەیا ڕاشیونالیزمی. هەردیسان دووپات دکەت کو دناڤ ئەقلێ مرۆڤان دا، بیرۆکەیا خودای تێدا هەیە."

- "دبیت ئەو یێ شاش نەبیت."

- "بۆ چ تشت؟""

- "دەمێ هەبوونا خودای دووپات دکەت."

- "ئەم دشێین هزرا خوە د هەموو تشتان دا بکەین. لێ ب بۆچوونا وی، مژار نە مژارا باوەریێ یە، بەلکو مژارا ئەقلێ مرۆڤی یە. ئەڤ تێگەهێ خودای، کو ئەو ژی یەکە ژ ساخلەتێن فەلسەفا ڕاشیونالیزمی، ئازادیا بیروباوەر و لێبورینێ ل سەر مە زالێ دکەت. هەردیسان لوکی گرنگیددا وەکهەڤیا دناڤبەرا هەردوو ڕەگەزان دا، ئەو د وێ باوەرێ دابوو کو سروشت نەبوویە ئەگەر ژن ب چاڤەکێ کێمتر ژ زەلامی بهێتە تەماشەکرن، بەلکو مرۆڤان ب خوە ئەڤ چەندە کریە و ئەو کێمتر لێکریە، ژبەر هندێ، دشیان دا هەیە ئەڤ جوداهیە بهێنە لادان و نەمینن."

- "ئەڤ چەندە بۆچوونا منە ژی."

- "لوك ژ فەیلەسۆفێن دەستپێکێ بوو یێن بانگەوازی بۆ وەکهەڤیا دناڤبەرا هەردوو ڕەگەزان دا دکری، ڤێ بۆچوونا وی کاریگەریەکا مەزن ل سەر هاولاتیێ وی "جون ستیوارت میل"ی هەبوو کو ئەوی ژی ژ لایێ خوە ڤە خەبات ژ بۆ بدەستڤەئینانا ڤێ وەکهەڤیێ دکر. یا ئاشکەرا یە کو لوك د چەندین خالان دا بەری سەردەمێ خوە دچوو، ژبەر هندێ دووبارە بیروبۆچوونێن وی ل فرەنسا ل چەرخێ هەژدێ هاتنە ساخکرن کو دبێژنێ چەرخێ ڕەوشەنگیریێ. ئەو چەندە بەسی وی یە کو ئەم دەیندارێن وی نە ژبەرکو بۆ یەکەم جار بنیاتێ دابەشکرنا دەستهەلاتێ پێشنیار کر."

- "مەرەما تە دابەشکرنا دەستهەلاتێ دناڤبەرا هژمارەکا دەزگەهێن سیاسی دا."

- "ئەرێ بیرا تە دهێت ئەو چ دەزگەهن؟"

- "دەستهەلاتا تەشریعی "یاسادانان" ئانکو پەرلەمان،، دەستهەلاتا دادوەری ئانکو دادگەهـ و دەستهەلاتا بجهئینانێ، ئانکو حکومەت."

- "ئەڤ هەرسێ دابەشکرنە ژ لایێ فەیلەسوٚفێ فرەنسی یێ چەرخێ رەوشنگیریێ "مونتسکیوی" ڤە هاتبوونە دانان، بەلێ پا لوك یێ رژد بوو ل سەر هندێ کو دەستهەلاتێن تەشریعی و بجهئینانێ ژێك بهێنە جوداکرن داکو دکتاتور پەیدانەبن. لوك ل سەردەمێ لویسێ چواردێ دژیا، ئەوێ دەستێ خوە دانایە سەر هەموو دەستهەلاتان و دگوتی: "ئەز وەلاتم!". ئەم دبێژین لویس پاشایەکێ خوەدان دەستهەلاتەکا رەها بوو، ئانکو وی دەستهەلاتا خوە ل سەر بنەمایی دادپەروەریێ بکارنەدئینا. داکو وەلاتەکێ دادپەروەر ئاڤا بکەین، لوکی دگوت پێدڤیە نوینەرێن خەلکی یاسایان بدانن و پاشی شاهـ یان حکومەت وان یاسایان بجهـ بینیت.

# هيوم

*... پێدڤیه بهاڤێژینه دناڤ ئاگری دا...*

ئەلبێرتۆ بۆ ماوەیەکی ڕاوەستیا و پاشی د پەنجەرکێ ڕا تەماشەی ژ دەرڤە کر.

سۆفیایێ گوت: "هۆسا دیارە دنیا بۆ عەور."

- "بەلێ، عەوران یا خوە دایە یەك و ئەسمانێ گرتی."
- "باشە دێ نوکە بۆ من بەحسێ بێرکلی کەی؟"

- "ئەو دووەم فەیلەسۆفێ ئیمپریسیزمی یێ ئینگلیزی یە، لێ پیچەکێ ژ فەیلەسۆفێن دی یێ جودایە، ژبەر هندێ من دڤێت بەری وی پیچەکێ بۆ تە بەحسێ "دێڤید هیوم"ی بکەم ئەوێ دناڤبەرا سالێن 1711 هەتا 1776ێ زاینی دا ژیای و هەتا نوکە یەکە ژ کاریگەرترین فەیلەسۆفێن ئیمپریسیزمی. هەردیسان هەر ئەڤ فەیلەسۆف بوو یێ بوویە ئەگەر فەیلەسۆفێ مەزن "کانت" سەر ب ڕێکا خوە یا فەلسەفی یا تایبەت هەلببیت."

- "بەلێ پا من پتر حەز دکر تو ب من بەحسێ بێرکلی بکەی."

- "ئەڤ چەندە نە یا گرنگە. هیوم ل وەلاتێ ئوسکوتلەندا ل دەوروبەرێن باژێرێ ئەدەنبورگ مەزنبوویە. خێزانا وی دڤیا ئەو بچیتە کولیژا یاسایێ لێ وی دگوت "هەستەکێ د ناخێ من دا دژی هەمو تشتانە ب تنێ فەلسەفە و ڕەوشەنبیریا گشتی نەبیت".

- "هیوم ل سەردەمێ ڤۆلتێر و جان جاك ڕوسوی ژیابوو، ئانكو ل چەرخێ ڕەوشەنگیریێ. وی بەشەكێ مەزن ژ ژیانا خوە ب هاتن و چوونێ و كوچەریێ ڤە دناڤبەرا وەلاتێن ئەوروپی دا بوراند بوو بەری كو ل باژێرێ ئەدەنبورگ ئاكنجی ببیت. دەمێ ژیێ وی بووینە 28 سال، پەڕتووكا خوە یا ب ناڤێ "نامەیەك ل دور سروشتێ مرۆڤی" بەلاڤكر، لێ وی جەختی ل سەر هندێ دكر كو هزرا بەلاڤكرنا ڤێ پەڕتووكێ هەر ژ ژیێ 15 سالیێ د سەرێ وی دا بوو."

- "باشترە تو لەزێ بكەی، چونكی ئەز نەشێم وەختێ خوە ب هەروە بورینم."

- "بەلێ پا تە ب خوە یا دەستپێكری."

- "بەلێ پا هەكە ئەز فەلسەفەیا خوە یا تایبەت بداڕێژم، دێ گەلەك یا جودا بیت ژ هەموو وان تشتێن بەری نوكە من گوهلێبووین."

- "بۆچی ما تشتەك مایە مە بەحس نەكری یان پشتگوهـ هاڤێتی؟"

- "بەلێ. ل دەستپێكێ: هەموو ئەو فەیلەسۆفێن هەتا نوكە تە بەحسا وان بۆ من كری زەلام بوون و وەكو یا دیار زەلامان جیهانا خوە یا تایبەت هەیە. لێ ئەز پتر گرنگیێ ددەمە كەتواری، گولان، گیانەوەران، زارۆكێن ژ نوو دهێنە سەر دنیایێ هەتا مەزن دبن. لێ ئەو فەیلەسۆفێن تو بەحسێ وان بۆ من دكەی بەحسا چ تشتان ژ بلی مرۆڤی ناكەن، ئاها ئەڤە تو دێ بۆ من بەحسێ فەیلەسۆفەكێ دی ژی كەی كو یەكەم نامەیا وی ژی ل دور سروشتێ مرۆڤی یە! یا دیارە ئەڤ مرۆڤە ژی كەسەكێ تەمام و پێگەهشتی یە، ل دەمەكی كو ژیان ژ دووگیانی و ژ دایكبوونێ دەست پێدكەت. باشە بۆچی ئەم ڤێژیێن زارۆكێ ژ نوو پەیدابووی پشتگوهـ دهاڤێژین؟ هەردیسان گەلەك كێم من گوهـ ل بابەتێ حەژێكرن و هەڤالینیێ بوویە."

- "تو ڕاست دبێژی، بەلێ پا هیومی دیتنەكا جودا ژ فەیلەسۆفێن دی هەبوو. هیومی پتر بەحسێ ژیانا ڕۆژانە دكر و گەلەك ب سانەهی دشیا خوە بدانیتە جهێ زارۆكان و تەماشەی جیهانێ بكەت، ئانكو ئەو ل جهێ وان كەسێن ژ نوو دهێنە سەر دنیایێ تەماشەی دەروبەرێن خوە دكەت."

- "باشە دێ پێكۆلێ كەم خوە د فەلسەفەیا وی ژی بگەهینم."

- "وەك فەیلەسۆفەكێ ئیمپریسیزمی، هیومی پێكۆل دكر بیرۆكە و تێگەهێن فەلسەفی یێن نە ڕۆهن و ئاشكەرا یێن فەیلەسۆفێن بەری خوە ڕێكبێخیت، چونكی ل سەردەمێ وی هژمارەكا مەزن یا تێگەهـ و بیرۆكەیێن بێ مفا یێن فەیلەسۆفێن چەرخێن ناڤەڕاست و فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی یێن چەرخێ هەڤدێ كەفتبوونە سەر یەك. وی پێشنیار دكر بڤەگەڕینە سەربۆرێن خوە یێن ڕاستەقینە د ژیانێ دا. وی دگوت : "چ فەیلەسۆف نەشێن مە ژ سەربۆرێن ڕۆژانە دوورتر ببەن، یان ژی هندەك ڕێسایێن ڕەفتاركرنێ یێن جوداتر ژ سەربۆرێن ڕۆژانە بداڕێژیت."

- "هەتا نوكە بابەت یێ بالكێشە، نموونەیەكێ بۆ من بینە دا پتر تێبگەهم؟"

- "بۆ نموونە، هەبوونا فریشتەیان، یەك ژ بیروباوەرێن هەرە بەربەلاڤ بوو. ل ڤێرێ مەرەما مە ژ فریشتەیان بونەوەرەكێ خوەدان دوو شاپەڕە. ئەرێ تە كەسەك دیتیە دوو شاپەڕ هەین؟"

- "نەخێر."

- "باشە تە لەشێ مرۆڤەكی دیتیە؟"

- "ئەڤە چ پرسیارەكا تەمسارە!"

- "باشە تە دوو شاپەڕ دیتینە؟"

- "چ پێنەڤێت، بەس نە ب لەشێ مرۆڤان ڤە."

- "ب دیتنا هیومی، فریشتە "بیرۆكەیەكا ئالۆزە" و ژ دوو سەربۆرێن جودا پێكدهێت كو د ژیانا ڕۆژانە دا چ پەیوەندی دگەل یەك نینە، بەلكو ئاشوپا مرۆڤی ئەو یێن پێكڤە گرێداین. ب شێوەیەكی دی، ئەو بیرۆكەیەكا شاشە چوویە د سەرێ مرۆڤی دا و پێدڤیە ب زووترین دەم ژ سەرێ خوە بینە دەرێ و هزروبیرێن خوە دووبارە ڕێكبێخین. هەروەكو هیوم دبێژیت: "ئەگەر ئەم پەڕتووكەكا ل دوور خودای و جیهانا پشتی هینگێ ب دەستێ خوە بگرین، پێدڤیە وێ پرسیارێ ژ خوە بكەین كا ئەرێ د ڤێ پەڕتووكێ دا بیرۆكەیەكا پۆختەی دەربارەی مەزناهی و ژمارەیان تێدا هەیە؟" هەلبەت نەخێر. ئەرێ بیرۆكەیەك تێدا هەیە كو ل سەر بنیاتێ سەربۆرێن ڕۆژانە هاتبیتە داڕێژتن؟ هەلبەت نەخێر. پاشە پا پێدڤیە وێ پەڕتووكێ بهاڤێژینە دناڤ ئاگری دا، ژبەركو ژ بلی ئاخفتنێن بێ ڕامان و ئاشوپی چ تشتێ دی تێدا نینە."

- "هۆسا دیاره ئەو کەسەکێ توندە."

- "بەلێ پا هێشتا جیهان یا هەی و پتر یا د گەشەکرن و پێشڤەچوونێ دا. هیومی دڤیا ب وی ڕەنگی تەماشەی جیهانێ بکەین یا زارۆکەکێ نوو پەیدابووی پێ جیهانێ دبینیت، ئانکو بەری بیرۆکە و هزر مەژیێ وی داگیر بکەن. مانە تە دگوت فەیلەسۆف ل شوونا چاڤێن خوە بۆ جیهانێ ڤەکەن، یا خوە دناڤ جیهانا خوە یا بچووك و بەرتەنگ دا ڤەشارتی و یا خوە ژ خەلکی ڤەدەر کری."

- "بەلێ، من تشتەکێ هۆسا گوتبوو."

- "هیومی ژی ب ڤی ڕەنگی هزر دکر. هیومی دەست ب ژێکجوداکرنا دوو شێوەیێن جودا یێن هزرکرنێ ل دەڤ مرۆڤی کر کو ئەو ژی: هەستوسوز و بیرۆکە بوون. هەستوسوز وێنەکرنێن تیژ و ڕاستەخو یێن جیهانا دەرەکی نە، لێ بیرۆکە هندەك بیرهاتنن کو پەیوەندی ب ڤان هەستوسوزان ڤە هەنە."

- "زەحمەت نەبیت نموونەکێ بۆ من ل سەر بینە."

- "ئەگەر تە دەستێ خوە هێلا ب سۆپێ ڤە و دەستێ تە سۆت، هەر یەکسەر دێ هەست ب ئێشانێ کەی و پشتی هینگێ ژی چەندین جاران دێ هزرا خوە د وێ سۆتنێ دا کەی. هیومی دگوتە ڤێ چەندێ "بیرۆکە". لێ جوداهی ل ڤێرێ ئەوە کو هەستکرن ب سۆتنێ گەلەك بهێزترە ژ وێ بیرئینانێ یا پشتی هینگێ تو دئینیە بیرا خوە دەمێ دەستێ تە سۆتی. ب ڕەنگەکێ دی، هەسپێکرنا هەستێن مە تشتەکێ ڕاستەڤینەیە، لێ بیرهاتن ب تنێ کوپیەکا خاڤ یا ڤێ هەستکرنێ یە، ژبەرکو هەستکرن ئەگەرێ سەرەکی یێ پەیدابوونا وێ بیرهاتنێ یە یا دناڤ بیردانکا مرۆڤی دا دهێتە هەلگرتن."

- "هەتا ڤێرێ، ئەز دگەل تەمە."

- "پشتی هینگێ، هیوم بۆ مە شرۆڤە دکەت کو هەر یەك ژ هەست و بیرۆکەیان دبیت د سادە یان ژی د ئالۆز بن. بیرا تە دهێت دەمێ مە بەحسێ لوکی دکری، مە سحبەتا سێڤێ دکر و مە گوتبوو ژ ئەنجامێ کومەکا "هەستێن لێکدای" پێکدهێت، ئاها ل ڤێرێ ژی ئەم دشێین دووپات بکەین کو سێڤ "هەستەکێ ئالۆزە یان لێکدایە."

- "ببورە کو دێ تە برم، ئەرێ ما ڤێ چەندێ گرنگیا خوە هەیە؟"

- "گرنگیا خوە؟ دبیت ئەڤ چەندە بۆ تە یا بێ ڕامان بیت، لێ تو دشێی بێ دوودلی هەر پرسیارەکا هەبیت بکەی. هیومی دانپێدان ب هندێ دکر کو دیکارت یێ مافدار بوو دەمێ دڤیای دووپات بکەت شێوازێ خوە یێ هزرکرنێ ل دەستپێکا هەموو تشتان ئاڤا بکەین."

- "باشە، باشە."

- "تشتێ هیومی دڤیای بێژیت ئەو بوو کو گەلەك جاران ئەم دشێین هندەك بیرۆکەیان پێکڤە گرێبدەین بێ ئەو بیرۆکەیا نوو پەیدابووی ل سەر تشتەکێ د کەتواری دا بهێتە بجهئینان یان پڕاکتیزەکرن. لێ ئەڤ چەندە دێ بیتە ئەگەر هندەك بیرۆکە و هزرێن شاش پەیدابین کو د سروشتی دا چ هەبوون نینە. بۆ نموونە، دەمێ بەری نوکە مە بەحسێ فریشتە و هەسپێ ب دوو شاپەڕ "پیگاس" کری. د ڤان هەموو نموونەیان دا هزرا مە ڕادبیت ب لێکدانا ڤان تشتان و وەلێ دکەت یا ژ مرۆڤی ڤە تشتەکێ ڕاستی یە. لێ د ڕاستی دا، هزرا مە ل ڤێرێ چ تشت ژ دەڤ خوە نەئافراندینە، بەلکو ئەو ب تنێ وەکو دەپێ شانۆیێ یە و هەستوسوزێن مە ب کەیفا خوە سەرەدەرییێ دگەل دکەن. د هەموو کاودانان دا پێدڤیە دانپێدانێ ب هندێ بکەین کو ئاگەهیا مە ب ئارەزوویا خوە تشتان دبڕیت و پێکڤە گرێددەت: بۆ نموونە ئەم دێ شاپەڕان ژ جهەکی ئینین و هەسپەکی ژ جهەکێ دی ئینین و پێکڤە گرێدەین، ئەڤ هەردوو تشتە ژی وەکو دوو بیرۆکەیانە د چنە د ئاگەهیا مرۆڤی دا."

- "بەلێ. ئەز دبینم ئەڤە تشتەکێ گرنگە."

- "گەلەك باشە. هیومی دڤیا ب هووری ڤەکۆلینێ ل سەر هەر بیرۆکەیەکا تاك بکەت و پڕت پڕت بکەت داکو بزانیت کا کیژ ژ وان بیرۆکەیان دگەل ژیانا کەتواری ناگونجیت. ب ڤی ڕەنگی وی دڤیا بزانیت ئەڤ بیرۆکەیێن ئالۆز و لێکدای ژ کیژ بیرۆکەیێن سادە هاتینە وەرگرتن؟ ل دەستپێکێ وی دڤیا دیار بکەت کا کیژ بیرۆکەیا تاك دڤێت بیرۆکەیەکا ئالۆز دروست بکەت. ڤێ چەندێ هاریکاریا وی کر ب شێوازەکێ ڕەخنەی بیرۆکەیێن مە شرۆڤە بکەت و هاریکاریا وی کر دووبارە هزر و تیبینیێن مە ڕێك بێخیت."

- "ئەری تە نموونەك یان دوو هەنە بۆ من بێژی؟"

- "دبیت ل سەردەمێ هیومی، خەلکی هندەك بیرۆکەیێن دەستنیشانکری ل دور ئەسمان یان باژێرێ ئورشەلیمێ یێ نوو هەبن. لێ دیکارتی دووپات دکر کو بیرۆکەیا "ڕۆهن

و ئاشکەرا" خو ب خورتی ژی بیت، پێدڤیە دگەل تشتەکێ کەتواری بگونجیت، بیرا تە ل ڤێ چەندێ دهێت؟""

- "من گوتبوو تە ئەز هۆسا یا مەژی هشك نینم زیکا تشتان ژبیر بکەم."

- "باشە، تشتەکێ ئاسایی یە ئەسمان ژ هەموو جۆرێن بیرۆکەیان پێکهات بیت، وەك نموونە ئەم دێ بەحسێ هندەك ژ ڤان بیرۆکەیان دکەین: ل ئەسمانی دەرگەهێ ئەلماسی هەیە، جادەیێن وێ ب زێری هاتینە نخافتن و یا پرە ژ فریشتەیان...هتد. بەلێ پا ئەڤ وێنە ژ هندەك بیرۆکە و هەستێن لێکدای پێکدهێن و دڤێت ئەم وان ل سەر چەند توخمێن سادە دابەش بکەین، ئەلماس، دەرگەهـ، جادە، زێڕ، بونەوەرێن جلکێن سپی ل بەر و شاپەڕ هەین. ئەرێ بەری ئەڤ تشتێن هۆسا د سەرێ مە دا هاتینە وێنەکرن، ئەم ببینین، تشتەکێ هۆسا د ژیانا مە یا کەتواری دا هەیە یان نە؟"

- "بەلێ پا ئەڤ چەندە هۆسایە، لێ ئاریشە ئەوە مە ژ ڤان هەستێن سادە، کەتوارەکێ ئاشوپی یێ دروستکری کو چ ڕاستی بۆ نینن."

- "ئاها نوکە تە دەستێ خوە دانا سەر پەیڤا دروست. د کەتوارێ خوە دا، ئەم ل دووڤ وێ پلان و نەخشەی دچین یا مە د خەونا خوە دا ئاڤاکری. هەموو ئەو تشتێن ئەم د خەونان دا دبینین، پێدڤیە بەری نوکە ڕۆژەکێ ل سەر شێوەیێ هەستەکێ سادە هاتبیتە د ئاگەهیا مە دا، بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤی بەری هینگێ زێڕ نەدیت بیت، دێ چەوا شێت هزرا خوە د جادەیەکی ب زێڕی نخافتی ل ئەسمانی کەت."

- "بەلێ، ئەرێ چ ل دیکارتی و هزرا وی یا ڕۆهن دەربارەی خودای هات؟"

- "هیوم بەرسڤا ڤێ پرسیارا تە ژی ددەت دەمێ دبێژیت ئەم تەماشەی خودای دکەین وەك بونەوەرەکێ "زیرەك و دلوڤان"، د کەتواری ژی مە بیرۆکەیەکا لێکدای هەیە کو ژ هەردوو ساخلەتێن زیرەکی و دلوڤانیێ پێکدهێت. باشە ئەگەر بەری هینگێ مە نەزانی بیت کا زیرەکی و دلوڤانی چیە، مە نەدزانی ڤێ هزرێ ژ خودای ژی بکەین. دبیت ب شێوەیەکێ دی وێنە بکەین و بێژین "بابەکێ دلڕەقە لێ یێ دادپەڕوەرە"ژی. ل ڤێرێ ژی سێ بیرۆکە تێکەلبووینە کو ئەو ژی باب و دادپەڕوەری و دلڕەقی نە. ڕەخنەگرێن ئاینی ل سەردەمێ هیومی ئەڤ جۆرە وێنەکرنە بۆ هندێ دزڤڕاند کو مە ل بچووکاتی وێنەیێ بابێ

خوە ب ڤی شێوەی دیتی یە، ژبەر هندێ ئەڤ وێنێ بابێ مە یێ ڕاستەقینە بوویە ئەگەرێ وێنەکرنا بابەکی ل ئەسمانی."

- "دبیت ئەڤ چەندە ڕاست بیت، بەلێ پا ئەز تێناگەهم بۆچی خودا هەموو گاڤان بونەوەرەکێ نێرە. هندەك جاران دەمێ دایکا من پێکۆلێ دکەت هەڤسەنگیەکێ پەیدابکەت، دبێژیت: دایکا مە ئەوا ل ئەسمانی."

- "هەرچەوا بیت. هیوم دژی هەموو وان هزر و بیرۆکەیان بوو یێن ئەم نەشێین ڤەگەڕینە سەر هەستەکێ بەرامبەری وان. وی دگوت من دڤێت دەستێ خوە بدانمە سەر هەموو وان ئاخفتنێن بێ ڕامان یێن بۆ ماوەیەکێ درێژ دەستێ خوە دانایە سەر هزرێن میتافیزیکی و کرینە دناڤ سەرگێژیان دا. لێ رۆژانە ژی ئەم چەندین بیرۆکەیێن لێکدای بکاردئینین بێ کو هزرا خوە د ڕەسەنەیاتیا وان دا بکەین. بۆ نموونە، وێنەکرنا ناخێ مرۆڤی، کو ئەڤە ژی بنەمایێ فەلسەفەیا دیکارتی بوو. ئەڤە ئەو بنەما بوو یێ هەموو فەلسەفەیا وی ل سەر هاتیە ئاڤاکرن."

- "هیڤیا من ئەوە هیوم نەبێژیت کو ئەز نە ئەزم، ژبەرکو ل وی دەمێ ئەو ژی دێ بیتە پڕبێژەکێ بێ ڕامان."

- "گوهێ خوە بدێ، گرنگترین تشتێ پێدڤیە تو ژ وانەیێن فەلسەفی وەربگری، ئەوە نابیت بلەز خوە بگەهینیە دەرئەنجامێن هەر تشتەکی."

- "باشە ببورە، بەردەوام بە."

- "نەخێر. بۆچی تو فەلسەفا هیومی ل سەر وی تشتێ بجھ نائینی یێ تو دبێژیێ "ئەز ئەزم*"."

- "باشە، بەلێ ل دەستپێکێ دڤێت دیار بکەم کا ئەڤ چەندە وێنەیەکێ سادەیە یان یێ لێکدایە."

- "و تو دێ گەهیە کیژ دەرئەنجامان؟"

* تێگەهێ ئەز ئەزی Ego concept: ل دووڤ تیورا فرۆیدی، ئەز ئەزی یەکە ژ هەرسێ پێکهاتەیێن سەرەکی یێن کەسایەتیا مرۆڤی.

- "ئەز خوە وەكو بونەوەرەكێ لێكداى و ئالۆز دبینم، زەوقا من بەردەوام دهێتە گوهۆڕین و ئەز ب زەحمەت دشێم بڕیاران بدەم. د هەمان دەم دا ئەز دشێم حەز ژ كەسەكی بكەم یان كەربێن خوە ژێ ڤەكەم."

- "باشە ئەو وێنەكرنا تە بۆ "ئەز ئەزیێ" بیرۆكەیەكا لێكداى و ئالۆزە."

- "ڕاستە. باشە پا دڤێت پرسیار بكەم كا من هەستەكا لێكداى هەیە كو وەكو وێنەیێ لێكدایێ ئەز ئەزیا من بیت، دبیت تشتەكێ هۆسا هەبیت، بەلێ تو بێژى ئەو هەردوو یەك بن؟"

- "بۆچی دەربارەى ڤێ خالێ تو یا دوودلی؟"

- "ژبەركو ئەز بەردەوام دهێمە گوهۆڕین، ئەز نە ئەو سۆفیایا بەرى چوار سالان مە، تێگەهشتنا من بۆ ناخێ من، وێنەیەكێ دەمدەمی یە و ژ وەختەكی بۆ وەختەكێ دی دهێتە گوهۆڕین. هندەك جاران دگەهیتە وى ڕادەى ئەز هەست پێدكەم یا بوویمە كەسەكا نوو."

- "باشە، ئانكو هەستكرن ب هەبوونا بنەمایەكێ كەسایەتی یێ نەگوهۆڕ، وێنەكرنا ئاشوپی یە. وێنەكرنا مە بۆ ڤێ "ئەز ئەزیێ" زنجیرەكا هەستێن ژێكجودایە و مە هەموو ل سەر یەك نەجەڕباندینە. ئاگەهیا مە جۆرەكێ دەپێ شانۆیێ یە كو تێگەهشتنێن جۆراوجۆر یەك ل دووڤ یەكی خوە ل سەر نمایش دكەن، دهێن و دچن و ژێكجودا دبن و پاشی دووبارە دناڤ چەندین كاودانێن جودا جودا دا تێكەلی هەڤدوو دبن.

مەرەما هیومی ل ڤێرێ ئەوە كو مە چ كەسایەتییێن بنچینەیی ل دور ڤان تێگەهشتن و هەستان نینن یێن بەردەوام دهێن و دچن. ئانكو وەكو وان وێنەیانە یێن ل سەر شاشەیا سینەمایێ، ئەڤ وێنەیە گەلەك بلەز دهێنە گوهۆڕین ژبەر هندێ ئەم نەشێین بزانینن كو ئەڤ فلمە ژ وێنەیێن جودا جودا پێكدهێت. د راستی دا ئەو وێنە هەموو پێكڤە نەهاتینە گرێدان، بەلكو ژ هژمارەكا چركەیان پێكدهێت."

- "ئەز دبێژم هەموو تشت ل بەر من بەرزەبوون."

- "مەرەما تە ئەو وێنەكرنا خاپینوك بەرزەبوو یێ تە ل دور "ئەز ئەزیا" خوە هەى و هزر دكرى یێ نەگوهۆڕە؟"

- "ئەز دبێژم من چ ڕێكێن دی نینن."

- "دانپێدانێ بکه کو هەر ژ دەستپێکێ تو دگەل ڤێ چەندێ نەبووی! دگەل هندێ ژی، کەسەکی دی بەری هیومی ب دوو هزار و پێنج سالان، ئاگەهیا مرۆڤی شرۆڤە کربوو و ئەو ئەفسانە ژناڤبربوو یا دگوتی کەسایەتیا مرۆڤی یا نەگوهۆڕە."

- "ئەو کی بوو؟"

- "بودا. ئەو شێوازێ بودای دارێژتی تا ڕادەیەکی وەکو یێ هیومی بوو. ئەوی دگوت ژیانا مرۆڤی ژ زنجیرەکا خولێن دەروونی و فیزیایی پێکدهێت کو دبیتە ئەگەر مرۆڤ ژ دەمەکی بۆ دەمەکێ دی بهێتە گوهۆڕین. بۆ نموونە زارۆك هەروەکو خوە نامینیت دەمێ دبیتە سنێلە، هەروەسا ئەز ژی نە ئەلبێرتۆیێ دوهی مە. بودای دگوت ئەز نەشێم بێژم ئەڤ تشتە یێ منە و چ تشت ژی دەلیڤێ نادەنە من بێژم "ئەڤ ئەزە" هەر ئەز ب خوە مە، ژبەرکو چ ڕاستی بۆ هەبوونا "ئەز" یان ژی کەسایەتیا مرۆڤی یا نەگوهۆڕ نینن."

- "ڕاستە ئەوی ژی وەکو هیومی هزر دکر."

- "ل دووڤ هەمان شێوازێ هزرکرنێ، فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی دووپاتی ل سەر نەمریا ڕۆحا مرۆڤی دکر."

- "بەلێ پا ئەڤ چەندە ژی یا شاش بوو، مانە هۆسایە؟"

- "بەلێ، ڤێجا چ بۆچوونا هیومی یان یا بودای بیت، هەردوو بۆچوون د شاش بوون. ئەرێ تو دزانی بەری بودا بمریت چ گوتبوو قوتابیێن خوە؟"

- "ما ئەز دێ ژ کیڤە زانم؟"

- "هەر تشتەکێ زیندی بیت، یا ل سەر هاتیە نڤیسین ژناڤ بچیت و نەمینیت. دبیت هیومی و دیمۆکریتسی ژی ڤیابیت هەمان تشت بێژن. ڕاستە کو هیومی پێکۆل نەدکر نەرمیا ڕۆحا مرۆڤی یان هەبوونا خودای بسەلمینیت، نەکو وی شیانێن ڤێ چەندێ نەبوون، بەلکو ئەو د وێ باوەرێ دا بوو کو ئاڤاکرنا باوەریا ئاینی ب ڕێکا ئەقلێ مرۆڤی بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی. هیوم نە کەسەکێ مەسیحی بوو، بەلێ پا نە کەسەکێ بێباوەر ژی بوو. بەلکو کەسەکێ هۆسا بوو یێ دبێژنێ کەسێ ئەگنوستی*."

- "ڕامانا ڤێ چەندێ چیە؟"

---

* ئەگنوستیAgnostic ب عەرەبی دبێژنێ ""ئەو کەسە یێ گومان ل سەر هەبوونا خودای هەی، ئانکو ب تەمامی باوەری پێ نینە و ب تەمامی ژی یێ بێباوەر نینە، بەلکو یێ دناڤبەرا هەردوو کان دا.

- کەسێ ئەگنوستی ئەو کەسە یێ گومان ل سەر هەبوونا خودای هەی. دەمێ هیوم دکەفتیە بەر مرنێ، هەڤالەکێ وی هاتە دەڤ و پرسیار ژێ کر، ئەرێ تە باوەری ب هەبوونا ژیانا پشتی مرنێ هەیە، هیومی گوت ئەرێ ما ئەم دشێین پارچەیەکا ڕەژیێ پاڤێژینە دناڤ ئاگری دا و بێژین ئاگر نابەربیتێ."

- "ئاه.. ێ باشە."

- "ب ڕێکا بەرسڤا وی بۆ مە دیار دبیت کو هیومی بەری تشتەکێ بینیت حوکم ل سەر نەددا، ئەوی ب تنێ دانپێدان ب وی تشتی دکر یێ ب ڕێکا هەستێن خوە دجەڕباندی. ژ بلی ڤێ چەندێ، وی دەرگەهێ ل هەمبەر هەموو پێشهاتان دهێلا ڤەکری. ب شێوەیەکێ ئاشکەرا، وی ئاینێ مەسیحیەتێ و باوەری ئینان ب موعجیزەیان ڕەتنەدکرن، بەلکو ئەڤ مژارە ب بۆچوونا وی، مژارێن باوەریێ نە نەك یێن ئەقلی و زانینێ. ژبەر هندێ ئەم دشێین بێژین دوماهیك داڤا دناڤبەرا فەلسەفە و باوەریێ دگەل فەلسەفەیا هیومی هاتە ڤەتاندن."

- "بەلێ پا تە گوتی وی موعجیزە ڕەتنەدکرن؟"

- "بەلێ پا ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو وی باوەری پێ هەبوو، بەلکو بەروڤاژی. ئەوی دگوت خەلکی پێدڤی ب هندێ هەیە باوەریێ ب وان ڕوودان و دیاردەیان بینن یێن ل سەردەمێ ئەڤرۆکە ئەم دبێژینێ تشتێن "سەر سروشتی دا-Supernatural". بەلێ پا ژ نیشکەکێ ڤە ئەڤ موعجیزە هەموو ل سەردەم و جهەکێ دوور ژ مە ڕود[دەن. هیومی موعجیزە ڕەتدکرن، چونکی وی ب چاڤێن خوە نەدیتبوون، بەلێ پا نەدگوتە مە کو چ ڕاستی بۆ هەبوونا وان نینە. هەلبەت وی ئەڤ چەندە نەدگوت چونکی وی چ بەلگە نەبوون بسەلینیت کو نە ڕوودانە."

- "تو دێ شێی ڤێ خالێ دوماهیێ بۆ من دووبارە کەی؟"

- "هیوم د وێ باوەرێ دابوو کو ڕوودانا موعجیزەیان دەرکەفتنە ژ یاسایێن سروشتی، بەلێ پا یا بێ مفایە ئەگەر بێژین مە سەربۆرێن هەستپێکەر دگەل ڤان یاسایان هەنە. بۆ نموونە، دەمێ ئەم بەرەکی بلند دکەین، دێ بینین دکەڤیتە سەر ئەردی، بەلێ پا ئەگەر نەکەفتە سەر ئەردی، ل وی دەمی ژی دێ زانین کا دێ چ لێ هێت."

- "ێ پا ل ڤێرێ ژی دێ بێژین ئەو موعجیزەیە یان تشتەکێ د سەر سروشتی دایە."

- "باشە تە باوەری ب هەبوونا دوو سروشتان هەیە ئەو ژی "سروشت" و "سەر سروشتی" دا، تو هەست پێناکەی تو ژی یا دکەڤیە بن کارتێکرنا بۆچوونێن فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی دا؟"

- "دبیت، بەلێ ئەز د وێ باوەرێ دامە کا چەوا مە بەر بلند کریە ئاها هۆسا دێ کەڤیتە سەر ئەردی ژی و نامینتە ل ئەسمانی."

- "بۆچی؟"

- "نەخێر... تو ژی تشتی گەلەك زێدە دکەی ها."

- "نەخێر سۆفیا، فەیلەسۆف چ جاران ژ پرسیارکرنێ ناڕاوەستیت و چ جاران ژێ تێر نابیت، ئەڤ چەندە خاڵەکا گرنگ بوو د فەلسەفەیا هیومی دا. نوکە بەرسڤا من بدە: چەوا تو یا پشتڕاستی کو ئەڤ بەرێ تە بلند کری دێ کەڤیتە سەر ئەردی؟"

- "من چەندین جاران یا ب چاڤێن خوە دیتی، ژبەر هندێ ئەز یا پشتڕاستم؟"

- "هیوم دبێژیت ڕاستە تە بۆ چەندین جاران ئەڤ تشتە ب چاڤێن خوە دیتی، بەلێ پا تە چ جاران ئەو تاقیکرنە ئەنجام نەدایە کا دێ کەڤیتە سەر ئەردی یان نە. ڕاستە ئەم دزانین کو ب ژبەر هێزا ڕاکێشانا ئەردی ئەو بەر دێ کەڤیتە سەر ئەردی، بەلێ مە چ جاران تاقیکرن ل سەر وێ هێزێ نەکرینە بەلکو ئەم یێ ل وێ خالێ ڕاوەستیاین کو هەر تشتێ بلند بکەین دێ کەڤیتە سەر ئەردی."

- "باشە ما ئەڤە هەر ئەو تشت نینە؟"

- "نە هەتا وی ڕادەی. تو ل سەر هندێ یا ڕاهاتی هەر تشتێ بلند بکەی دێ کەڤیتە سەر ئەردی، ژبەرکو گەلەك جاران تە ئەڤ تشتە ب چاڤێن خوە یێ دیتی. ئەڤ هزرێن د سەرێ تە دا پەیدادبن دبێژنێ"یاسایێن سروشتی."

- "باشە هیومی هزردکر چێدبیت بەر نەکەڤیتە سەر ئەردی؟"

- "ئەوی ژی وەکو تە هزردکر کو بەر دکەڤیتە سەر ئەردی، بەلێ پا دبێژیت وی چ تاقیکرن ل دور چەوانیا ڕوودانا ڤی تشتی نەکربوون."

- "باشە تو نابینی ئەم پیچەکێ ژ سحبەتا زاڕۆك و گولان دوور کەفتین؟"

- "نەخێر، بەروڤاژی، ب بۆچوونا هیومی، زاڕۆك دیدەڤانن ل سەر ڕاستیێ. باشە کی دێ پتر مینتە حێبەتی دەمێ بەرەك دمینتە ل ئەسمانی، تو یان زاڕۆکەکێ بچووك؟"

- "ئەز."

- "بۆچی؟"

- "چونکی زارۆکێ ساڤا نزانیت مانا بەری ل ئەسمانی تشتەکێ بەروڤاژی یاسایێن سروشتی یە."

- "باشە پا بۆچی زارۆك نزانیت کو ئەڤ تشتە بەروڤاژی یاسایێن سروشتی یە؟"

- "ژبەرکو هێشتا ئەو فێرنەبوویە کا سروشت چیە."

- "یان ژی ئەم دشێین بێژین هێشتا سروشت ل دەڤ وی نەبوویە تشتەکێ ڕاهاتی؟"

- "ئاه، تە دڤیا بگەهیە ڤێ چەندێ! باشە، هیومی دڤیا مرۆڤ هەستێن خوە بهێلنە هشیار."

- "نوکە دێ ڕاهێنانەکێ دەمە تە: ئەگەر تو دگەل زارۆکەکێ چوویە پێش یاریەکا سێرەبەندیێ. بۆ نموونە هەوە دیت مرۆڤەکێ ل ئەسمانی دفڕیت، کیژ ژ هەوە پتر دێ خوشیێ ژ دیتنا ڤی دیمەنی بینیت؟"

- "ئەز دبێژم ئەز."

- "باشە بۆچی تو؟"

- "چونکی ئەز دشێم تیبینیا هندێ بکەم کا هەتا چ ڕادە ئەڤ تشتە یێ سەیرە."

- "هەلبەت. زارۆکێ بچووك چ خوشیێ ژ هندێ نابینیت دەمێ یاسایێن سروشتی دهێنە تێکدان، چونکی هێشتا ب دروستاهی ئەو نزانیت کا ئەڤ یاسایە د چەوانە. هێشتا ئەو ل سەر وان یاسایان ڕانەهاتیە. زارۆکی بەری هینگێ چ بیرۆکە دگەل خوە نەئینانە، هەلبەت ئەڤ چەندە ژی ساخلەتەکە ژ ساخلەتێن فەیلەسۆفێن مەزن، ژبەرکو ئەو ژی تەماشەی جیهانێ دکەت بێ کو بیرۆکەیێن خوە یێن بەری هینگێ بینتە پێشچاڤێن خوە. لێ ئەم ڤان بیرۆکەیان دئینە پێشچاڤێن خوە، لەوڕا دیتنا مە بۆ ژیانێ نە یا ڕۆهن و ئاشکەرایە."

- "چەند پتر بیرۆکەیێن بەری هینگێ بهێنە پێشچاڤێن مە، پتر دێ پەشیمان بین."

- "دەمێ هیوم بەحسێ تیتال یان تشتێن ڕاهاتی دکەت، ڤەکۆلینا وێ پتر جەختێ ل سەر یاسایا ئەگەران دکەت کو دبێژیت هەر ڕوودانەکێ ئەگەرەك یێ ل پشت هەی. بۆ ڤێ

چەندێ، ئەو تەپا یاریا بلیاردێ دکەتە نموونە: ئەرێ دێ چ ڕوودەت ئەگەر تەپەکا سپی ب تەپەکا ڕەش بکەڤیت؟"

- "تەپا ڕەش ژی دێ ژ جهێ خوە لڤیت."
- "بۆچی؟"
- "ئووهـ، چونکی تەپا سپی ڤێکەفتبوو..."
- "ل ڤی کاودانی دا دێ بێژین تەپا سپی یا بوویە ئەگەرێ لڤاندنا تەپا ڕەش، مانە هۆسایە؟ بەلێ پا ل بیرا تە بیت مە ماف نینە بڕیاردێ ل سەر تشتەکی بدەین هەتا تاقیکرنەکێ ل سەر نەکەین."
- "باشە، من گەلەك جاران ئەڤ تەپە یێن دیتین، چونکی جوانایا هەڤالاً من مێزەکا یاریا بلیاردێ یا هەی."
- "هیوم دبێژیت، تشتێ تو دبینی ب تنێ ئەوە تەپا سپی دبیتە ئەگەرێ لڤاندنا تەپا ڕەش، بەلێ تە ب خوە ئەو ئەگەر نەدیتیە یێ تەپا ڕەش دلڤلینیت. تو شیای تیبینیا هندێ بکەین کو ئەڤ هەردوو ڕوودانە ل دووڤ یەك دهێن، لێ تو نەشێی دووپات بکەی کو لڤینا تەپا دووێ ژ ئەگەرێ لڤینا تەپا یەکێ پەیدابوویە؟"
- "تو نابینی ئەڤ بابەتە پیچەکێ یێ بێزارکەرە؟"
- "نەخێر، بەلکو گەلەك یێ گرنگە. چاڤەڕێکرنا ڤان ڕوودانان کو یەك ل دووڤ یەکێ ڕوودەت، دناڤ وان تشتان ب خو دا ڕوونادەت، بەلکو دناڤ ئاگەهیا مە دا ڕوودەت. ڕامانا ڤێ چاڤەڕێکرنێ بەری نوکە مە د چەند نموونەیەکان دا شرۆڤەکربوو. بۆ نموونە زارۆکەك حێبەتی نامینیت دەمێ دبینیت دوو تەپێن بلیاردێ ڤێکەفتن و چ ژ وان ژ جهێ خوە نەلڤین، ژبەرکو ئەو ب خوە هێشتا نزانیت کو دەمێ دوو تشت ڤێکبکەڤن پێدڤیە ژ جهێن خوە ژی بلڤلڤن. ل ڤێرێ هیوم دووپات دکەت کو ئەڤ "یاسایێن سروشتی" و "ئەگەر و ئەنجامان" ژ ئەقلێ مە دەرناکەڤن، بەلکو وەکو نەریتەکی هێدی هێدی ل دەڤ مە پەیدادبن، ژبەر هندێ ئەم نەشێین بێژین تشتەکێ لوژیکی یە یان نەلوژیکی یە. دەمێ ئەم ژ دایك دبین، چ بیرۆکە دەربارەی جیهانێ د سەرێ مە دا نینن، بەلکو ڕۆژانە ئەڤ جیهانە بیرۆکەیان پێشکێشی مە دکەت و ئەم ژی ب ڕێکا هەستێن خوە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ باشتر هەست پێدکەین."

- "ئەرێ جوداهی دناڤبەرا ڤان هەردوو ڕەوشان دا هەیە، ئانکو دەمێ مرۆڤی بەری هینگێ بیرۆکە هەبن یان نەبن؟"

- "بەلێ. چونکی گەلەك جاران ئەڤ چاڤەرێکرنێن درێژ، دبنە ئەگەر مرۆڤ بلەز خوە بگەهینتە دەرئەنجامان و بڕیارێن بلەز بدەت."

- "وەکو چ تشت؟"

- "بۆ نموونە، ئەگەر تە کەرەکێ پەزێ ڕەش دیت، ڕامانا وێ ئەو نینە پەز هەموو یێ ڕەنگ ڕەشە."

- "چ پێنەڤێت."

- "هەتا ئەگەر تە د ژیانا خوە هەموویێ دا ب تنێ پەزێ ڕەش دیت بیت، ڕامانا وێ ئەو نینە هەموو پەز ب تنێ د ڕەنگ ڕەشن یان ژی چ پەزێن ڕەنگ سپی نینن. فەیلەسۆف ژی وەکو زانایانە، دووپاتیێ ل سەر هندێ دکەن کو مرۆڤ خوە ژ پێشبینیان نەتەدە پاش، ل دووڤ ڤێ تێگەهشتنێ، لێگەریان ل دووڤ پەزێ سپی دبیتە ئەرکێ کەسێن زانا."

- "هێدی هێدی ئەز یا تێدگەهم."

- "دەربارەی بابەتێ ئەگەر و ئەنجامان، ئەم دشێین دیاردەیا باهۆزان بکەینە نموونە. گەلەك کەس هزر دکەن ڕۆناهیا عەوران ئەگەرێ پەیدابوونا گورمێنا عەورایە ژبەرکو ل دەستپێکێ ڕۆناهی پەیدادبیت پاشی گورمێن دهێت. چ جوداهی دناڤبەرا ڤێ نموونێ و نموونەیا یاریا بلیاردێ نینە، ژبەر هندێ دێ پرسیارێ ژ تە کەم: ئەرێ ژ ڕاستا ڕۆناهیا عەوران ئەگەرێ پەیدابوونا گورمێنا عەورایە؟"

- "نەخێر. بەلکو هەر یەك ژ ڕۆناهیی و گورمێنا عەوران یەك ل دووڤ یەکێ ڕوودەن."

- "...ژبەرکو هەردوو ژ ئەنجامێ بارگەیەکا کارەبایی یا بهێز پەیدادبن. ئاها ل ڤێرێ فاکتەرێ سیێ ژی هاتە دناڤ بابەتی کو ئەو ژی بارگەیێن کارەبێ نە."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "یەك ژ فەیلەسۆفێن ئیمپریسیزمی یێن سەردەم ب ناڤێ "بێرتراند ڕاسل" نموونەیەکا مەزن دئینیت: مریشکەك ڕۆژانە خوەدانێ خوە دبینیت دەمێ د بەر کۆلکێ وێ

ڕا دبوریت و خوارنێ بۆ ددانیته د سێنیکا وێ دا. پێدڤیه ل دوماهیێ ئەو بگەهیته وی ئەنجامی کا چ پەیوەندی دناڤبەرا هاتنا جوتیاری و خوارنێ دا هەیە."

- "باشە پا هەکە ڕۆژەکێ خوارن بۆ نەدانا د سێنیکا وێ دا؟"
- "ئەڤە دێ بیتە ئەو ڕۆژ یا جوتیار مریشکێ سەرژێ دکەت؟"
- "چ دیمەنەکێ ب ترسە."
- "دەمێ دوو تشت د سروشتی دا ل دووڤ هەڤدوو دهێن یان ڕوودەن، ڕامانا وێ ئەو نینە کو یەك دبیتە ئەگەرێ ڕوودانا تشتێ ل دووڤ دا، ژبەر هندێ یەکەم کارێ فەیلەسۆفان ئەوە خەلکی فێری هندێ بکەن بڕیارێن بلەز ل سەر چ تشتان نەدەن، چونکی ئەڤ بڕیارە دێ وان تووشی شاشی و ئەفسانە و تشتێن ئاشوپی کەن."
- "چەوا؟"
- "ئەگەر پشیکەکا ڕەش ل سەر جادێ بچیت و پشتی بێهنەکێ تو بکەڤی و پێ تە بشکێت، ل ڤێرێ چ پەیوەندیا "ئەگەر و ئەنجامان" دناڤبەرا ڤان هەردوو ڕوودانان دا نینە. د بوارێ زانستی دا پێدڤیە ئەم ئێگجار د هشیار بین. بۆ نموونە ئەگەر کەسەکێ نەساخ پشتی خوارنەکا دەرمانەکێ دەستنیشانکری هۆسا خوە دیار بکەت کو یێ ساخلەم بووی، ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو ژ ڕاستا وی دەرمانی ئەو یێ ساخلەم کری، چونکی دوور نینە ئەڤ دەرمانە ب تنێ ژ هندەك ئاڤ و ئاری پێکهاتبیت. دبیت ئەگەرەکێ دی ل پشت ساخلەمبوونا وان هەبیت، بۆ نموونە باوەریا وان یا تەمام ب وی دەرمانی نەك دەرمان ب خوە."
- "نوکە ئەز باش د مەرەما تێگەهێ ئیمپریسیزم گەهشتم."
- "د بوارێ ئەتیکی ژی دا، هیوم هێرشێ دکەتە سەر تیورا فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی دەمێ دبێژن جوداهیا دناڤبەرا باشی و خراپیێ دا دناڤ ئەقلێ مرۆڤی دا هاتیە چاندن، بەلکو ئەو پشتەڤانیا وێ بۆچوونێ دکەت یا دبێژیت ئەقلێ مرۆڤی وێ چەندێ دەستنیشان ناکەت کا چ بێژین یان چ بکەین."
- "باشە پا وی ب ڤی کاری ڕادبیت؟"
- "هەستێن مە. ئەگەر تو بڕیارێ بدەی هاریکاریا کەسێن پێدڤی بکەی، ل ڤێرێ هەستێن تە دێ تە پاڵدەن ڤی کاری بکەی نەك ئەقلێ تە."

- "باشه پا هەکە من وەنەکر؟"

- "هەردیسان ڤێ مژارێ ژی پەیوەندی ب هەستان ڤە هەیە. هاریکارینەکرنا کەسێن پێدڤی نە تشتەکێ دروست یان شاشە، بەلکو تشتەکە پەیوەندی ب ناخێ تە ڤە هەیە."

- "بەلێ پا دڤێت سنوورەك هەبیت، هەموو کەس ل سەر هندێ هەڤڕانە کو نابیت چ مرۆڤ بهێنە کوشتن."

- "ب دیتنا هیومی، ئەم هەست ب هندێ دکەین کو هەموو مرۆڤ پێدڤی ب هاریکاری و دلوڤانییێ نە، هەروەسا مە شیان هەنە هاریکاریا وان بکەین یان دلوڤانییێ پێ ببەین، لێ ڤێ چەندێ چ پەیوەندی ب ئەقلی ڤە نینە."

- "ئەز نە هند یا پشتڕاستم ژ ڤی تشتی."

- "سۆفیا، هندەك جاران لادانا کەسەکی ل سەر ڕێکێ دێ یا ب مفا بیت، ب تایبەت ئەگەر مە بۆ خوە ئارمانجەکا ڕۆهن و ئاشکەرا دانابیت. باوەر بکە."

- "نەخێر... هەما تو یێ ڤی تشتی مەزن دکەی."

- "باشە. باشە کا بۆ من بێژە بۆچی دێ هێلین کەسەکێ زیانبەخش بژیت؟"

- "ژبەرکو ئەو حەز ژ ژیانێ دکەت و مە ماف نینە وی ژ ژیانێ بێبەهر بکەین."

- "ئەرێ ئەڤ چەندە هێجەتەکا بەرئاقلە؟"

- "ئەز نزانم."

- "تو ژ ڕستەیەکا وەسفی "ئەو حەز ژ ژیانێ دکەت" بوری و تە ڕستەیەکا دەرئەنجامی "مە ماف نینە وی ژ ژیانێ بێبەهر بکەین" ئینا. ئەگەر ژ لایێ ئەقلی ڤە بەرێ خوە بدەینێ گەلەك یا بێ ڕامانانە. چونکی ب هەمان شێوە ئەم دشێین بێژین "گەلەك کەس دەمێ دچنە ڕێڤەبەریا باجێ، درەوان دکەن و داهاتێ خوە ب دروستاهی دیار ناکەن، باشە پا من ژی مافێ هەی وەکو وان درەوان بکەم". هەکە ب ڕەنگەکێ دی پتر ڕۆهن بکەین: نابیت ژ ڕستەیەکا وەسفی "ئەو یێ هۆسایە" ڕستەیەکا دەرئەنجامی "پێدڤیە ئەز ژی وەبکەم" بداڕێژی، لێ دگەل هندێ ژی ڕۆژانە ئەم ڤێ چەندێ ب پرۆگرامێن خوە یێن سیاسی و ڕاگەهاندن و هەتا کومبونێن پەرلەمانی ژی دا دبینین. ئەرێ تە دڤێت هندەك نموونەیان بۆ تە بینم؟"

- "چ پێنەڤێت بەلێ."

- " ڕستەیا "رۆژ بۆ ڕۆژێ هژمارا وی خەلکێ دڤێت ب فرۆکەیان گەشتێ بکەین د زێدەبوونێ دا یە، ژبەر هندێ پێدڤیە فرۆکخانەیێن نوو بهێنە دروستکرن"، ب بۆچوونا تە، ئەرێ ئەڤە دەرئەنجامەکێ باشە؟"

- "نەخێر، چونکی ل ڤێرێ مە پیسبوونا ژینگەهێ ل بەرچاڤ وەرنەگرتیە. ئەگەر ئەڤ گەشتە هند د گرنگ بن، ئەم دشێین تۆرا شەمەندەفران پێشبێخین."

- "باشە ڕستەکا دی، "کولانا بیرێن نەفتێ یێن نوو، دێ بیتە ئەگەرێ بلندکرنا ئاستێ خوشگوزەرانیا خەلکی ب ڕێکا 10٪، لەورا یا پێدڤیە لەزێ ل کولانا وان بکەین."

- "ئەڤ چەندە ژی نابیت، چونکی بابەتێ ژینگەهێ هاتیە ژبیرکرن. وەکو دی ژی ئاستێ خوشگوزەرانیێ ل نەڕویج نە هند یێ خڕابە."

- "دبیت ئەم بێژین "پەڕلەمانی بڕیار ل سەر ڤێ یاسایێ دایە، لەورا پێدڤیە هەموو کەس بجھ بینن"، دگەل ڤێ چەندێ ئەڤ بڕیارە دێ دگەل حەز و خواستێن گەلەك کەسان یا هەڤدژ بیت."

- "ئەز تێگەهشتم کا مەرەما تە چیە."

- "ب کورتی، ئەقل نەشێت بێژیتە مە کا چەوا سەرەدەریێ بکەین، سەرەدەریێن بەرپرسیاری ژی چ پەیوەندی دگەل ئەقلی نینە بەلکو پەیوەندی ب هەستێن مە ڤە هەیە. ئەقل دژی هندێ نینە دنیا هەموو خڕاب ببیت ب تنێ دا خوین ژ تبلەکا تە نەهێت."

- "ئەڤ چەندە یا ب ترسە."

- "گوهێ خوە بدێ، مانە هەر دلێ مەیە مە پاڵدەت هاریکاریا وان کەسان بکەین یێن ژبەر بیڤەلەران مال و جهێن خوە هێلاین؟ ئەگەر مە هەست نەبان و مە هێلابا ئەقلێ مە یێ ڕەق و سارِ باخڤیت، دوور نینە ئەو بێژیت چ ئاریشە نینە ئەگەر چەند ملیون مرۆڤ ل سەر ڕوویێ ئەردی بمرن داکو ئاریشەیە زێدەبوونا ئاکنجیان ل سەر ئەردی بهێتە چارەسەر کرن."

- "دەمێ هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا دکەم، وەختە دین بم."

- "تە دیت، ئەقلێ تە نەبوو ئەگەر."

- "سوپاس، ئەز تێگەهشتم."

# بیرکلی

*... وەکو ئەختەرەکا گرێلبووی ل دور ڕۆژا گەش بزڤڕیت...*

ئەلبێرتۆ ژ جهێ خوە ڕابووڤە و بەرەڤ پەنجەرکێ ڤە چوو و سۆفیا ژی ل دووڤ وی چوو. چاڤێ وان ب فرۆکەیەکا بچووك کەفت کو ل سەر بانی دهات و چوو و لافیتەك پێڤەبوو. سۆفیایێ پێشبینیا هندێ دکر ڕیکلاما هندەك بەرهەمێن بازرگانی یان ئاهەنگەکا ناڤخویی ل سەر وێ لافیتێ یا نڤیسای بیت، لێ دەمێ فرۆکە پتر نێزیکی وان بووی، سۆفیا حێبەتی ما دەمێ نڤیسینا ل سەر خواندی و نامەیەکا جودا و سەیر دیتی **"جەژنا بوونا تە پیرۆز، هێلد"**.

ئەلبێرتۆی گوت: "هۆسا دیارە ئەو گەلەك یێ ڕکویە."

عەورێن ڕەش و مەزن ژ گرێن باشوری دهاتن و ل سەر ئەسمانێ باژێرێ دا خڕڤە ببوون. ئەو فرۆکەیان بچووك ژی ل دناڤ عەوران دا بەرزەبوو.

ئەلبێرتۆی گوت: "ئەز یێ دترسم، هۆسا دیارە باهۆزەك یا ب ڕێکێ ڤە دهێت."

- "پا ئەز ژی دێ ب پاسێ چمە مال؟"
- "هیڤیا من ئەوە ئەڤ کارە ژی ژ فێلێن مایجەری نەبیت."
- "ئەو وەکو خودایەکی نینە ل سەر سەرێ مە، مانە هۆسایە؟"

ئەلبێرتۆی بەرسڤا وێ نەدا بەلکو چوو سەر جهێ خوە ڕوونشت و پشتی دەمەکێ کێم، بێدەنگیا خوە شکاند و دەست ب ئاخفتنێ کر.

- "پێدڤیە پیچەکێ بەحسێ بیرکلی بکەین."

سۆفیا ژی چوو سەر جهێ خوە ڕوونشت، وێ ئاگەهـ ژ خوە نەبوو کو یا نینوکێن خوە ب لەڤان ژێڤە دکەت.

- "جۆرج بیرکلی، قەشەیەکێ ئێرلەندی بوو، دناڤبەرا سالێن 1685 هەتا 1753ێ زاینی دا ژیایە."

- "هەروەسا فەیلەسۆف ژی بوو."

دیسان ئەلبێرتۆ بۆ ماوەیەکی بێدەنگ ما، هەتا سۆفیایێ ئەو هشیار کری و پرسیار کری: "ێ و پاشی؟"

- "وی هەستپێدکر فەلسەفە و زانست بووینە مەترسی ل سەر تێگەهێ مەسیحیەتێ ل جیهانێ. هەردیسان تێگەهێ فەلسەفەیا مەتریالی ژی یا هەڤدژە دگەل وێ باوەریێ ئەوا دیار دکەت کا چەوا خودای گەردوون ئافراندیە و هێلایە ساخ."

- "باشە و پاشی؟"

- "بیرکلی ژ هەموو فەیلەسۆفێن دی یێن ئیمپریسیزمی، پتر ل سەر دەرئەنجام و بۆچوونێن خوە یێ ڕژد بوو."

- "ئەرێ ما وی ژی دگوت ئەم نەشێن دنیایێ ببینین ب تنێ ئەگەر ب ڕێکا هەستێن مە نەبیت؟"

- "نە ئەڤ چەندە ب تنێ، وی دووپات دکر کو ئەو تشتێن ئەم دبینین د ڕاستی ژی دا هۆسانە، بەلێ ب تنێ جوداهی ئەوە ئەو نە "تشت"ن؟"

- "ئانکو چەوا؟"

- "بیرا تە دهێت دەمێ لوکی دگوتی ئەم نەشێین بەحسێ ساخلەتێن ناڤنجی یێن تشتان بکەین. بۆ نموونە ئەم دشێین دووپات بکەین کو ئەڤ سێڤە یا کەسك و ترشە، بەلێ پا ئەم ب تنێ هەست ب ڤێ چەندێ دکەین. بەروڤاژی، ساخلەتێن سەرەکی وەك قەبارە و سەنگ و چڕی سەر ب جیهانا دەرەکی ڤەنە، ئانکو ساخلەتەکا مەتریالی "فیزیایی" هەیە."

- "ئەز دبێژم هێشتا من بیردانکا خوە ژ دەستنەدایە."

- "پشتی دیکارتی و سپینوزای، لوکی ژی هزر دکر جیهانا فیزیایی جیهانەکا ڕاستەقینەیە؟"

- "ئاها هۆسا!"

- "باشە، ئاها ئەڤ چەندە ل دەڤ بێرکلی وەك فەیلەسۆفەکێ ئیمپریسیزمی، دبوو ئەگەرێ پەیداکرنا گومانێ. ب بۆچوونا وی، تشتێ یەکانە یێ ڕاستی بۆ هەی ئەو تشتە یێ ئەم هەست ب هەبوونا وی دکەین، بەلێ پا ئەم هەست ب "ماددە" یان "بنیات"ێ وی ناکەین. ئەم نەشێین جیهانێ هەروەکو تشتەکێ سادە و بچووك ب دەستێ خوە بگرین. ئەگەر هۆسا هزر بکەین کو ماددەیەکێ ڤەشارتی ل پشت وان تشتان هەیە یێن هەست پێدکەین، وێ گاڤێ دێ کەڤینە د شاشیەکێ دا، چونکی مە چ سەربۆر نینن ڤێ باوەریێ ل سەر بدارێژین."

- "بەلێ پا... کا سەحکێ."

سۆفیایێ نیڤا دەستێ خوە ل مێزێ دا و کرە ڤێژی: "ئای، ما ئەڤە نە بەلگەیە ل سەر هندێ کو ئەم یێ بەرامبەر مێزەکێ کو ژ ماددەیەکێ ڕاستەقینە پێکدهێت؟"

- "تە هەست ب چ کر؟"

- "تشتەکێ ڕەق و هشك..."

- "ڕاستە تە هەست ب تشتەکێ ڕەق کر، بەلێ پا تە هەست ب ماددێ مێزێ نەکر، هەروەکو کا چەوا دەمێ تو د خەونێ دا دبینی تو یا دەستێ خوە ل تشتەکێ ڕەق ددەی بێ کو ئەو تشتێ ڕەق د خەونا تە دا هەبیت."

- "هەلبەت... د خەونێ دا نابیت."

- "هەردیسان مرۆڤ دشێت بکەڤیتە ژێر کاریگەریا نڤاندنا موگناتیسی، ب ڕەنگەکی کەسێ نڤستی دێ هەست ب گەرمی و سەرمایێ کەت، هەست ب ئارامی یان کولم و شەق و پێهنان کەت بێ ڕاستیەك بۆ هەبوونا ڤان تشتان هەبیت."

- "بەلێ پا هەکە مێزە ب خوە یا ڕەق نەبایە، ئەو چ تشتە وەل من کری هەست ب ڕەقاتیا وێ بکەم؟"

- "بیرکلی دگوت ئەو ڕۆح یان ژی خواستە وەل مرۆڤی دکەت. هەموو هزرێن مە ئەگەرەکێ ژ دەرڤەی ئاگەهیا مە هەیە، لێ ڤی ئەگەری سروشتەکێ ڕۆحی یێ هەی نەك ماددی."

سۆفیایێ دووبارە نینوکێن خوە لەقدان، ئەلبێرتۆی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "بێرکلی هۆسا دبینیت کو ڕۆحا من ئەگەرێ وێنەکرن و هزرێن من بیت، هەروەکو کا چەوا ئەو هەست ب وان تشتان دکەم یێن د خەونێ دا دبینم. بەلێ پا دڤێت ڕۆحەکا دی یان خواستەکا دی ئەگەرێ وان بیرۆکەیان بیت یێن د جیهانا ماددی دا هەست پێدکەین. وی دگوت هەموو تشت ژ ڕۆحێ دەردکەڤن و ڕۆح بنگەهێ هەموو تشتانە و هەموو تشت ژێ دروست دبن."

- "مەرەما وی کیژ جۆرێ ڕۆحێ یە؟"

- "چ پێنەڤێت، مەرەما وی خودا بوو. ئەو گەهشتە وی ڕادەی هەتا گوتی "هەستکرن ب هەبوونا خودای گەلەك ڕۆهنترە ژ هەستکرنێ ب هەبوونا مرۆڤان."

- "ئانکو ئەم نە د پشتڕاستین کا ئەم هەینە یان نە؟"

- "گوهێ خوە بدێ. بیرکلی دبێژت هەموو ئەو تشتێن ئەم دبینین یان هەست پێدکەین ژ ئەنجامێ شیانێن خوداینە، ئانکو خودا دناڤ ناخێ مە دا هەیە و ئەو ڤان هزرێن جۆراوجۆر و هزران ددەتە مە. جیهان هەموو، هەتا هەبوونا مەژی یا دناڤ د دەستێن خودای دا. ئەو ئەگەرێ سەرەکی و یەکانە یێ هەبوونا هەموو تشتانە."

- "تە ئەز حێبەتی کرم ب ڤان ئاخفتنان."

- "ب ڤی ڕەنگی ئەو پرسیار نە یا دروستە دەمێ دبێژین "ئەز هەبم یان نەبم"، بەلکو یا دروستر ئەوە بێژین "ئەم کینە. ئەرێ ڕاستە ب گوشت و خوینا خوە ڤە ئەم بونەوەرێن مرۆڤی نە؟ ئەرێ جیهانا مە ژ تشتێن ڕاستەقینە پێکدهێت؟ یان ژی ئەم یێ ب ڕۆحێ هاتینە دوورپێکرن؟"

جارەکا دی ژی سۆفیایێ نینوکێن خوە لەقدان، لێ ئەلبێرتۆی هەر بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "ل ڤێرێ بیرکلی نه ب تنێ گومان ژ تشتێن ماددی هەلگرتبوو، بەلکو هەتا ئەو یێ ژ ئەسمان و وەختی ژی ب گومان بوو کو چ هەبوونێن سەربەخو نینن. دیتنا مە بۆ وەختی یان ئەسمانی، تشتەکە د ناخێ مە دا نینە، بۆ نموونە بورینا حەفتیەکێ یان دوو حەفتیان، نە وەکو بورینا حەفتیەکێ یان دوو حەفتیێن ل دەڤ خودایە."

- "تە گوتی بیرکلی دبێژیت ئەو ڕۆحا دناخێ هەموو تشتان دا، خودایە؟"

- "بەلێ... لێ دەربارەی مە..."

- "چ دەربارەی مە؟"

- "دبیت دەربارەی من و تە، ئەڤ خواستە یان ئەڤ ڕۆحە یاکو هەموو تشتان دکەت، دبیت بابێ هێلدێ بیت."

سۆفیا حێبەتی ما و بێدەنگ بوو. ب تنێ دەربڕینەك ل سەر دێمێ وێ دیاربوو کو ئەو ژی نیشانێن پرسیارەکا مەزن بوون. پاشی دبن لێڤکان ڕا ئاخفت و پرسیار کر: "ئەرێ تو هۆسا هزر دکەی؟"

- "ئەز چ پێشبینیێن دی نابینم. دبیت ئەڤ شرۆڤەکرنا ب تنێ یا ڕازیکەر بیت. ئەز هزرا خوە د هەموو وان تشتان دا دکەم یێن ب سەرێ مە هاتین: کارتێن پۆستەی، هەموو ئەو ڕوودانێن سەیر یێن ل ڤێرێ و وێراهە ڕوودانین وەکو ئاخفتنا هێرمسی یان ژی دەمێ ئەزمانێ من ئالۆزیای و ناڤێن هەوە لێکگوهارتین."

- "ئەز..."

- "ئەرێ تە ئاگەهـ ژ هندێ نەبوو سۆفیا کو پێدڤی بوو من ب ناڤێ هێلدێ گازیکربایە تە، ئەڤە ل دەمەکی کو ژ دەستپێکێ وەرە دزانم ناڤێ تە نە سۆفیایە."

- "ئەڤە چ ئاخفتنن تو دبێژی، هۆسا دیارە ژ ڕاستا تو یێ دین بووی!"

- "بەلێ ژ ڕاستا ئەز یێ دین بوویم و سەرێ من یێ دزڤڕیت، هەروەکو تەپەکا ل ئەسمانی ل دورماندوری ڕۆژێ دزڤڕیت."

- "ئەو ڕۆژ ژی بابێ هێلدێ یە، مانە؟"

- "تو دشێی وەبێژی."

- "ئەرێ مەرەما تە ئەوە بابێ وێ بۆ مە وەکو خوداوەندەکی یە؟"

- "بەلێ."

- "و پا هێلد، ڕۆلێ وێ چیه دناڤ ڤی بابەتی هەموویێ دا؟"
- "ئەو فریشتەیە، سۆفیا"
- "فریشتە؟"
- "هێلد ئەو کەسە یا دگەل ڕۆحێ دئاخڤیت."
- "مەرەما تە ئەوە ئەلبێرت کناگ بەحسێ مە بۆ هێلدێ دکەت؟"
- "بەلێ، یان ژی دبیت ل سەر مە بنڤیسیت، چونکی ئەم ب خوە نەشێین هەست ب وی ماددەی بکەین یێ ڕاستی ژێ دروست بووی. ئەم نزانین کا ڕاستیا ژ کەتوارێ مە یێ ژ دەرڤە ژ پێلێن دەنگێ پێکدهێت یان ژی ژ کاغەزێن نڤیسینێ. ب بۆچوونا بیرکلی، ب تنێ ئەم وێ چەندێ دزانین کو ئەم یێ ژ ڕۆحێ پێکهاتین."
- "باشە، ئانکو ئەڤ هێلدە فریشتەیە."
- "بەلێ. دا ل ڤێرێ ڕاوەستین. جەژنا بوونا تە پیرۆز، هێلد!"

ل وی دەمی، ڕۆناهیەکا شین ئەو ژوور ڕۆهن کر و گورمێنا بریسیەکێ ژی ئەو ژوور هەژاند. ئەلبێرتۆ بێدەنگ ما.

سۆفیایێ گوت: "پێدڤیە ئەز نوکە بزڤرمە مال."

سۆفیا ڕابوو ڤە، لێ هێشتا هێرمس وەکو هەر جار یێ نڤستی بوو. دەمێ وێ دەرگەهـ ڤەکری و دەرکەفتی ژی، ئەلبێرتۆی گوتێ: "بخێر بچی هێلد."

سۆفیا بلەز ژ دەرەجکان هاتە خوارێ، دەمێ گەهشتیە سەر جادەی، وێ چ مرۆڤ نەدیتن، هەتا مێریەکا ب تنێ ژی ل سەر ئەردی نەدیت. هندەك ترۆمبێل سەر جادەیا تەڕ د هاتن و چوون، لێ چ پاسێن نەفەران دیار نەبوون. سۆفیایێ هەتا نیڤا بازاڕی کری غارێ و ب تنێ هزرەك د سەرێ وێ دا بوو.

سۆباهی جەژنا ژ دایکبوونا منە. ئەرێ مانە یا ب دلئێشە کەسەك ب ڕۆژەکێ بەری جەژنا بوونا خوە یا پازدە سالیێ ژ نوو بزانیت دنیا هەموو خەونە.

ئەڤە وەکو وێ چەندێ یە کەسەك کارتەکا بەختی کو بهایێ وێ ملیون لیرە بن ببەت، لێ دەمێ دەستێ خوە دهاڤێژیتە پاران داکو وەربگریت، ژ نیشکەکێ ڤە بۆ وی دیار بیت ئەو چەندە هەموو خەون بوو.

**دەمێ سۆفیا گەهشتیە نێزیکی یاریگەها گشتی، وێ دیت کەسەك یا بەرەڤ وێ ڤە دکەتە غارێ، ئەو دایکا وێ بوو و بلەز سۆفیا دا بەر سینگێ خوە.**

- **"کچا من یا خوشتڤی، ئەڤە چیە ب سەرێ مە دهێت؟"**

**سۆفیایێ ب چاڤێن گری ڤە گوت: "ئەز نزانم، بەلێ پا وەکو خەونەکا نەخوشە."**

# بجێرکلی

*...ئەو خودیکا جادوگەری یا کەڤن، داپیرا وێ وێ ژ سێرەبەندەکێ کریبوو...*

هێلد موللەر کناگ د ژوورا خوە یا د وی کۆلکێ کەڤن یێ نێزیکی لیلساندێ ڤە هشیاربوو. تەماشەی دەمژمێرا خوە کر لێ هێشتا ژ دەمژمێر شەش نەبوری بوو سەرەڕای کو ژوورا وێ هەموو ڕۆهن ببوو و تیشکێن ڕۆژێ پێلێن خوە ل سەر دیواری نەخشاند بوون.

هێلدێ خوە ژ سەر تەختی هاڤێت و بەرەڤ پەنجەرکێ ڤە چوو. ب ڕێکێ ڤە لاپەڕەکێ ل سەر سالنامێ ژێڤەکر کو ل سەر نڤیسابوو: پێنج شەمب، 14 خزیرانێ. سۆفیایێ ئەو لاپەڕ هەلگرت و ڤورمچاند و هاڤێتە د تەنەکا گلێشی دا.

نوکە، تەماشەی سالنامەیا ب دیواری ڤە هەلاویستی کر: ڕۆژا ئەینی، 15 خزیرانا 1990ێ. ئەو لاپەڕێ ل بەرامبەری د تەیسی. ئەوێ هێشتا ل هەیڤا یەکێ دەمێ ئەو سالنامە ب دیواری ڤە هەلاویستی، ل سەر لاپەڕێ وێ ڕۆژێ نڤیسیبوو کو د وێ ڕۆژێ دا دێ ژیێ وێ بیتە پازدە سال. هەستەکا تایبەت ل دەڤ وێ پەیدابوو کو چ ڕۆژێن دی یێن سالێ دا ئەو هەست ل دەڤ پەیدانابیت.

پازدە سال! ئەرێ مانە ئەڤە یەکەم ڕۆژا بالقبوونا وێ یە؟ ئێدێ ئەو نەدشیا دووبارە بچیتە سەر تەختێ خوە و بنڤیت. ژ لایەکی دی ژی ئەڤرۆکە دوماهیک ڕۆژا

قوتابخانێ یە بەری کو بێهنڤەدانا هاڤینێ دەست پێبکەت. قوتابی هەموو پێن ڕێکەفتین ل دەمژمێر یەکی پشتی نیڤرۆ ل دێرێ خڕڤە ببن. یا ژ هەموویێ ژێ گرنگتر ئەوە بابێ وێ ل دوماهیا ڤێ حەفتیێ ژ لوبنانێ دێ ژڤڕیت، چونکی سوژدابوویێ ل جەژنا قەشە یوحەنای ل مال بەرهەڤ ببیت.

د پەنجەرکێ دا، هێلدێ تەماشەی وی باخچەی دکر یێ بەرەڤ بەندەرێ داری یێ ڕاوەستیانا بەلەمان و کەنداڤێ بچووك درێژ دبووی. هێشتا بەلەمێن مەزن بۆ وەرزێ نوو نەهاتبوو ئامادەکرن لێ بەلەمێن کەڤن ب هندەك ستوونێن ب ڕەخ ئاڤێ ڤە هاتبوونە گرێدان، پێدڤیە ل سەر وێ ئەو ئاڤا دوهی ژ بەر باهۆزێ چوویە تێدا بڕێژیت.

دەمێ وێ تەماشەی کەنداڤێ بچووك دکری. ئەو چەندە هاتە بیرا وێ کا چەوا دەمێ هێشتا ژیێ وێ شەش یان حەفت سال، جارەکێ ئەو ب تنێ ل گەمیێ سووار ببوو و ب دەستکێن داری ئاڤ ڕاددا و خوە ژ کنارێن ئاڤێ دوور کر. لێ پشتی بورینەکا دەمەکێ کێم ئەو کەفتبوو د ئاڤێ دا و پیچەك مابوو گیانێ خوە ژ دەست بدەت ئەگەر موعجیزەیەکێ ئەو قورتال نەکربا. دەمێ زڤڕیە مال، دەرزیێ زووها ل بەردا نەمابوو، وێ ب خورتی خوە گەهاندە سەر هشکاتی و بەرەڤ باخچەی ڤە چوو، دایکا وێ ژی ب هەوارکێنی ڤە بەرەڤ وێ هات و هێشتا بەلەم و دەستك ژی ل نیڤا ئاڤێ دا مابوون. ڤێ ڕوودانێ کاریگەریەکا مەزن ل سەر ژیانا وێ کر بوو، تا وی ڕادەی گەلەك جاران خەون پێڤە ددیتن.

هەرچەندە باخچەیێ مالا وان یێ مەزن بوو، لێ باخچەیەکێ بێ چاڤدان و گول و داروبار بوو. ئەو باخچە یێ هێلدێ ب تنێ بوو و ب تنێ دارەکا سێڤێ و هندەك دارێن خوخان لێ هاتبوونە چاندن.

ل سەر گیایێ کەسك یێ قوساندی و دناڤبەرا هندەك بەر و گیایی دا، جولانەکەکا کەڤن هاتبوو دانان. ژبەر ئەو باهۆزا دوهی ڕابووی، دایکا وێ دوشەکا وێ ل سەر ڕاکربوو، ژبەر هندێ دیمەنێ وێ یێ کەڤن کرێتر خویا دکر.

باخچەی وان ب هەموو ب دارێن سپیندااران هاتبوو گرتن، ئەڤ چەندە ببوو ئەگەر کەسێن مایتێکەر نەدشیان تەماشەی ناڤ مالا وان بکەن. ژبەر ڤان داران ناڤێ وێ کربوو بجێرکلی، ئانکو "سیبەرا دار سپینداران".

باپیرێ هێلدێ ل دوماهیا چەرخێ نوزدێ زاینی ئەڤ خانیە ئاڤاکربوو کو هینگێ ئەو کاپتن بوو ل سەر یەك ژ پاپۆڕێن مەزن، ژبەر هندێ هەتا نوکە ژی ئەڤ خانیە پێ ناڤدارە ب "مالا کاپتنی".

ل ڤێ سپێدێ، هێشتا شوونوارێن باهۆزا دوهی ل سەر مابوون، ئەو باهۆز هند یا ب هێز بوو، چەندین جاران هێلد ژبەر دەنگێ عەور و بریسیان ژ خەو هشیار ببوو. لێ نوکە ئەسمان یێ سافیە و دێ بێژی چ چێنەبوویە.

پشتی ڤێ بارانا هاڤینی، نوکە سەقا گەلەك یێ پاقژ و هین بووی، نەخاسم کو ب درێژاهیا چەندین حەفتییێن بوری سەقا گەلەك یێ گەرم بوو. هەردیسان ل سەر بەلگێن دار سپینداران ژی شوونوارێن گەرماتیا هاڤینێ دیاربووینە، چونکی چەندین پینییێن زەر ل سەر لێڤێن بەلگان پەیدابببوون. نوکە دێ بێژی جیهانێ کراسەکێ نوو یێ کریە بەر خوە و هێلد ژی یا هەست پێدکەت باهۆزا دوهی زارۆکینیا وێ هەمموو یا شووشتی. "بەلێ، پشکوژك دئێشن دەمێ ڤەدبن". ئەڤ پەیڤە یێن دەستپێکا هوزانەکا سویدی نە، ئەو ژی هەکە ب دروستاهی یا ڤنلەندی نەبیت.

هێلد ل هەمبەر خودیکەکا برۆنزی یا مەزن ڕاوەستیا کو داپیرا وێ بۆ کربوو دیاری. ئەرێ ئەو یا جوانە؟ هەما هەر چ نەبیت ئەو نە یا کرێتە، بەلکو کچکەکا ناڤنجی یە. وێ پرچەکا زەر و درێژ هەبوو، لێ هەمموو کاڤان هیڤیا هندێ دخواست ڕەنگێ پرچا وێ پیچەکێ یێ ڤەبیتر یان تارێتر بایە نەك ئەڤ ڕەنگێ نەبالکێش یێ دناڤبەرا هەردوو ڕەنگان دا. لێ پرچا وێ یا لولدار ببوو ئەگەر پتریا هەڤالێن وێ یێن ڤوتابخانێ حەسیدییێ پێ ببەن و پێکۆل دکر ب ڕێکا هندەك لفافەیان ئەو ژی پرچێن خوە وەلێبکەن. چاڤێن وێ ژی، وەکو ڕەنگێ بەلگێن کەسك یێن جوان بوو.

- "ئەرێ بۆچی چاڤێن تە هندە د کەسك و جوانن؟"

ئەڤە ئەو پرسیار بوو یا بەردەوام وێ ژ مام و مەت و خاڵەتێن خوە گوهلێدبووی دەمێ ئەو هەمبێز دکری.

هێلدی پێکۆل دکر دیار بکەت کا ئەو وێنەیێ د خودیکێ دا دبینیت وێنێ کچەکێ یان ژنەکێ یە، لێ د ڕاستی دا نە ئەوە و نە یێ دی، لەشێ وێ وەکو یێ ژنەکێ یە، بەلێ دێمێ وێ یێ گرۆڤر هێشتا یێ نازك و جوانە.

تشتەکی د ڤێ خودیکێ دا ئەو پاڵدا هزرا بابێ خوە بکەت. بەری نوکە ئەڤ خودیکە د ژوورا کارکرنێ یا بابێ وێ ڤە هاتبوو هەلاویستن. بابێ وێ، ئەلبێرتی، هێلدێ ب ڤی ناڤی گازی دکرێ دەمێ دهاتە مال، بەردەوام خەون ب هندێ ڤە ددیتن ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان کارەکێ مەزن بنڤیسیت. ژبەر هندێ وی دەست ب نڤیسینا پرۆژەیێ ڕۆمانەکێ کربوو، لێ پشتی هینگێ دەست ژێ بەردابوون. هندەك جاران گوتار و هوزان د ڕۆژنامێن ناڤخۆیی دا بەلاڤ دکر، چەندین جاران هێلدێ ناڤێ بابێ خوە ل سەر ڕۆژنامەیەکێ دیت هەست ب شانازیێ دکر" ئەلبێرت کناگ، کو ب ناڤێ باپیرێ خوە هاتبوو ناڤکرن، ناڤێ وی جهەکێ تایبەت ل لیلساندێ هەبوو.

ئاه، ڤێ خودیکێ... بەری چەند سالان بابێ وێ ب تڕانەڤە گوتبوویێ ئەم دشێین ل هەمبەری خودیکێ چاڤەکێ خوە ب نقینین، بەلێ پا ڤەت ئەم نەشێین هەردوو چاڤێن خوە بنقینین و د هەمان دەم دا خوە ببینین. لێ ئەڤ خودیکە نە وەکو چ خودیکێن دی یە. یا ئەو دزانیت ئەڤە خودیکەکا جادوگەری یە و داپیرا وی پشتی ڕۆژا دەهواتا خوە یەکسەر ئەو ژ ژنەکا سێرەبەند کریبوو. گەلەك جاران هێلدێ پێکۆل دکر هەردوو چاڤێن خوە بنقینیت و خوە د خودیکێ ڕا ببینیت، لێ ئەڤ چەندە بۆ وێ یا ب زەحمەت بوو و نەدشیا وە بکەت، ژبەر هندێ وێ دەست ژ ڤان پێکۆلان بەردان، گەلەك جاران هەیڤەك ژی دا بوریت بێ کو ئەو ل بەرامبەر ڤێ خودیکێ بڕاوەستیت.

نەیا سەیرە ئەڤرۆکە ئەو کوور د هزران دا نقووم ببیت و مژوولی نیاسینا خوە ببیت، ژبەرکو ئەڤرۆکە ژیێ وێ بووینە پازدە سال.

ل دوماهییێ، چاڤێ وێ ب مێزا ل ژوورا وێ کەفت. دیاریەکا مەزن یا نخافتی ب کاغەزەکا شینێ ڤەبی و پێچای ب پاتەکێ سۆر ل سەر هاتبوو دانان. چ پێنەڤێت ئەڤە دیاریا جەژنا بوونا وێ یە.

ئەڤە ئەو دیاریە یا بابێ وێ چەندین جاران بەحسێ وێ بۆ کری، ئەو دیاریا پڕی نهێنی؟ ئەو دیاریا چەندین جاران بەحسێ وێ د کارتێن پۆستەی دا هاتیە کرن ئەوێن ژ لوبنانێ دهاتین؟ ئەرێ ما وی نەگوتبوو من "ڤشارەکا مەزن یا ئێخستیە سەر خوە"، هەردیسان د کارتەکا دی ژی دا نڤیسی بوو "ئەو دیاریا بۆ تە فرێدکەم تشتەکێ هۆسایە چ جاران ژ گەشەکرنێ ناڕاوەستیت". هەردیسان ئاماژە ب ناڤێ کچکێ کربوو کو دێ هەڤنیاسین دناڤبەرا وان دا پەیدابیت و کوپیەکا هەموو کارتێن پۆستەی بۆ وێ ژی یێ هنارتینە.

هێلدێ گەلەك پێکۆل دکرن دایکا وێ مەرەما بابێ وێ ژ ڤی کاری بۆ ڕۆهن بکەت، لێ دایکا وێ ژی چ بیرۆکە ل سەر ڤی بابەتی نەبوون.

تیبینیا ژ هەموویان سەیرتر ئەو بوو یا بابێ وێ گوتبوویێ تو دشێی ڤێ دیاریێ ل سەر کەسێن دی ژی دابەش بکەی. بابێ وێ هەما هۆسا ژ نیشکەکێ ڤە کار دگەل نەتەوەیێن یەکگرتی نەکریە، ئەو خودانێ چەندین هزروبیرێن تایبەت بوو. یەك ژ بۆچوونێن وی یێن نەگوهۆڕ ئەو بوو، بەردەوام دگوت پێدڤیە نەتەوەیێن یەکگرتی بەرپرسیاریا جیهانێ هەموویێ ب ستۆیێ خوە ڤە بگرن. ل سەر یەك ژ کارتێن خوە ژی نڤیسابوو : "پێدڤیە ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان نەتەوەیێن یەکگرتی هەموو خەلکێ جیهانێ نێزیکی هەڤدوو بکەت."

وێ گەلەك حەژ دکر یەکسەر دیاریا خوە ڤەکەت بەری دایکا وێ بهێتە د ژوور ڤە و فەرخەسێنیا تێشتێ د دگەل ئالایەکێ نەرویجێ د دەستان دا بیت و جەژنا بوونا وێ لێ پیرۆز بکەت. چ پێنەڤێت هەکە وێ ماف نەبایە نوکە دیاریا خوە ڤەکەت، پا دا بۆچی د ژوورا وێ ڤە هێتە دانان.

هێلدێ دەستێ خوە هاڤێتە کارتونا دیاریێ. ئووف چەند یا گرانە! کارتەك ل سەر دیاریێ بوو کو تێدا هاتبوو نڤیسین: "ژ دەڤ بابێ تە ب هەلکەفتا جەژنا بوونا تە یا پازدە سالیێ". هێلد ل سەر جهێن خوە ڕوونشت و ڤوماشێ سۆر و پاشی کاغەزا شین ژ دیاریێ ڤەکرن، هۆسا دیارە ئەو فائیلەکا کاغەزیان یا مەزنە.

**ئاها ئەڤە دیاریا وێ یە. ئەڤە ئەو دیاریە یا بابێ وێ بەردەوام بەحس ژێ دکر! ئەڤە ئەو دیاریا مەزنە یا ج جاران ژ گەشەکرنێ نەراوەستیت و یا دشێت ل سەر کەسێن دی ژی دابەش بکەت.**

**دەمێ وێ بلەز تەماشەی فائیلێ دا کری، هەر زوو بۆ دیاربوو کو هژمارەکا مەزن یا کاغەزێن تایپکری تێدانە. ژ فۆنتێ نڤیسینا سەر کاغەزان زانی ب وی ئامیرەی یێن هاتینە نڤیسین یێ بابێ وێ دگەل خوە بریە لوبنانێ.**

**هۆسا دیارە بابێ وێ پەرتووکەکا مەزن بۆ وێ یا نڤیسای. ل سەر لاپەرێ یەکێ، ناڤونیشانێن وێ ب ڤی رەنگی بوون.**

# جیهانا سۆفیایێ

**ل بن دا ژی ب خەتەکێ بچووکتر هاتبوو نڤیسین:**

"ئەو کەسێ نەشێت مفای ژ وانەیێن سێ هزار سالێن بوری وەربگریت، دێ هەر دناڤ تارپاتیێ دا مینیت"

گوتە

نڤیسەر و فەیلەسۆفێ ئەڵمانی

**هێلدی بەرپەرێ یەکێ ڤەکر. ل سەرێ وێ دیت بەشێ یەکێ ل بن ناڤونیشانێن "بەهەشتتا عەدەن" یێ هاتیە نڤیسین. وێ ل سەر تەختی خوە درێژ و دەست ب خواندنا پەرتووکێ کر:**

سۆفیا ئاموندسن ژ ڤوتابخانێ زڤڕی، بۆ ماوەیەکی ئەو ب ڕێکێ ڤە دگەل هەڤالا خوە جوانایێ بوو و بەحسێ مرۆڤێن ڕۆبوت دکرن. جوانایێ هزردکر مەژیێ مرۆڤی وەکو سیستەمەکێ ڕێکخستی و پێشکەفتی یە، لێ سۆفیایێ هەستپێدکر ئەو دگەل بۆچوونا وێ یا هەڤڕا نینە. نابیت ئەم بونەوەرێ مرۆڤی وەکو ئامیرەکی ل قەلەم بدەین دا، مانە هۆسایە؟

**هێلد یا بەردەوام بوو ل سەر خواندنا ڤێ پەڕتووکێ تا وی ڕادەی هەموو تشت ژبیرکرن، هەتا جەژنا بوونا خوە ژی ژبیرکر. ب تنێ جار جارە هزرەك د هاتە د سەرێ وێ دا، "ئەرێ بابێ وێ ڕۆمانەك نڤیسایە؟" ئەرێ ل دوماهیێ وی دەمێ خوە یێ ڤالا ل لوبنانێ بۆ ب دوماهی ئینانا ڕۆمانا خوە تەرخان کریە؟ ژبەرکو وی گەلەك جاران گازندە ژ دەمێ خوە یێ ڤالا ل لوبنانێ دکر.**

دەمێ ل سەر وێ بیرۆکێ ڕازیبووی کو دبیت ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان ژیانا وێ ب دوماهی بهێت، هەستەکێ هۆسا ل دەڤ پەیدابوو کو چ جاران بەری نوکە هەست ب هندێ نەکریە، ئانکو ل وی دەمێ هەستپێکرێ ئەو یا زیندی یە... ئەرێ جیهان ژ کیڤە هاتیە؟... چ پێنەڤێت دڤێت ل دەمەکێ دەستنیشانکری تشتەك ژ نەبوونێ پەیدابیت، بەلێ یا ئەم دشێین هەست ب ڤێ چەندێ بکەین؟ ئەرێ ما نە یا مەحالە ئەم هزرا خوە د وێ بیرۆکێ دا بکەین یا دبێژیت جیهان ژ دەستپێکێ وەرە یا هەی.

**هێلدێ بەردەوام لاپەڕ ڤەددان هەتا گەهشتیە وی جهی یێ تێدا بۆ یەکەم جار نامەك ژ لوبنانێ گەهشتیە سۆفیایێ ب ناڤێ: "هێلد موللەر کناگ" ب ڕێکا سۆفیا ئاموندسنێ، تاخێ کلۆڤەر 3.**

*خوشتڤیا من هێلد*

*ئەز جەژنا ژ دایکبوونا تە یا پازدە سالییێ پیروز دکەم. هەروەکو تو دزانی کو ئەز بێ ڕژدم دیاریەکێ بۆ تە فرێکەم کو پێ مەزن ببی. ل من ببورە ئەگەر من کارتەك بۆ سۆفیاییێ هنارت بیت چونکی ئەڤ چەندە یا گونجایترە.*

*دگەل رێزێن من بۆ تە*

*بابێ تە*

تەمساری! هێلدێ دزانی بابێ وێ گەلەك فەند و فێلان بکاردئینیت. ئەڤرۆکە دەمێ چاڤێن خوە ڤەکرین، وێ ئەڤ چەندە ب چاڤێن خوە دیت! ل شوونا هندێ بچیت کارتەکێ بۆ وێ فرێکەت، بێ چووی وێ بینتە دناڤ ڕۆمانا خوە دا. هەی سۆفیایا بەلەنگاز! چ پێنەڤێت نوکە حێبەتی مایە.

مەرەما بابێ هێلدێ چیە کارتا پیروزباهیا جەژنا بوونا کچا خوە بۆ سۆفیاییێ بهنێریت، ل دەمەکی کو ئەو دزانیت پێدڤی بوو وی بۆ جهەکێ دی فرێکربایە؟ ئەو کیژ بابە ئەڤ هزرا خراب چوویە د سەرێ وی دا و ڤیایە کچا خوە بخاپینیت و کارتا پیروزباهیا جەژنا بوونا وێ بۆ ناڤونیشانەکێ دی فرێکەت؟ هەروەسا بۆچی ئەڤ چەندە یا گونجایترە. یا ژ هەموویێ گرنگتر، سۆفیا چەوا دێ ل هێلدێ گەڕییێت و نیاسیت؟

ئەرێ ئەو دێ چەوا سەرەدەرییێ دگەل ڤێ چەندێ کەت؟ هێلدێ ئەو لاپەڕ ژی ب دوماهی ئینا و گەهشتە بەشێ دووێ کو ل بن ناڤێ "کولاڤێ درێژ" بوو. دەمێ گەهشتیە وێ پارچێ یا ژەلامەکێ بیانی نامەیەکێ بۆ سۆفیاییێ دهنێریت، بێهنا هێلدی تەنگ دبیت.

"ئانکو دەمێ مە دڤێت بزانین بۆچی ئەم دژین، وەکو ئارەزوویا خرڤەکرنا پولان نینە یا ژ نیشکێ ڤە ل دەڤ مرۆڤی پەیدادبیت. ئەو کەسێ مژوولی کرنا ڤان پرسیاران بیت، دێ مژوولی تشتەکی بیت کو مرۆڤایەتیێ ب درێژاهیا هەبوونا خوە ل سەر ڕوییێ ئەردی گەنگەشە ل سەر کریە"، سۆفیا حێبەتی ما.

**بەلێ پا هێلد حێبەتی نەما، بابێ وێ نە هەما ب تنێ پەڕتووکەك ب هەلکەفتا جەژنا بوونا وێ یا پازدە سالیێ بۆ نڤیسی یە، بەلکو یەك ژ سەیرترین پەڕتووکان یا بۆ وێ نڤیسی.**

ب کورتی، کێڤریشکەکا سپی دناڤ کولاڤەکێ ڤالاێ یێ درێژ دا دئینتە دەرێ، لێ ژبەرکو ئەو کێڤریشك گەلەك یا مەزنە، ملیاران سال دێ پێڤەچن هەتا ئەو سێرەبەند دشێت وێ کێڤریشکێ هەموویێ ژ کولاڤی بینتە دەرێ. هەموو زارۆکێن مرۆڤان ل سەر سەرکێن داڤێن فەروویێ کێڤریشکێ ژ دایك دبن، ژبەر هندێ حێبەتی دمینن ژبەر دیتنا وان کارێن سێرەبەندی، لێ دگەل مەزنبوونا خوە، هێدی هێدی دێ بەرەڤ کووراتیا دناڤ فەرووی دا چنە خوارێ و دێ ل وێرێ مینن.

**نەك تنێ هێلدێ هەستپێدکر ها وەختە دێ دناڤ گەرماتیا فەروویێ کێڤریشکا سپی دا نقووم بیت، ها ئەڤە ژیێ وێ ژی بوونە پازدە سال و نوکە دەم هات ئەو ڕێکا خوە ب هەلبژێریت.**

**پاشی هێلدێ ئەو بەش خواند یێ بەحسێ فەیلەسۆفێن بەری سەردەمێ سۆکراتی دکری، هەلبەت بۆ وێ نە تشتەکێ سەیر یان نوو بوو دەمێ دیتی بابێ وێ گرنگیێ ددەتە فەلسەفێ، چونکی بەری هینگێ بابێ وێ گوتارەك د ڕۆژنامەیەکێ دا بەلاڤ کربوو ل ژێر ناڤێ "بۆچی یا پێدڤیە فەلسەفە ل قوتابخانەیان بهێتە خواندن؟" و تێدا داخواز کربوو**

**فەلسەفە وەکو بابەتەکێ سەرەکی ل ڤوتابخانەیان بهێتە خواندن. پاشی ب شێوەیەکێ ئاشکەرا و فەرمی ئەڤ بابەتە ل کومبوونا کەسوکارێن ڤوتابیان بەحس کربوو.**

**هێلدێ تەماشەی دەمژمێرا خوە کر یا بوویە 7:30، خوشبەختانە هێشتا دەمژمێرەك ل بەر سینگێ وێ یا مایی ئەو سەرهاتیا سۆفیایێ دگەل جیهانا فەلسەفێ بخوینیت بەری کو دایکا وێ تێشتێ بۆ بینتە د ژوورا وێ ڤە. ب ڤی ڕەنگی ئەو شیا بەشێ دیمۆکریتسی ژی بخوینیت و گەهشتە وی جهێ سۆفیایێ هزرا خوە د پرسیارا یەکێ دا دکری: "بۆچی یاریا لیگۆیێ بلیمەتترین یاریە ل جیهانێ"، پشتی هینگێ دەمێ سۆفیایێ زەرفەکێ ڤەهوائی پێ مەزن د سندوڤا خوە یا پۆستەی دا دیتی.**

دیمۆکریتس پێ هەڤڕابوو دگەل فەیلەسۆفێن بەری خوە ئەوێن دگوتی گوهۆڕینێن بەرچاڤ د سروشتی دا، ژ ئەنجامێ گوهۆڕینەکا ڕاستەڤینە پەیدانابن. ئەو ژی دگەل وێ چەندێ بوو کو پێدڤیە هەر تشتەکێ د گەردوونی دا ژ هندەك توخمێن بچووکتر پێکهاتبیت. هەر یەك ژ ڤان تۆخمان پێ نەگوهۆڕە. دیمۆکریتسی ناڤێ ڤان پارچەیێن هەرە بچووك کرە گەردیلە Atom، ئانکو ئەو پارچەیێن ئێدی نەهێنە پارچە پارچە کرن.

**هێلدێ هەست بێهنتەنگیێ کر دەمێ گەهشتیە وی جهی وەختێ سۆفیایێ دەستمالا وێ یا سۆر ل بن تەختێ خوە دیتی. ئاها، هۆسا دیارە دەستمالا ل هێلدێ ل وێرێ یا بەرزە بووی. بەلێ پا، نابیت دەستماڵەکا هۆسا ب تنێ د چیرۆکێ دا هاتبیتە بەحسکرن، بەلکو چ پێنەڤێت ئەو دەستمالا وێ یا ژ ڕاستایە و چوویە بن تەختێ سۆفیایێ ڤە.**

**پشتی هینگێ هێلدێ دەست ب بەشێ سۆکراتی کر کو ل دەستپێکا وی بەشی چاڤێ سۆفیایێ ب مانشێتەکێ ل سەر ڕۆژنامێ دکەڤیت، هێلدێ چەند ڕێزەك ژ وی بابەتی خواندن ئەڤێ بەحسێ یەکەیەکا سەربازی یا نەرویجی ل وەلاتێ لوبنانێ دکەت. ئاخ بابێ من پێ ڤێلبازێ! گەلەك جاران بابێ وێ دگوت خەلکێ نەرویج چ گرنگیێ نادەنە کارێ هێزێن ئاشتیپارێز یێن نەتەوەیێن یەکگرتی، ئەگەر ئەڤ کارە ل دەڤ کەسێ پێ گرنگ نەبیت، هەر چ نەبیت نوکە ل دەڤ سۆفیایێ پێ گرنگە. ئەڤە ڕێکەکە ژ ڕێکێن سەرنجراکێشانا**

**ڕاگەهاندنێ. دەمێ تەماشەی تیبینیا نامەیا فەیلەسۆفی یا ل دوماهیا نامێ کری، نەشیا خوە و کرە کەنی.**

ئەگەر تە دەستماڵەکا حەریری یا سۆر دیت، هیڤیدارم باش چاڤێ خوە بدەیێ، چونکی گەلەك جاران ڕوودایە هندەك تشت ب شاشی ڤە ناگەهنە خوەدانێن خوە یێن ڕاستەقینە ب تایبەت ل قوتابخانێ یان جهێن دی یێن وەکهەڤ. هەروەسا ژبیرنەکە نوکە ئەم یێ ل قوتابخانەیا فەلسەفێ.

**هێلدێ گوهـ ل دەنگێ ڕەپ ڕەپەکێ بوو ل سەر دەرەجکان دهات، چ پێنەڤێت دێ ئەڤە دایکا وێ بیت و تێشت یا دگەل خوە ئینای. دەمێ دایکا وێ دەرگەهـ ڤوتای، هێلد گەهشتبوو وی جهی دەمێ سۆفیایێ کاسێتەکا ڤیدیویێ ل دور باژێرێ ئەسینایێ دناڤ باخچەی دا دیتی.**

- **"جەژنا بوونا تە پیرۆز، جەژنا بوونا تە پیرۆز خوشتڤیا من هێلد."**

**دەمێ دایکا وێ هێشتا ل سەر دەرەجکان، دەست ب گوتنا سترانا ڤێ سترانا کلاسیکی یا جەژنا بوونێ کربوو.**

- **"فەرمووو دایکا من یا خوشتڤی."**

**دگەل گوتنا ڤێ ئاخفتنێ، هێلد یا بەردەوام بوو ل سەر خواندنا وان ئاخفتنان یێن مامۆستایێ فەلسەفێ ل دور ئەکرۆپۆلێ بۆ سۆفیایێ دگوتین کو ژ سەروبەرێ وی یا دیارە ئەو گەلەك وەکو بابێ هێلدێ یە، نەخاسم ڕیهـ و سمبێلێن وی یێن ڕەش و کولاڤێ وی یێ شین.**

- **"هەرسال د خێر و خوشیان دا بژی."**

**بێ کو هێلد بەرسڤا وێ بدەت، ب تنێ د بن لێڤکان ڕا گوت: "ئممم."**

- **"تە خێرە."**

- "سوپاس دادێ، خوارنێ بۆ من بدانه سەر مێزێ."
- "ما تو تێشتێ ناخوی؟"
- "نەخێر، ما تو نابینی ئەز یا مژوولم؟"
- "بەلێ یا ئەڤرۆکە جەژنا بوونا تەیە، ژیێ تە بوونە پازدە سال."
- "دادێ، ئەرێ جارەکێ تو چوویە ئەسینا؟"
- "نەخێر؟ ڤێجا ئەڤە چ پرسیارە؟"
- "ب ڕاستی جهێ حێبەتیێ یە ئەڤ پەیکەرێن کەڤن ب درێژاهیا دوو هزار و پێنج سەد سالان ل جهێ خوە مایین. پەرستگەها مەزن یا ب ناڤێ "مالا مەریەما کچ" ژی یا ل وێرێ."
- "تە دیاریا بابێ خوە ڤەکر؟"
- "کیژ دیاری؟"
- "هێلد، دەمێ ئەز دگەل تە دئاخڤم بەرێ خوە بدە من، هۆسا دیارە تو نە یا ب سەلامەتی."

هێلدێ ئەو فائیلا مەزن دانا سەر چوکێن خوە و تەماشەی دایکا خوە کر.

دایکا وێ هاتە نێزیکی وێ و فەرخەسێنیا تێشتێ دانا سەر تەختێ وێ کو شەمالکەکا هەلکری ژی کربوو د نیڤەکا وێ دا، زێدەباری گلاسەکا شەربەتێ و خوارنێ و دیاریەکا بچووک ژی تێدا بوون. ئالایێ نەرویجێ ژی دانابوو بن ملێ خوە.

- "سۆپاس بۆ تە دادێ، ئەڤە ژ باشیا تەیە، بەلێ ژ ڕاستا ئەز یا مژوولم."
- "باشە مانە دڤێت بەری دەمژمێر یەکی نیڤرۆ تو بچیە دێرێ؟"

هەتا وێ گاڤێ ژی هێلدێ هند ئاگەهـ ژ خوە نەبوو، بەلکو هەتا دایکا وێ ئەڤ پرسیارا دوماهیێ ژێ کری و فەرخەسێنیا خوارنێ دانایە سەر مێزا ب ڕەخ تەختێ وێ ڤە.

- "ببورە دادێ، ئەز مژوولی خواندنا ڤێ چەندێ بووم."

هێلدێ ئاماژە کرە وێ فائیلێ و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "بابێ من ئەڤ فائیلە یا فرێکری."

- "باشه، وی چ بۆ ته نڤیسیه؟ ئەز پتر ژ ته حەز دکەم بزانم وی چ نڤیسایه، چونکی ئەڤە چەند هەیڤە وی خو پەیڤەکا ب تنێ ژی بۆ من نەنڤیسایه."
- "بەلێ پا ئەڤە ب تنێ چیرۆکەکە."
- "چیرۆك؟"
- "بەلێ چیرۆکە و د هەمان دەم دا ژی پەرتووکەکا فەلسەفی یە."
- "باشە و دیاریا من، تە نەڤێت بزانی کا من چ دیاری بۆ تە ئینایه؟"

هێلدێ هەستپێکر نە یا جوانە ئەو پتر پەسنا دیاریا بابێ خوە بکەت، ژبەر هندێ بلەز ڤالکا دیارییێ ڤەکر و ڕستەکا زێڕی تێدا دیت.

- "واو، دیاریەکا گەلەك جوانە. سۆپاس بۆ تە."

دگەل گوتنا ڤان پەیڤان، وێ خوە د دایکا خوە وەرکر و هەمبێز کر.

- "دادێ، ئەز حەز دکەم تو نوکە بچی، چونکی نوکە ئەو یێ ل سەر گوپیتکا ئەکرۆپۆلێ ڕاوەستیای."
- " تو بەحسێ کێ دکەی؟"
- "ئەز نزانم، سۆفیا ژی نزانیت. خوشیا چیرۆکێ هەموو یا د ڤێرێ دا."
- "باشە، یا ل سەر من پێدڤیە بچمە سەر کارێ خوە ل نڤیسینگەهێ. ژبیر نەکەی تێشتا خوە بخوی و کراسێ تەژی یێ ل ڤاتێ خوارێ."

ل دوماهیا دایکا وێ چوو خوارێ، ل وی دەمی مامۆستاییێ فەلسەفێ ژی ل سەر ئەکرۆپۆلێ هاتە خوارێ و ل سەر گرێ ئاریوپاگ ڕوونشت، پشتی هینگێ جارەکا دی دناڤ گۆڕەپانا گشتی یا باژێرێ ئەسینایێ دا دیاربووڤە. بیرۆکەیا بابێ وێ هاتە بیرێ دەمێ گوتی، "ل سەر هەموو وەلاتێن ئەندام د نەتەوەیێن یەکگرتی دا یا پێدڤیە کار بۆ هندێ بکەن گۆڕەپانەکا وەکو یا ئەسینایێ ئاڤا بکەن، داکو ببیتە جهەکێ ژ هەژی بۆ ب ڕێڤەبرینا دانوستاندنێن فەلسەفی. دبیت ژ بۆ گەنگەشەکرنا بابەتێ دانا جهەکی ژی بهێتە بکارئینان". ب دیتنا وی، پرۆژەیەکێ ب ڤی ڕەنگی دشێت مرۆڤایەتییێ هەموو دگەل هەڤ کوم بکەت و هاریکاریا وان بکەت پاپۆرێن نەفتێ و پاپۆرێن ئەسمانی دروست بکەن. پشتی هینگێ هێلد گەهشتە وی بەشی یێ کو تێدا بابێ وێ بەحسێ ئەفلاتۆنی کری.

"ل سەر پەڕێن ئەڤینێ، خەلك دووبارە ڤەدگەرنە وارگەهێ خوە دناڤ جیهانا بیرۆکەیان دا و خوە ژ زیندانا لەشی فورتال دکەن..."

**هەردیسان وێ سەحکرە وان لاپەڕان یێن بەحسێ سۆفیاییێ دکرین دەمێ ژ کۆلکێ خوە یێ نهێنی دەرکەفتی و ب دووڤ هێرمسی کەفتی و پاشی شوونوارێن هێرمسی بەرزە کرین. پاشی هات و دووبارە بابەتێ ئەفلاتۆنی خواند. پشتی هینگێ دەمێ چوویە دناڤ دارستانێ دا و دەریاچەیەکا بچووك دیتی کو کۆلکەکێ ڕەنگ سۆر ل لایێ وێ یێ دی بوو و کەڤالێ بجێرکلی ب دیوارەکێ وێ ڤە یێ هەلاویستی بوو و ل سەر دیوارەکێ دی کەڤالێ ژەلامەکی ب ناڤێ بێرکلی یێ هەلاویستی بوو. هۆسا دیارە ئەو کەڤالێ یێ مالا هێلدێ بوو، چەند تشتەکێ سەیرە؟"**

**هێلدی ئەو فائیلە دانا ڕەخەکی و ژ سەر تەختێ خوە ڕابووڤە و چوو ل وێ ئینسایکلوپیدیا فەلسەفی گەریا یاکو ب هەلکەفتا جەژنا بوونا وێ یا چواردە سالیێ بۆ هاتی. پاشی ل ناڤێ بێرکلی گەڕیا... ئاها ئەڤە!**

"جۆرج بێرکلی (1685-1753 زایینی)، فەیلەسۆفەکێ ئینگلیز و قەشەیێ باژێرێ کلوین بوو. وی هەبوونا جیهانا ماددی ڕەتدکر کو ژ دەرڤەی ئاگەهیا مرۆڤی بیت. ئەو د وێ باوەرێ دابوو کو هەموو هەستێن مە ژ دەڤ خودای دهێن. هەروەسا ئەو یێ ناڤدار بوو ب ڕەخنەگرتنا خوە بۆ شێوازێ ئەبستراکی "تەجریدی" ب هەموو شێوەیێن وێ ڤە. پەڕتووکا خوە یا ناڤدار "نامەیەك ل دور پرەنسیپێن زانینا مرۆڤی" ل سالا 1710 بەلاڤ کربوو."

**ب ڕاستی تشتەکێ بالکێش و ب ترس ژی بوو. بۆ ماوەیەکێ هێلد ل سەر ئەردی ڕوونشت و هزرێن خوە کرن بەری کو دووبارە بچیتە سەر جهێن خوە ڤە و بەردەوامیێ بدەتە خواندنێ.**

**چ پێنەڤێت بابێ وێ ئەڤ هەردوو کەڤاڵە بێن ل وێرێ هەلاویستین، ئەرێ ژ بلی وەکهەڤیا ناڤان، تشتەکێ دی ژی پەیوەندی پێڤە هەیە؟"**

**بێرکلی فەیلەسۆفەك بوو ب هەموو ڕەنگان هەبوونا جیهانەکا ماددی ژدەرڤەی ئاگەهیا مرۆڤی ڕەتدکر. ئەم دشێین هەبوونا تشتێن دەوروبەری خوە دووپات بکەین، لێ ڕەتکرنا هەبوونا ڤان تشتان مژارەکا دی یە. سۆفیا باشترین نموونەیە ل سەر ڤێ چەندێ مادەم هەموو هەستکرنێن وێ ب جیهانا ژ دەرڤە ژ بەرهەمێ ئاشوپا بابێ هێلدێ یە.**

**پێدڤیە ئەو بەشێن مایی ژی ئەو زووی بخوینیت. ها ئەڤە گەهشتە وی جهی دەمێ سۆفیا وێنەیێ کچەکێ د خودیکێ دا دیتی و هەردووکان پێکڤە چاڤێن خوە نقاندین.**

دەمێ وێ کچا د خودیکێ ژی چاڤێن خوە ل سۆفیایێ دنقاندین، هەروەکو دڤیا بێژیتێ: "ئەز یا تە دبینم سۆفیا، ئەڤە ئەز یا ل ڕەخێ دی.

**پشتی هینگێ سۆفیایێ جزدانکا وێ دیت. ئەرێ چەوا ئەو جزدانك گەهشتە دەڤ سۆفیایێ؟ ب ڕاستی تشتەکێ نە بەرئاقلە! بۆ هەیاما چەند چرکەیان هێلدێ هزرکر ژ ڕاستا سۆفیایێ جزدانکا وێ یا دیتی، لێ ئەڤ چەندە ب تنێ وەکو فێلەکێ بوو. هێلدێ دخواست ئەو ل جهێ سۆفیایێ بایە، چونکی نوکە هەموو تشت بۆ وێ نە د ڕۆهن و ئاشکەرانە.**

**بۆ یەکەم جار، هێلدێ حەزْ کر سۆفیایێ ببینیت.**

**پشتی هینگێ، سۆفیا نەچاربوو ژ کۆلکێ مایچەری بدەرکەڤیت، بەری کو سەرا ڤێ تاوانێ بهێتە گرتن. ل وی دەمی بەلەم ژی چووبوو د نیڤا ئاڤێ دا، ب ڕاستی یا پێدڤی بوو بابێ وێ ڕووداننا بەلەمێ بینتە بیرا وێ.**

**هێلدێ فرەك ل شەربەتێ دا و دەست ب خوارنا ساندەویچەکێ کر، دگەل هندێ ژی ل سەر خواندنێ یا بەردەوام بوو و گەهشتبوو ئەرستۆی "زەلامێ ڕێکخستنێ" ئەوێ وێریای ڕەخنێ ل تیورا ئەفلاتۆنی ل دور بیرۆکەیان بگریت.**

ئەڕستۆی دگوت چ تشت ناچنە د هوشا مرۆڤی دا ئەگەر بەری هینگێ هەستێن مرۆڤی هەست پێنەکربیت. لێ ئەفلاتۆنی دگوت چ تشتان هەبوونا خوە د سروشتی دا نینە ئەگەر بەری هینگێ د جیهانا بیرۆکەیان دا نەبیت.

**دەربارەی یاریا ڤاڤارتنا زیندەوەران ژی، هێلد خو بۆ ساتەکی ژی یا ب گومان نەبوو کو ئەو ڤەردارا ئەڕستۆیە ب ڤێ پێزانینی، ژبەرکو بەری هینگێ وێ نەدزانی ئەو یەکەم کەس بوو بنەمایێ ژێکجوداکرنا "جیهانا ڕووەك" و "جیهانا گیانەوەران" دانای.**

ئەڕستۆی دڤیا دووبارە ژوورا سۆفیایێ ب سەروبەر بکەت. هەردیسان وی گرنگی ددا هندێ بۆ مە دووپات بکەت کو هەموو تشتێن د سروشتی سەر ب گرۆپەکی ڤەنە کو بەری هینگێ هاتینە دابەشکرن، ل دووڤ دا ئەڤ تشتە ژی ل سەر هندەك گرۆپێن بچووکتر دهێنە دابەشکرن.

**دەربارەی دیتنا ئەڕستۆی بۆ ژنێ، کا چەند ب زیرەکیا وی داخبار ببوو، ژبەر ڤێ دیتنا وی هند حێبەتی ژی ما، چەوا فەیلەسۆفەکێ ل ڤی ئاستێ زیرەکیێ بۆچوونەکا هۆسا بێ ڕامان هەبیت.**

**سەرەڕای ڤێ چەندێ، ئەو شیابوو وەل سۆفیایێ بکەت ژوورا خوە ب سەروبەر بکەت و دووبارە تشتێن خوە ڕێکبێخیت، ب ڤی ڕەنگی سۆفیایێ جووتەکێ گورێن سپی یێن هەتا سەر چووکان د ژوورا خوە ڤە دیتن کو بەری هینگێ ب هەیڤەکێ هێلدێ ئەو جووتێ گورێن خوە بەرزە کربوون.**

**ل وی دەمی، سۆفیایێ هەموو کاغەزێن ئەلبێرتۆی دناڤ فائیلەکێ دا هەلگرتن کو هژمارا وان ژ پێنجی کاغەزان بوری بوو، لێ نوکە هێلد یا گەهشتیە لاپەڕێ 124، ژبەرکو یا**

**ل سەر وێ پێدڤیە ئەو چیرۆکا سۆفیایێ هەموویێ بخوینیت، زێدەباری وانەیێن فەلسەفی یێن ئەلبێرتۆ کنوکسی.**

**هیلینیزم، ناڤونیشانێن بەشێ پشتی هینگێ بوون. ئەڤ بەشە ژ هینگێ دەستپێکربوو دەمێ سۆفیایێ کارتەکا پۆستەی دیتی کو وێنەیێ ترۆمبێلەکا ژ جۆرێ جێپ یا نەتەوەیێن یەکگرتی ل سەر بوو. رێکەفتا مورا وێ کارتێ 15 گولانێ بوو. ئەڤە ژی یەك بو ژ وان کارتان یێن بابێ وێ بۆ هنارتی، لێ ل شوونا ب پۆستەی بۆ فرێکەت، بۆ کربوو دناڤ چیرۆکێ دا.**

| |
|---|
| *خوشتڤیا من هێلد*<br>*ئەز دبێژم هێشتا سالڤەگەڕا رۆژا ژ دایکبوونا تە نەهاتیە، مانە سوباهی یە! هیڤیا من ئەوە ئەڤ کارتە د هەمان رۆژ دا بگەهیتە تە. نە یا گرنگە بزانی کا هەتا کەنگی دێ مفای ژ ڤێ دیاریێ وەرگری چونکی رەنگە ب درێژاهیا ژیانا تە بمینتە دگەل تە. جەژنا بوونا تە پیروز دکەم و داخواز ژیەکێ درێژ بۆ تە دخازم. ئەز دبێژم نوکە تە زانی کا بۆچی ئەز کارتان بۆ سوفیایێ دهنێرم، ژبەر هندێ یە چونکی ئەزێ پشتڕاستم ئەو دێ گەهینتە تە.*<br>*تیبینی: دایکا تە گوتە من کو تە جزدانکا خوە یا بەرزە کری، سوزێ ددەم ب زووترین دەم 150 کورونێن سویدی بۆ تە بهنێرم داکو جزدانکەکا نوو بۆ خوە پێ بکری. دەربارەی باجا تە یا قوتابخانێ ژی، تو دشێی بەری هاتنا بێهنڤەدانا هاڤینێ، ب سانەهی ل قوتابخانێ باجەکا دی بۆ خوە دەربێخی.*<br>*بابێ تە*<br>*یێ ب دلوڤانی تە هەمبێز دکەت* |

**چ نینە، ب رێکا ڤێ یاریێ سۆفیایێ 150 کورون وەرگرتبوون. ژبەرکو ئەو یێ ب گومان بوو نەکو دیاریا وی نە هند یا بەرکەفتی بیت.**

**رۆژا 15 خزیرانێ جەژنا بوونا سۆفیایێ ژی بوو، لێ د چیرۆکێ دا هێشتا سۆفیا یا ل رۆژا 15 گولانێ. دبیت بابێ وێ هینگێ ئەو بەش نڤیسای بیت و پشتی هینگێ رێکەفتا جەژنا بوونا هێلدێ ل سەر نڤیسی بیت. هەی ژارێ سۆفیا، ئەو یا دکەتە غارێ داکو جوانایێ ل نێزیکی سەنتەرێ بازرگانی ببینیت.**

ئەرێ هێلد کیە؟ چەوا بابێ وێ یێ پشتڕاستە کو سۆفیا دێ ڤێ دیاریێ گەهینتە دەستێ وێ؟ هەرچەوا بیت، ب ڕاستی تشتەکێ بێ مانایە بابەك ل شوونا کارتێن پۆستەی ڕاستەوخو بۆ کچا خوە بهنێریت،

**هێلدێ هەستپێکر ئەو ژی یا بەرەڤ ئەسمانی دفڕیت دەمێ بەشێ ئەفلاتۆنی دخواندی.**

دناڤ هەموو تشتێن زیندی دا، پیچەك ژ نهێنیا خودای دناڤ دا هەیە. ئەم دبینین تشتەك یێ دناڤ ناخێ گول بەرۆژان دا گەش دبیت یان هەتا دناڤ گولا خشخاشێ یا کیڤی دا. ئەڤ نهێنیا خودای ل دەڤ پەلاتینکەکێ پترە دەمێ ژ سەر گولەکێ دفڕیتە سەر گولەکا دی یان ماسیەکا ڕەنگ زەر دەمێ مەلەڤانیان دکەت. لێ ب هاریکاریا ڕۆحا خوە ئەم دشێین پتر نیزیکی خودای ببین. دەمێ ئەم دگەل ڤێ نهێنیا مەزن دبینە یەك، ڕەنگە بۆ چەند ساتەکان هزر بکەین ئەم ب خوە ئەو نهێنیا خودای نە.

**ئەڤە سەیرترین تشت بوو یێ هەتا نوکە هێلدێ خواندی، لێ ژ هەموویان ژی سادەتر بوو. هەموو تشت ب تنێ یەك تشتە، ئەڤ تشتە ژی ئەو نهێنیا خودای یە یاکو هەموو تشت تێدا د بەشدار.**

ئەم نە پێدڤی ب هندێ نە باوەریێ پێ بینین یان نە، چونکی ئەڤە بۆچوونا وی یە و هەر کەسەك یێ ئازادە کا دێ چەوا ڤێ نهێنیا خودای ل دووڤ تێگەهشتنا خوە شرۆڤە کەت.

**بلەز گەهشتە بەشێ دی، ئەو ژی دەمێ سۆفیا و جوانایێ ب هەلکەفتا جەژنا نەتەوەیی خیڤەتێن خوە برینە ناڤ دارستانێ ڤەداین و چووینە د کۆلکێ مایجەری ڤە.**

**پشتی خواندنا چەند لاپەڕێن دی، ب تۆڕەیی ڤە ژ سەر جهێن خوە ڕابووڤە و ئەڤ فائیلە کرە دبن ملێ خوە ڤە. ئەڤە تشتەکێ نەخوش بوو، بابێ وێ وەکر دوو کچێن دی کوپیێن هەموو وان کارتێن پۆستەی بخوینن یێن وی د هەیاما پازدە ڕۆژێن دەستپێکێ یێن هەیڤا گولانێ دا بۆ کچا خوە فرێکرین. هێلدێ کارتێن پۆستەی یێن بابێ خوە چەندین جاران خواندن و ژ دەربڕینێن وان باش دزانی کو ئەڤە وەکو وان کارتانە یێن بابێ وێ هنارتین.**

*خوشتڤیا من هێلد:*

*ئەز بێزاربووم کو هەتا نوکە یێ بێدەنگم و نەشێم بەحسێ دیاریا جەژنا ژ دایکبوونا تە بکەم. تا نوکە شیایمە ل سەر حەزا خوە زاڵ ببم، ئەو حەزا ڕۆژانە چەندین جاران من پاڵددەت تێلەفۆنا تە بکەم داکو بێژمە تە ئەو دیاریا دێ بۆ تە فرێکەم تشتەکە بەردەوام یێ د گەشەکرنێ دا، وەکو هەموو تشتێن دی بەردەوام گەشە دکەت و مەزن دکەت ژبەر هندێ یا ب زەحمەتە ئەم وی تشتی بۆ خوە ب تنێ بهەلگرین..*

**پشتی ڤێ نامێ، هێلدێ بابەتێ ل دور جوهیاتی و یونان و ڕەوشەنبیریا جوهیاتی-مەسیحی خواند. هێلدێ هەست ب بەختەوەریێ دکر دەمێ ژ ڤی لای ڤە تەماشەی دیرۆکێ دکری، ژبەرکو چ جاران وێ ئەڤ بابەتە ل ڤوتابخانێ نەخواند بوون. ل ڤوتابخانێ، ژ بلی**

**هندەك بابەتێن هشك و بێ ڕامان ج تشتێ دی فێر نەببوو، لێ ل دوماهیا ڤی بەشی، هێلدێ هەستپێكر ژ نوو وێ گرنگیا مەسیحی و ئاینێ مەسیحیەتێ زانی.**

**وێ گەلەك حەژ ژ گوتنا "گوتە"ی كر دەمێ دبێژیت "ئەو كەسێ نەشێت مفای ژ وانەیێن سێ هزار سالێن بوری وەربگریت، دێ هەر دناڤ تارپاتییێ دا مینیت".**

**بەشێ ل دووڤ دا، ژ وێ كارتێ دەستپێكر یا دناڤ بای دا هاتی و مایە ب پەنجەركا لێنانگەها مالا سۆفیایێ ڤە. چ پێنەڤێت ئەو ژی پۆستكارتەكا نوو بوو ژ بۆ هێلدێ.**

*خوشتڤیا من هێلد:*

*ئەز نزانم دەمێ تو ڤێ كارتێ دخوینی ڕۆژا جەژنا ژ دایكبوونا تە بوری یە یان نە، هەرچەوا بیت هیڤیا من ئەوە ماوەیەكێ درێژ ب سەرڤە نەچووبیت. تو دزانی دەمێ ل دەڤ سۆفیا حەفتیەك یان دوو حەفتی دبورن، مەرج نینە ب هەمان شێوە دەم ل دەڤ مەژی ببوریت. ئەز دێ ل ئێڤاریا ڕۆژا جەژنا یوحەنای گەهمە مال و پاشی دێ ل سەر جۆلانكا دناڤ باخچەی ڕوونە خوارێ و تەماشەی دەریایێ كەین چونكی مە گەلەك سحبەت هەنە دڤێت ل سەر باخڤین.*

**ل دووڤ دا ژی تێلەفۆنەك ژ دەڤ ئەلبێرتۆی بۆ سۆفیایێ هات كو ئەو بۆ یەكەم جار بوو سوفیا گوهـ ل دەنگێ وی دبیت.**

- "ژ ئاخفتنا تە دیارە دێ شەڕەك ڕوودەت."
- "بەلێ ڕاستە، مەرەما من شەڕەكێ هزری. ل سەر مە پێدڤیە ئەم سەرنجا هێلدی بۆ خوە براكێشین و وێ ژی بكێشینە دناڤ مژارا خوە دا بەری كو بابێ وێ ژ لیلساندێ بزڤریت."

**پشتی هینگێ سۆفیایێ ئەلبێرتۆ کنوکس ل دێرەکا کو دیرۆکا دروستکرنا وێ بۆ چەرخێ دوازدێ زاینی دزڤرِی دیت ل وی دەمی ئەلبێرتۆی جلکێن قەشەیێن چەرخێن ناڤەڕاست کربوونە بەر خوە.**

**ئوھ دێر، ژ نوو ھاتە بیرا ھێلدێ کو پێدڤی بوو ئەڤرۆکە ئەو ژی چووبایە دێرێ. تەماشەی دەمژمێرا خوە کر یا بوویە دەمژمێر یەك و چارێکەك. ژبەر خواندنا ڤێ ڕۆمانێ وێ ئاگەھ ژ دەمی نەمایە.**

**یا ڕاستی بیت، نە تشتەکێ ھۆسا مەزن و ب خەمە ئەگەر ل ڕۆژا جەژنا بوونا خوە ئەو نەچیتە دێرێ. لێ تشتەکێ دی زەوقا وێ تێکدبر، ئەڤ کارتێن پیرۆزباھیێ یێن زێدە بێھنا وێ تەنگ دکر.**

**ھێلد ل سەر خواندنا گوتارا ئەلبێرتۆی یا درێژ د دێرێ ڤە یا بەردەوام بوو. ل دەڤ وێ چ ئاریشە د ھندێ دا نەبوو کو ئەلبێرتۆی جلکێن قەشەیان کرینە بەر خوە.**

**وەختێ گەھشتیە وی پاڕاگرافێ دەمێ سۆفیا خوە نیشا ھێلدگاردێ ددەت، دووبارە نەچاربوو بچیت تەماشەی ئینسایکلوپیدیا فەیلەسۆفان بکەت، لێ وێ چ تشت ب ڤان ھەردوو ناڤان نەدیتن. ھەموو گاڤان ئەڤ تشتە دووبارە دبیت، ھەردەمێ بابەتی پەیوەندی ب ژنەکێ یان ڕەگەزێ مێ ڤە ھەبیت، ئینسایکلوپیدیا وێ خوە بێدەنگ دکەت. ئەرێ تو بێژی ئەنجومەنێ پاراستنا زەلامان زێرەڤانیا ڤێ ئینسایکلوپیدیایێ کربیت و نەھێلابیت بەحسێ چ ژنان بکەت؟**

ھێلدگارد دو بینجن، ڕەبەنا دێرێ، نڤیسەر، نوشدار، زانایا ڕووەکان و زانایەکا سروشتی بوو. زێدەبارێ ڤێ چەندێ، ئەو وەکو سومبولەکی بوو ژ بۆ تێکەلی و نێزیکیا ژنێ ژ بۆ سروشت و زانستی د چەرخێن ناڤەڕاست دا، لێ خو دێرەکا ب تنێ ژی بەحسێ وێ د ڤێ ئینسایکلوپیدیایێ دا نەھاتیە کرن. ئەڤە چ کارەساتە!

**هێلدێ چ جاران گوهـ لێنەببوو "لایەنێ مێینە" یان "سروشتێ دایکایەتیێ" ل دەڤ خودای هەیە کو دبێژنێ "سۆفیا"، خوە ڕێژەکا ب تنێ ژی ل دور ڤێ چەندێ تێدا نەهاتبوو نڤیسین. نێزیکترین بابەتێ پەیوەندی ب ڤێ چەندێ ڤە هەی، دێرا "ئایا سۆفیا" بوو ل باژێرێ ڤوستەنتینیە یێ تورکی کو ڕامانا ڤی ناڤی ئانکو "پەندا پیرۆز". هەرچەندە پایتەختەك و چەندین شاهژن ب وی ناڤی هاتبوونە ناڤکرن لێ دیسان چ بەحسێ وان د ئینسایکلوپیدیایێ دا نەهاتبوو کرن. باشە ما نابێژنە ڤێ چەندێ سانسور؟**

**تشتەکێ باشە هکە بێژین سۆفیا "دیتنا ناڤخۆیی" یا هێلدێ یە، ژبەرکو هێلدێ هەستپێدکر ئەو بەردەوام یا سۆفیایا پرچ ڕەش ل پێشچاڤێن خوە دبینیت.**

**پشتی سەرهاتیا وێ ل شەڤا دێرا مەریەما پیرۆز، سۆفیا زڤڕی مال و ب هەمبەر وێ خودیکێ ڕاوەستیا یا بەری هینگێ وێ ژ کۆلکێ مایجەری ئینای.**

ل دەستپێکێ ب تنێ دێمێ خوە یێ شدیای دیت، لێ پشتی خودیکێ دێمێ کچەکا دی یا نەدیار د ڕەنگڤەدانا دێمێ وێ دا خویا کر.

وێ بلەز دوو جاران بێهنا خوە هەلکێشا و پێکۆل کر سەرێ خوە نەلڤینیت. لێ وێنێ کچکا دی یا بچووك ل پشت دێمێ وێ یێ واستیای و پرچا وێ یا ڕەش خویا دکر، ئەو پرچا وێ یا چ مودێل لێ نەدبووی ژبەر سروشتێ وێ کو یێ حلی و ڕاست بوو.

ب هەموو هێزوشیانێن خوە، کچکا د خودیکێ دا پێکۆل دکر چاڤێن خوە ل وێ بنقینیت، هۆسا دیارە ب ڤی کاری وێ دڤیا سۆفیایێ ل سەر ئامادەبوونا خوە ل دەڤ وێ ئاگەهدار بکەت. پشتی بلەز وێنێ وێ د خودیکێ دا بەرزەبوو.

**چەندین جاران هێلدێ پێکۆل دکر ژ بلی وێنەیێ خوە، وێنەیێ کچکەکا دی د خودیکێ دا ببینیت؟ بەلێ پا چەوا بابێ وێ ئەڤ تشتە هەموو دزانین؟ مانە هێلدێ ل وێنەیێ وێ ژنا پرچ ڕەش دگەریا؟ بەری هینگێ داپیرا وێ ئەو خودیکە ژ ژنەکا سێرەبەند**

کریبوو. دەمێ هێلدێ دووبارە دەستێ خوە هاڤێتیە وێ فائیلێ، دەستێن وێ لەرزین، ژبەرکو هزردکر سۆفیا یا ل هەموو جهان و وێ دبینیت.

پاشی گەهشتە وی جهی دەمێ سۆفیاییێ خەون ب هێلدێ و بجێرکلی ڤە ددیتن، ب تایبەت دەمێ وێ زنجیر و خاچا هێلدێ د خەونێ دا دیتین و پشتی هشیاربووی ئەو تشت ل بن بالیفکا وێ بوون. ئەڤ چەندە هەژی هزرکرنێ یە، ئەرێ ڕاستە وێ زنجیرە و خاچا خوە بەرژە کرینە؟

هێلد ژ سەر جهێن خوە ڕابووڤە و چوو تەماشەی سندوقا کەلوپەلێن خوە کر، بەلێ ژ ڕاستا ئەو زنجیر و خاچا داپیرا وێ ب هەلکەفتا تەعمیدکرنا* وێ بۆ کرینە دیاری ل جهێ خو نینن! بەلێ بابێ وێ چەوا زانی وێ ئەڤ تشتێن خوە پێن بەرژە کرین ل دەمەکی کو وێ ب خوە نەدزانی.

ئەڤە هەموو تشت نەبوون، بەلکو سۆفیاییێ خەونەك ب ڤەگەڕیانا بابێ هێلدێ ژ لوبنانێ ڤە دیتبوو کو هێشتا حەفتیەکا ل سەر ژڤانێ ڤەگەڕیانا وی مایی. ئەرێ تو بێژی سۆفیا ژی یا ئامادە بیت دەمێ ئەو دژفڕیت، ژبەرکو جارەکێ وی د نامەیەکا خوە دا بەحسێ هەڤالەکا نوو بۆ هێلدێ کربوو.

ژ نیشکەکێ ڤە، هێلدێ هەستپێکر کو سۆفیا بونەوەرەکا ئاشوپی و ب تنێ بەحسێ وێ د ڤێ چیرۆکێ دا هاتیە کرن، بەلکو ژ ڕاستا ئەو مرۆڤەکا ڕاستەقینەیە.

* تەعمیدکرن Baptism: ڕێوڕەسمەکێ ئاینێ مەسیحیەتێ یە کو یەکەم پێنگاڤا مرۆڤی یە بۆ چوونا ناڤ ڤی ئاینی ئەوژی ب ڕێکا شووشتنا سەرێ وی مرۆڤی ب ئاڤەکا تایبەت.

# چەرخێ ڕەوشەنگەرییێ

*... هەر ژ دروستکرنا دەرزیکێ هەتا چێکرنا زرێپپۆشان...*

**هێلدێ دەست ب خواندنا بەشێ چەرخێ ڕێنیسانسێ کربوو دەمێ گۆهـ ل پێنگاڤێن دایکا خوە بووی دەمێ کو زڤڕی مال و گەهشتە بەر دەرگەهی. تەماشەی دەمژمێرا خوە کر، ببوو دەمژمێر چواری پشتی نیڤرۆ.**

**دایکا وێ بلەز ب سەر دەرەجکان سەرکەفت و دەرگەهێ ژوورا وێ ڤەکر.**

- **"ئەڤە تو نەچوویە دێرێ؟"**
- **"بەلێ. ئەز چووم."**
- **" بەلێ پا... تە چ کربوو بەر خوە؟"**
- **"ئەڤ جلکێن نوکە ل بەر من."**
- **"ب جلکێن نڤستنێ ڤە؟"**
- **"ئەو دێرەکا بەردینی یا مەزنە، دیرۆکا وی بۆ چەرخێن ناڤین دزڤڕیت."**
- **"هێلد، ئەڤە تو چ دبێژی!"**

**هێلدێ ئەو فائیلە دانا سەر کۆشا خوە و تەماشەی دایکا خوە کر و گوت: "من ئاگەهـ ژ بورینا دەمی نەبوو... ل من ببۆرە دادێ. لێ پێدڤیە تو تێبگەهی کو ئەز یا تشتەکێ بالکێش دخوینم."**

**گرنژین ل سەر دێمێ دایکا وێ پەیدابوو، هێلد ژی یا بەردەوام بوو ل سەر ئاخفتنێن خوە.**

- **"ئەڤە پەرتووکەکا سەیرە."**
- **"باشە، دووبارە جەژنا بوونا تە پیرۆز بیت، هێلد!"**
- **"ئوف .... ئەز نزانم کا من تاقەتا وەرگرتنا پیرۆزباهیان مایە یان نە."**
- **"بەلێ یا من.... باشە ئەز دێ چم پیچەک بێهنا خوە ڤەدەم پاشی دێ دەست ب دروستکرنا خوارنێ کەم. من هندەک فراولێن نوو یێن ژ بازاڕی کڕین."**
- **" ئەز ژی دێ بەردەوامیێ دەمە خواندنا خوە."**

**پاشی دایکا وێ بەرزە بوو و هێلد ژی ل سەر خواندنێ بەردەوام بوو. هێلد گەهشتە وی جهی یێ بەحسێ سۆفیایێ دکری کو ل ناڤ جادەیێن بازێری دا ب دووڤ هێرمسی کەفتی و پاشی ل بەر دەرگەهێ مالا ئەلبێرتۆی کارتەکا نوو ژ لوبنانێ هاتی دیت کو ڕێکەفتا هنارتنا وێ 15 گولانێ بوو.**

**و ل دوماهیێ ئەو د سیستەمێ ڕۆژمێرێ گەهشت. هەموو ئەو کارتێن بەری ڕێکەفتا 15ی گولانێ هاتبوونە هنارتن، کوپیەك بوون ژ وان نامێن بابێ هێلدێ بۆ وێ هنارتین. لێ ئەو کارتا ڕێکەفتا ئەڤرۆکە ل سەر، بۆ یەکەم جارە هێلد دێ خوینیت.**

***خوشتڤیا من هێلد:***

***نوکە سۆفیا یا گەهشتیە مالا مامۆستایێ خوە یێ فەلسەفێ و ل دەمەکێ نێزیك دێ ژیێ وێ بیتە پازدە سال، لێ دوهی ژیێ تە یێ بوویە پازدە سال. یان ژی ئەڤرۆکەیە، خوشتڤیا من هێلد؟ ئەگەر جەژنا ژ دایکبوونا تە ژی ئەڤرۆکە بیت، ئەز یێ پشتڕاستم دێ نوکە ئێڤاریەکا درەنگ بیت ل دەڤ هەوە، چونکی تو دزانی دەمێن مە و هەوە نەوەکو یەکن.***

هێلدێ ئەو بابەت خواند دەمێ ئەلبێرتۆی بەحسێ چەرخێ ڕێنیسانس و فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی بێن چەرخێ هەڤدێ و فەیلەسۆفێن ئیمپریسیزمی بێن بریتانیا بۆ سۆفیایێ دکری. هەر دەمێ دگەهشتە کارتەکا نوو ب تایبەت ئەوێن پەیوەندی ب جەژنا بوونا وێ ڤە هەی، خوە ل سەرا دهاڤێت و نەخواند ب تایبەت ئەوێن بابێ وێ ب ڕێکا فێل و سێران بۆ هنارتین، هەر ژ وێ کارتا کریە دناڤ دەفتەرا دارشتنا سۆفیایێ دا، یان دەمێ دکریە دناڤ تیڤلێ مۆزێ دا یان دناڤ کۆمپیوتەری.

هەروەسا گەهشتە خواندنا وی جهی دەمێ بابێ وێ ل سەر ئەزمانێ ئەلبێرتۆی زاڵبووی و ل شوونا گوتنا ناڤێ سۆفیایێ، دگوت هێلد. یا ژ هەموویێ سەیرتر ئەو بوو کو وەل هێرمسی کر بێژیت: "رۆژ بوونا تە پیرۆز بیت، هێلد!".

هێلدێ هەستپێکر ئەو ژی دگەل بۆچوونا ئەلبێرتۆیە دەمێ دگوت بابێ وێ زێدەڕوویێ دکەت ب تایبەت دەمێ ئەو خوە دگەل خودای یان چاڤدێریا خودای هەڤبەر دکەت. لێ د ڕاستی دا وێ ژی د ناخێ خوە دا نەدزانی کا دگەل کێ یا هەڤڕایە؟ ئەرێ مانە بابێ وێ وان جۆرە لومەکرنا دئێختە سەر زارێ ئەلبێرتۆی؟ ل دوماهیێ، ئەرێ ما ئەڤ هەڤبەرکرنە دگەل خودای یا ب کەنی نینە کو بابێ وێ وەکو خودایەکێ ب هێز و شیان د چاڤێن سۆفیایێ دا دیار بکەت؟

دەمێ گەهشتیە وی جهی یێ ئەلبێرتۆ بەحسێ بێرکلی کەت، ئەو ژی وەکو سۆفیایێ گەلەک یا ب کەیف بوو و ب گرنگی ڤە وەرگرت، ئەرێ دێ نوکە چ ڕوودەت؟ چەندین جاران بەری نوکە ناڤێ وی هاتیە دووبارەکرن، ڕامانا ڤێ چەندێ ژی ئەوە تشتەکێ گەلەک تایبەت دێ دگەل ڤی فەیلەسۆفی ڕوودەت، ئەو فەیلەسۆفێ جیهانەکا ماددی ژ دەرڤەی ئاگەهیا مرۆڤی ڕەتدکری. ل ڤێرێ ژی هێلدێ پێکۆل کر بچیت ئینسایکلوپیدیا خوە بینتە دەرێ و ژیانا ڤی فەیلەسۆفی بخوینیت، لێ هۆسا دیارە چ تشتێ بالکێش وێ نەخواند.

پاشی ئەو گەهشتە چیرۆکا فرۆکێ و ئەو لافیتەیا پیرۆزباهیا جەژنا بوونێ و عەورێن ڕەش و بارانێ.

پرسيار هەمموو ئەو نينە "كا ئەم هەبين يان نەبين" بەلكو دڤێت وێ پرسيارێ بكەين كا ئەم كينە. ئەرێ ب ڕاستا ئەم بونەوەرێن مرۆڤی نە و ژ گۆشت و خوينێ پێكهاتينە؟ ئەرێ جيهانا مە ژ تشتێن ڕاستەقينە پێكدهێت، يان هەرچوار لايێن مە ب ئاگەهيێ هاتيە گرتن؟"

**يا سەير نينە ئەگەر سۆفيا نينۆكێن خوە لەقبدەت. هەرچەندە هێلدێ چ جاران ئەڤ كارێ خراب نەكربوو، بەلێ نوكە ئەو ژی دێ دەست ب ڤی كاری كەت.**

ل دەڤ مە، دبيت ئەو خواست يان ئەو ڕۆحا ڤان كاران هەممووپان دكەت، بابێ هێلدێ بيت.

**پشتی چەند دێرەكان، ئەو گەهشتە ڤێ دانوستاندنێ:**

- "ئەرێ مەرەما تە ئەوە بابێ وێ بۆ مە وەكو خوداوەندەكی يە؟"
- "بەلێ."
- "و پا هێلد، ڕۆلێ وێ چيە دناڤ ڤی بابەتی هەممووپێ دا؟"
- "ئەو فريشتەيە، سۆفيا"
- "فريشتە؟"
- "هێلد ئەو كەسە يا دگەل ڕۆحێ دئاخڤيت."

**ل ڤێرێ سۆفيايێ ئەلبێرتۆ بجهـ هێلا و دەمێ بارانێ لێدكری بلەز چوو ژ دەرڤە. تو بێژی ئەڤە هەمان ئەو باهۆز بيت يا كو دوهی ب سەر بجێركلیێ دا باری، ب تنێ چەند دەمژمێرەكان پشتی كو سۆفيايێ دناڤ باژێری دا كريە غار؟**

"سۆباهی جەژنا ژ دایکبوونا منە. ئەرێ مانە یا ب دلئێشە کەسەك ب ڕۆژەکێ بەری جەژنا بوونا خوە یا پازدە سالیێ ژ نوو بزانیت دنیا هەموو خەونە؟"

ئەڤە وەکو وێ چەندێ یە کەسەك کارتەکا بەختی کو بهایێ وێ ملیون لیرە بن ببەت، لێ دەمێ دستێ خوە دهاڤێژیتە پاران داکو وەربگریت، ژ نیشکەکێ ڤە بۆ وی دیار بیت ئەو چەندە هەموو خەون بوو.

دەمێ سۆفیا گەهشتیە نێزیکی یاریگەها گشتی، وێ دیت کەسەك یا بەرەڤ وێ ڤە دکەتە غارێ، ئەو دایکا وێ بوو و بلەز سۆفیا دا بەر سینگێ خوە.

- "کچا من یا خوشتڤی، ئەڤە چیە ب سەرێ مە دهێت؟"

سۆفیایێ ب چاڤێن گری ڤە گوت: "ئەز نزانم، بەلێ پا وەکو خەونەکا نەخوشە."

**چاڤێن هێلدێ تژی ڕۆندك بوون دەمێ ئەڤ دێرە خواندی: "ئەز هەبم یان نەبم، ئاریشە هەر ئەڤەیە."**

**هێلدێ فائیلە هاڤێتە سەر تەختێ خوە و ڕابوو ژ پێرڤە و هات و دچوو هەتا ل دوماهیێ چوویە بەر خودیکێ ڕاوەستیای و پاشی دایکا وێ هاتی و گازی کریێ داکو بچیت خوارنێ بخوت. ل وی دەمی ژ نوو هێلدێ هەستپێکر کا چەند وەخت بوریە هندی ئەو ل بەر خودیکێ ڕاوەستیای. لێ یا ژ تشتەکی ب تنێ پشتڕاست بوو، ئەو ژی بۆ یەکەم جاربوو وێنێ خوە د خودیکێ دا ببینیت دەمێ هەردوو چاڤێن خوە پێکڤە دنقینیت.**

**ل سەر سفرا خوارنێ، پێکۆل دکر هۆسا ڕەفتاری بکەت کو گەلەك یا کەیفخوشە ژبەر جەژنا بوونا وێ. لێ هزرا وێ هەموو ل سەر سۆفیایێ و ئەلبێرتۆی بوو.**

**ئەرێ نوکە دێ چ ب سەرێ وان هێت، ب تایبەت پشتی کو زانی هەموو تشت پێن د دستێ بابێ وێ دا؟... بابێ وێ وەل وان کربوو هزر بکەن ئەو گەلەك تشتان دزانن، لێ د ڕاستی دا وان چ تشتێن مەزن نەدزانین. بەلێ ئاریشە هەروەکو خوە مابوو: نوکە سۆفیا و ئەلبێرتۆ دزانن کا چ دهێتە ڕوودان، ژبەر هندی پێدڤیە چیرۆك نێزیکی دوماهیێ ببیت.**

هێلدێ ب ڕێکا خوارنا پرتەکا پتاتێ دڤیا ئێدی هزرێن سوفیایێ و ئەلبێرتۆی نەکەت. ل وی دەمی هاتە هزرا وێ کو ئەو دشێت ڤی بابەتی ل سەر جیهانا خوە ژی پراکتیزە بکەت. مرۆڤان ب ڕێکا هزرێن خوە، بەردەوام یاساێن سروشتی پێش ئێخستینە. لێ ئەرێ ما چێدبیت ئەڤ چیرۆکە یا بەردەوام بیت و چ دوماهیک نەبن، خو هەکە فەلسەفە و زانست دوماهیک بەرێ خوە بێ ئاڤاکرنێ ژی بدانن؟ ئەرێ ل وی دەمی مرۆڤ نێزیکی دوماهیا دیرۆکێ نابن؟ دگەل هندێ پەیوەندیەک هەیە دناڤبەرا پێشکەفتنا هزری و زانستی ژ لایەکی ڤە و کارتێکرنا خانیێن پلاستیکی یێن چاندنێ و تالانکرنا دارستانان ژ ئەنجامێ بارانێن پیس و پرِی ترشاتی ژ لایەکێ دی ڤە؟ ئانکو دبیت هند بێ ئاقلی نەبیت هندەک کەس هۆسا هزر بکەت کو ئەڤ پێدڤیا بەردەوام و نووکری بۆ زانینی، جۆرەک بیت ژ جۆرێن کەفتنا ڕاستەڤینە.

مەزنی و ترسا پرسیارێ وەل هێلدێ کر پێکۆلێ بکەت ژبیرا خوە ببەت. بێ گومان ئەگەر ل سەر خواندنا دیاریا بابێ خوە یا بەردەوام بیت دێ پتر تێگەهیت.

پشتی خوارنا فراولەکا ئیتالی، دایکا وێ ب نازداری ڤە پرسیار ژێ کر: "بێژە من تە چ دڤێت، چونکی ئەڤرۆکە تو دێ بریارێ دەی کا چ بکەین."

- "ئەز دزانم پیچەک یا سەیر و نە ئاساییە، لێ ب ڕاستی من دڤێت ل سەر خواندنا وێ پەرتووکا بابێ من کریە دیاری بەردەوام بم."

- "بلا ب کەیفا تەیە، لێ یا هشیاربی تە دین نەکەت."

- "نەخێر..."

- "پاشی ئەم دشێین دگەل تەماشەکرنا بەرنامێ "دیریک"، بیتزایەکێ ژی بخۆین."

- " بەلێ."

هزرەک هاتە د سەرێ هێلدێ دا: ئەو ژی ئەو وینەیێ سۆفیایێ بۆ دایکا خوە وێنەکری و شێوازێ ئاخفتنا وێ دایکا وێ بوو. ئەرێ تو بێژی بابێ هێلدێ هند تشت ژ دایکا هێلدێ وەرگرتبن داکو کەسایەتیا دایکا سۆفیایێ د چیرۆکا خوە وێنە بکەت؟ هەرچەوا بیت، یا باشترە ئەڤرۆکە بەحسێ وێ کێڤریشکا سپی نەکەت ئەوا دناڤ کولاڤێ گەردوونی دا دەردکەڤیت، هەر چ نەبیت هەما ئەڤرۆکە."

**هێلد ژ سەر مێزا خوارنێ ڕابوو و گوت: "ب ڤێ هەلکەفتێ..."**

- **" چ؟"**
- **" من خاچا خوە یا زێڕی یا بەرژەکری"**

**دایکا وێ ب ئاورینەکا تیژ تەماشەی وێ کر.**

- **"بەری چەند حەفتیان من ل بن مەمەری ڤە دیتبوو. دبیت ژ تە کەفتبیت."**
- **"تە ئەڤ چەندە گوتیە بابێ من؟"**
- **"ئەز نزانم... چێدبیت."**
- **"باشە، نوکە ل کیڤەیە؟"**

**دایکا وێ چوو دناڤ ڤالکا بازنك و ڕستك و گۆستیرکێن خوە لێبگەڕییێت. پشتی دەمەکێ کێم دەنگێ ڤێژیەکێ بلند بوو. دەمێ زڤڕیە ژوورا ڕوونشتنێ ڤە، دایکا وێ گوت: "من ڕستکا تە نەدیت، ب چ ڕەنگان دەستێ کەسێ نەچوویە دناڤ ڤالکا زێڕێن من دا."**

- **"من ژی گومان ل سەر ڤێ چەندێ هەیە."**

**دگەل ڤان گوتنان، هێلدێ دایکا خوە هەمبێز کر و ڤەگەڕیا ژوورا خوە. و جارەکا دی ل سەر خواندنا چیرۆکا سۆفیایێ بەردەوام بوو.**

ل ڕۆژا دووڤ، دا دایکا وێ هاتە ژوور. زەرفەکێ مەزن یێ دیاریان د دەستێ وێ دابوو و ئالایەکێ نەرویجێ دانابوو دناڤ بتلەکێ ڤالا دا.

- "جەژنا بوونا تە پیرۆز بیت."

سۆفیایێ چاڤێن خوە پەڕخاندن و پێکۆل کر خەوا خوە بڤەڕەڤینیت. پاشی پێکۆل کر ڕوودانێن دوهی بینیتە پێش چاڤێن خوە. لێ وەکو یاریەکا پارچە پارچە کری دهاتنە پێش چاڤێن وێ. یەك ژ وان پارچەیان ئەلبێرتۆ بوو، یەکا دی هێلد، مایجەر، بێرکلی بوو. لێ پارچەیا ژ هەموویان ڕەشتر ژی ئەو بریسی و تەڤیا بارانێ بوون. بارانێ ئەو تووشی واستیانەکا لەشی و دەماری کربوو، ژبەر هندێ دایکا وێ لەشێ وێ ڤەمالی بوو

و دانابوو سەر جهێن وێ یێن نڤستنێ و پاشی کۆپەکێ شیرێ گەرم و هنگڤین ژی بۆ ئینابوون و پشتی ڤەخواری یەکسەر نڤستبوو.

سۆفیایێ د بن لێفکان ڕا گوت: "ئەز دبێژم هێشتا ئەز یا مایمە ساخ."

- "ل دەستپێکێ، ئەڤە چ هزرن تو دکەی، ئەڤرۆکە تو بوویە پازدە سال."
- "تو یا ژ ڤێ چەندێ پشتڕاستی؟"
- "هەلبەت. تو بێژی دایکەك جەژنا بوونا کچا خوە یا یەکانە ژبیر بکەت؟ ڕۆژا (1975/6/15) دەمژمێر یەك و نیڤی سپێدێ بوو سۆفیا. ئەو بەختەوەرترین ساتێن ژیانا من بوون."
- "تو بێژی ئەڤ چەندە هەموو خەون نینە؟"
- "هەر چ نەبیت، خەونەکا نەخوش نینە دەمێ مرۆڤ هشیار دبیت و ل دوماندوری خوە پارچەیێن نانی و پەنیری و شەربەتا پڕتەقالان و دیاریان ببینیت."

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان، دایکا وێ کارتۆنا دیاریان دانا سەر کورسیکێ و بۆ دەمەکی چوو ژ دەرڤە و دەمێ زڤڕی سێنیەکا خوارنێ بۆ وێ ئینا. پاشی دەست ب ڤەکرنا وان دیاریان کر یێن ل سالێن دەستپێکێ یێن ژیێ وێ بۆ هاتین، زێدەباری بەحسکرنا ڤێژییێن دەنگێ وێ ل وی دەمی.

دایکا وێ دەستەکێ یاریا تەنسێ بۆ ئینابوو. هەرچەندە سۆفیایێ نەدزانی یاریا تەنسێ بکەت، لێ یاریگەهەکا تەنسێ بۆ دەمێ چەند خولەکەکان یا ژ جادەیا وان دوور بوو. بابێ وێ ژی تێلەڤزیۆنەك دیاری بۆ ئینابوو کو ڕادیویا FM ژی تێدا بوو و ڕوبەرێ شاشا وێ ژ ڕووبەرێ وێنەیەکێ ئاسایی مەزنتر نەبوو.

پاشی دیارییێن مەت و خالەت و دۆست و هەڤالێن خوە یێن نێزیك ڤەکرن.

- "تە دڤێت ئەز ئەڤرۆ ل مال بم و نەچمە کاری؟"
- "نەخێر، بۆچی؟"
- "دۆهی هەموویێ تو یا ب سەلامەت نەبووی. ئەگەر ڕەوشا تە هەر یا ب ڤی ڕەنگی بیت، ئەز دبێژم پێدڤیە ئەم سەرەدانا نوشدارەکی بکەین."
- "نەخێر، ئەز دبێژم پێدڤی هندێ ناکەت."

- "ئەرێ دەنگێ بریسیان ئەگەر بوو، یان ئەلبێرتۆی ژی؟"

- " تو چ دبێژی؟ ما هەر تە نەدگوت ئەڤە چ ب سەرێ مە دهێت خوشتڤیا من؟"

- "ئەز دبێژم دەمێ تو دچیە باژێری و دێ دگەل مرۆڤەکێن بیانی دڕوونی. ئەڤە گونەها منە."

- "گونەها کەسێ نینە ئەگەر ئەز ل دەمێ خوە یێ ڤالاْ وانەیێن فەلسەفێ بخوینم. تو هەڕە سەر کارێ خوە، پێدڤیە ئەز ژی بچمە قوتابخانێ، چونکی ل دەمژمێر دووی پشتی نیڤرو د ئاهەنگەکا بچووك دا دێ باوەرنامێن مە دەنەڤ مە."

- "تو دزانی نمرێن تە د چەوانە؟"

- "پا هەر چ نەبیت دێ ژ بەری نوکە باشتر بن."

پشتی دایکا وێ چووی، ب دەمەکێ کێم زەنگا تێلەفۆنێ هاتە لێدان.

- "ئەلو، فەرمووو."

- "ئەز ئەلبێرتۆ مە."

- "ئاها..."

- "تە دیت دوهی مایجەری چ ئینا سەرێ مە."

- " مەرەما تە تێناگەهم؟"

- "مەرەما من ئەو باهۆز بوو، سۆفیا."

- "نزا باوەر ژ چ بکەم."

- "ئەڤە یەکەمین ئەرکێ ل سەر ملێن فەیلەسۆفێن ڕاستەقینەیە، تو دزانی؟ ئەز گەلەك شانازیێ ب تە دبەم کو د ڤی دەمێ کورت دا هۆسا زوو فێربووی."

- "ئەز دترسم ئەڤ تشتە هەموو د ڕاست نەبن."

- "دبێژنە ڤێ چەندێ "دوودلیا هەبوونێ" و گەلەك جاران دبیتە دەستپێکا زانینەکا نوو."

- "ئەز دبێژم من پێدڤی ب بێهنڤەدانەکێ هەیە ژ وەرگرتنا وانەیان."

- "ئەرێ د ڤی دەمی دا گەلەك بەق دناڤ باخچێ هەوە دا هەنە؟

سۆفیا نەشیا خوە و کرە کەنی، ئەلبێرتۆی ژی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "ئەز دبێژم ئەم بەردەوام بین باشترە. جەژنا بوونا تە پیرۆز. ئەم د نەچارین دڤێت بەری جەژنا قەشە یوحەنای کۆرسێ خوە ب دوماهی بینین، ئەڤە دوماهی هیڤیا مەیە."

- " هیڤیا مە یا دوماهیێ؟

- "تو باش ڕوونشتیە؟ چونکی گەنگەشەکرنا ڤی بابەتی دەمەکێ باش پێ دڤێت. تو تێدگەهی؟"

- "بەلێ ئەز باش یا ڕوونشتیم."

- "بیرا تە ل دیکارتی دهێت؟"

- "ئەز هزر دکەم، ئانکو ئەز یا هەیم."

- "ئەگەر ئەم بەردەوامیێ بدەینە ڤێ تاقیکرنێ، دێ تووشی ئاریشەیەکێ بین. ئەگەر ب بەردەوامی د گومانێ دا بین، ئەم نزانین کا ئەم هزر دکەین یان نە. دبیت ئەم بگەهینە وێ قەناعەتێ کو ئەم ب تنێ هندەك بیرۆکەینە و چ پەیوەندی دگەل هزرکرنا مەڤە نینە. مە گەلەك ئەگەر هەنە کو هزر بکەین ئەم ب تنێ بەرهەمێ دارێژتنا ئاشوپا بابێ هێلدێ نە، یێ کو ب ڤێ ڕێکێ دڤێت ب هەلکەفتا جەژنا بوونا کچا خوە هێلدێ ل لیلساندێ، کەیفخوشیەکا بچووك چێکەت. ئەرێ تو دگەل منی؟"

- "بەلێ..."

- "لێ ل ڤێرێ هەڤدژیەك هەیە: ئەگەر ئەم ب تنێ هندەك مرۆڤێن ئاشوپی بین، ب چ ڕەنگەکان مە ماف نینە باوەریێ ب چ تشتان بینین. واتە ئەڤ گەنگەشا نوکە ژی ب تنێ ئاشوپە نەك زێدەتر."

- "ئانکو مە کێمترین شیانێن ئازاد ژی ل سەر کونترۆلکرنێ نینن، هەردیسان کێمترین حەز و خواست ژی نینن. بەلکو مایجەر بڕیارێ ل سەر ئاخفتن و کارێن مە ددەت، باشە باشترە ئەگەر تێلەفۆنێ ژی بگرین."

- "نەخێر، تو ب ڤی ڕەنگی گەلەك تشتان سادە دکەی."

- "بۆ من ڕۆهن بکە."

- "ئەرێ تە دڤێت بێژی زەلامەك پلان و دیزانیا هەموو خەونێن مە دداڕێژیت؟ دبیت بابێ هێلدێ ئاگەهـ ژ هەموو کریارێن مە هەبیت. ژبەرکو غاردانا ل دووڤ ئاگەهیێ،

وەکو غاردانا ل دووڤ سیبەرێ یا ب زەحمەتە. ئاها ژ نوکە وێڤە ئەز دێ پلانەکێ دانم، چ تشت نینن مە پشتڕاست بکەت کو مایجەر پێشبینیا هەموو تشتان دکەت بەری بهێنە ڕوودانان. دبیت ئەو ب تنێ ل ساتێن دوماهیێ بڕیارێ بدەت ب تایبەت دەمێ دەست ب دەمێ داڕشتنا هزرێن خوە دکەت.

ل ڤی دەمێ کورت ب تنێ ئەم دشێین بینە پێشچاڤێن خوە کو ئەم تا ڕاددەیەکی د ئازادین کا چ بکەین و چ بێژین. یا دیارە ئەڤ شیانێن مە ژی ب هەڤبەرکرن دگەل شیانێن مایجەری یێن مەزن، گەلەك د بچووك و سنووردارن. ئەم ژی یێن کەفیتە ژێر کاریگەریا کارتێکرنێن دەرەکی، هەروەکو وی سەیێ دگەل تە ئاخفتی، وێ فرۆکەیا پیرۆزباهیا جەژنێ هەلگرتی و وێ پەیاما دناڤ تیڤلێ مۆزێ دا. لێ دگەل هندێ نابیت وێ ڕاستیێ ڤەشێرین کو ئەم خوەدان خواستا خوە یا ئازادین خوە هەکە چەند یا بچووك ژی بیت."

- "ئانکو چەوا؟"

- "مایجەر هەموو تشتێن جیهانا مە یا بچووك دزانیت، لێ ڕامانا وێ ئەو نینە کو وی شیانێن ڕەها هەبن. پێدڤیە ژیانا خوە ب ڕەنگەکێ هۆسا برێڤە ببەین هەروەکو ئەو نەی."

- "ئەز دبێژم ئەز مەرەما تە تێدگەهم."

- "مەرەما دوماهیی ئەوە ئەم بشێین کارەکی بکەین بێ مایجەر بزانیت."

- "دێ چەوا کارەکێ هۆسا کەین ئەگەر ژ ڕاست مە هەبوونا خوە نەبیت؟"

- "کێ گوتیە مە هەبوونا خوە نینە؟ بابەت نە ئەوە کا ئەم هەینە یان نە، بەلکو ئەوە بزانین کا ئەم چ دکەین و ئەم کینە. ئەگەر دانپێدانێ ب هندێ بکەین کو ب تنێ ئەم بەرهەمێ ئاگەهیا مایجەری نە، لێ ئێدی ئەڤە وێ چەندێ ناگەهینیت کو ئەو هەبوونا مە ژ مە بستینیت."

- "هەتا خواستا مە یا ئازاد ژی؟"

- "ئەڤە ئەو خاڵە یا ئەز ل سەر کار دکەم."

- "لێ بابێ هێلدێ ژی ئاگەهـ ژێ هەیە کو دێ کاری ل سەر کەی."

- "چ پێنەڤێت نەخێر.، لێ ئەو هەموو پلانا من نزانیت. ئەز پێکۆڵێ دکەم خاڵەکا ئەرخەمیدسی بجهـ بینم."

- "خاڵا ئەرخەمیدسی؟"

- "ئەرخەمیدس زانایەکێ یونانی بوو. یێ ب ڤێ گوتنا خوە ناڤدار بوو "خاڵەکا نەگوهۆڕ بدە من، دا ئەز جیهانێ بۆ تە بهەژینم". پێدڤیە ئەم ژی خاڵەکا هۆسا ببینین داکو هەڤسەنگیا ناڤخۆیی یا مایجەری تێکبدەین."

- " بەلێ پا ئەڤە پرۆژەیەکێ ب ساناهی نینە!"

- "لێ مە چ هیڤیێن دی نینن بگەهینە وی بەری کو وانەیێن خوە یێن فەلسەفێ ب دووماهی بینین. هەتا نوکە ژی فشارەکا مەزن ل سەر مە دکەت. دبیت وی بریار دابیت ئەز ب وی رۆلێ بەحسکرنا چەرخێن مایی رابم. لێ هەتا نوکە ب تنێ چەند رۆژەك یێن ل بەر سینگێ مە ماین، بەری کو ل جهەکێ رۆژهەلاتا ناڤین سوواری فرۆکەکێ بیت و بڤەگەریت. ئەگەر بەری ئەو بڤەگەریتە بجێرکلی، ئەم خوە ژ ئاشوپا وی رزگار نەکەین، دێ بەرزەبین."

- "تو یێ من دترسینی."

- "ل بەری هەموو تشتان، دڤێت گرنگترین زانیاریان ل دور چەرخێن رەوشەنگەریێ ل فرەنسی بدەمە تە بەری کو ب درێژاهی بەحسێ فەلسەفەیا "کانت"ی بکەین و پاشی بچینە د بابەتێ "رۆمانسیزم"ێ دا و پشتی هینگێ کا چەوا ئەو قۆناغا هەستیار یا "هیگل"ی ئافراندی، بەرێ مە ددەتە بەحسکرنا رەخنەیا "کیرکیگارد"ی ل فەیلەسۆفێن هیلینیزمی گرتی. هەردیسان دڤێت پیچەکێ بەحسێ مارکس و داروین و فرۆید ژی بکەین هەتا دگەهینە سارتەری و فەلسەفێا وی یا هەبوونێ، ل وی دەمی دێ پلانا مە ب دوماهی هێت و دێ سەرکەڤین."

- "ئەڤە پرۆگرامەکێ مەزنە، د حەفتیەکێ ب تنێ دێ وەرگرین!"

- "ژبەر هندێ پێدڤیە هەر ژ نوکە دەستپێبکەین، تو دشێی نوکە بهێیە دەف من؟"

- "ل دەستپێکێ پێدڤیە بچمە قوتابخانێ، چونکی ئەڤرۆ ئاهەنگەکا بچووك یا هەی و دێ باوەرنامەیان ژی وەرگرین."

- "ژ ڤێ چەندێ ڤەبە! ئەگەر مە وژدانەکا پاقژ و زەلال نەبیت، ل وی دەمی دێ تاما شیرینی و خوارنێ ب تنێ ئاشوپەك بیت نەك زێدەتر."

- "و باوەرنامەیا من؟"

- "گۆهێ خوه بدێ سۆفیا، تو ل سەر گەردوونەکێ جوان و خوەدان ملیار ستێر بژی، یان ژی ل سەر ئەختەرەکێ کو ب تنێ یەکە ژ سەدان ملیار ئەختەرێن دی، یان ژی بەرهەمێ هندەك پێلێن کەهروموگناتیسی یێن ناخێ مایجەری بی، ژ نوو بهێی و بەحسێ باوەرنامێ بکەی، ئەگەر ئەز ل جهێ تە بام دا شەرم کەم."

- "ببورە."

- "بەلێ دگەل هندێ باشترە بەری تو بهێیە ڤێرە، بچیە قوتابخانێ. ئەگەر ڕۆژا دوماهیێ خوە ڤەدزی، دبیت کارتێکرنەکا خراب ل سەر هێلدێ ژی بکەت، چونکی ئەو ژ وان قوتابیانە یێن هەتا ڕۆژا جەژنا بوونا خوە ژی دچنە قوتابخانێ، ژبەرکو ئەو فریشتەیە."

- "باشە دێ بلەز چمە قوتابخانێ و پاشی یەکسەر هێمە دەڤ تە."

- "ئەم دێ ل کۆلکێ مایجەری هەڤدوو ببینین."

- " کۆلکێ مایجەری؟"

- "تك..".

**هێلدێ ئەو فائیلە کرە د کۆشا خوە دا. ب ڤی ڕەنگی بابێ وێ شیا ب سەرکەڤیت و وەلی بکەت هەست ب گۆنەهێ بکەت، چونکی دوماهیك ڕۆژا خوە یا قوتابخانێ نەچوو... هەی چەپەلێ!**

**وێ د دلێ خوە دا پرسیار کر ئەرێ کا پیلانا ئەلبێرتۆی چیە، ئەرێ بەردەوامیێ بدەتە خواندنێ و لاپەڕێ دی ڤەدەت؟ نەخێر.. ... باشتر ئەوە هەر زوی دەست ب خواندنێ بکەت بێ کو خوە ل سەر هندەك تشتان ڕا بهاڤێژیت.**

**ئەو دگەل خالەکا ئەلبێرتۆی یا هەڤڕابوو، کو بابێ وێ ل سەر سۆفیایێ و ئەلبێرتۆی یێ زالبوو، لێ سەرەڕای ڤێ چەندێ، بابێ وێ پێشبینی یا هەموو ڕویدانان نەدکر. دبیت گەلەك بلەز تشتەك نڤیسا بیت و پشتی بوورینا دەمەکێ درێژ هاتبیتە هزرا وی و بەرێ خوە دابیتی. ل وی دەمی ژی تا ڕاددەکی دا ئازادیێ دەتە سۆفیایێ و ئەلبێرتۆی.**

جارەکا دی هێلدێ هەستپێکر سۆفیا و ئەلبێرتۆ ژ ڕاست بێن هەبن. وێ د دلێ خوە دا گوت: ڕاستە دەریا ب تەمامی یا بێ دەنگە، لێ ئەڤە ڕامانا وێ چەندێ نینە کو دناڤ کووراتیا وێ دا چ ڕوونادەت.

*بۆچی وێ ئەڤ هزرە کر؟*

*ئەڤە نە هزرەکا سەرڤە سەرڤە بوو.*

ل قوتابخانێ، هەموو قوتابیان جەژنا بوونا سوفیایێ پیرۆز کر و سترانا کلاسیکی یا جەژنا بوونێ بۆ گوت. سەقایێ ئاهەنگا وان گەلەك یێ خوش و ب کەیف بوو ب تایبەت دەمێ دەستپێکرنا برگەیێن ئاهەنگێ و بەلاڤکرنا باوەرنامەیان ل سەر قوتابیان.

دەمێ ئاهەنگ ب دوماهی هاتی و قوتابی ژ ناڤ باخچەی دەرکەفتین، سۆفیا بلەز زڤڕی مال. هەرچەندە جوانایێ پێکۆل کر وێ براوەستینیت لێ یا بێ مفا بوو. سۆفیایێ گوت من کارەکێ گرنگ هەیە.

دناڤ سندۆقا پۆستەی دا، وێ دوو کارتێن نوو دیتن کو ژ لۆبنانێ هاتبوون و ل سەر هەردوو کارتان نڤیسا بوو "جەژنا بوونا تە یا پازدە سالیێ پیرۆز بیت".

کارتا یەکێ هاتبوو هنارتن بۆ هێلد موللەر کناگێ ب ڕێکا سۆفیا ئاموندسنێ. یا دی ژی بۆ سۆفیایێ ب خوە هاتبوو هنارتن و مورا یەکەیا نەڕوێجی یا سەر ب نەتەوەیێن یەکگرتی ل سەر بوو.

*خوشتڤیا من سۆفیا ئاموندسن:*

*ئەڤرۆکە جەژنا بوونا تەیە، ب ڤێ هەلکەفتێ ژ دل پیرۆزباهیا تە دکەم. زۆر سۆپاس بۆ هەموو وان تشتێن هەتا نوکە تە بۆ هێلدێ کرین.*

*دگەل ڕێز و سلاڤێن من*

*مایجەر ئەلبێرت کناگ*

ل دەستپێکێ سۆفیایێ نەدزانی کا کەیفا وێ ب کارتا بابێ هێلدێ بهێت یان نە. چونکی ئەڤە یەکەمین جار بوو ب شێوەیەکێ ڕاستەخو کارتەکا پۆستەی بۆ وێ بهنێریت.

ل سەر کارتا هێلدێ ژی نڤیسا بوو:

نازدارا من هێلد:
ئەز نزانم نوکە دەمژمێر چەندە یان چ ڕۆژە ل لیلسەندێ، لێ ئەڤە نە یا گرنگە؟ ئەگەر ئەز یێ شاش نەبم، ئەز دبێژم هێشتا دەم ب سەرڤە نەچوویە یان نەبوویە درەنگ ئەگەر پیرۆزباهیا جەژنا بوونا تە بکەم (بۆ جارا دووماهیێ و بەری دوماهیێ). لێ نابیت هەتا درەنگ بمینیە د خەو، ژبەرکو دێ ئەلبێرتۆ بۆ تە بەحسێ چەندین خالێن چەرخێ ڕەوشەنگەریێ ل فرەنسا کەت. بابەتێ وی د ژ ڤان حەفت خالێن سەرەکی پێکدهات:

1. یاخیبوون ل سەر دەستهەلاتێ.
2. ڕاشیۆنالیزم.
3. هزرا چەرخێ ڕەوشەنگەری.
4. گەشبینیا ڕەوشەنبیری.
5. ڤەگەڕیان بۆ سروشتی.
6. ئایینێ مەسیحی.
7. مافێن مرۆڤی.

هۆسا دیارە مایجەر بەرێ خوە ژ وان ڤەناکەت. سۆفیا زڤڕی مالێ و باوەرنامەیا خوە ب هەموو پلەیێن "زۆر باش" دانا سەر مێزا خوارنێ یا د لێنانگەهێ ڤە، پاشی بەرەڤ دارستانێ چوو گەهشتە دەف دەریاچێ و ب بەلەمێ چوو ڕەخێ دی.

ئەلبێرتۆ ل بەر دەرگەهێ ل هیڤیا وێ بوو و دەمێ سۆفیا گەهشتیە دەڤ وی، ئاماژە پێکر کو ل نێزیکی وی ب ڕوونتە خوارێ. سەرەڕای کو سەڤا یێ خۆش بوو، لێ مژەکا شێدار ژ دەریاچێ بلند دبوو، دا بێژی هێشتا ماوەیەکێ درێژ ل سەر ئارامبوونا باهۆزێ نە بوریە.

ئەلبێرتۆی گوت: "دا یەکسەر بەرەڤ ئارمانجا خوە ڤە بچین. پشتی هیومی، کانت خوەدان دووەمین ڕێبازا مەزن یا فەلسەفێ بوو. لێ ل چەرخێ هەژدێ زاینی، وەلاتێ فرەنسا ببوو خوەدانا چەندین هزرمەندێن گرنگ. ئەم دشێین بێژین ل نیڤا یەکێ ژ چەرخێ هەژدێ، سەنتەرێ سەرەکی یێ فەلسەفا ئەوروپی ل ئینگلتەرا بوو، ل ناڤەڕاستا چەرخێ هەژدێ ل فرەنسا و دوماهیا چەرخێ هەژدێ ژی ل ئەلمانیا بوو."

- "ئەم دشێین بێژین وەکو لڤینەکا بازنەی بوو."

- "هەلبەت. نوکە دێ بەحسێ هندەك بیرۆکەیێن هەڤپشك دناڤبەرا فەیلەسۆفێن فرەنسی یێن چەرخێ ڕەوشەنگەرییێ کەم وەك مۆنتسکیو و ڤۆلتێر و ڕۆسو و چەندین فەیلەسۆفێن دی. من هەموو د حەفت خالێن گرنگ دا کوم کرینە."

- "سوپاس ئەز ژی دزانم."

دگەل ڤێ گوتنێ، سۆفیایێ ئەو کارتا ژ لۆبنانێ بۆ هاتی کرە د دەستێ ئەلبێتوی دا. وی بێهنا خوە کوور هەلکێشا، گوت: "ئەو دشیا ڤێ زەحمەتێ بۆ خوە چێنەکەت."

پاشی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە

- "هەرچەوا بیت یەکەمین خالێ یاخیبوونە ژ دەسەلاتێ. ل سەردەمێ ڕەوشەنگەرییێ دا چەندین فەیلەسۆفێن فرەنسی خوە گەهاندە بریتانیا، چونکی ژ گەلەك لایان ڤە بریتانیا ژ وەلاتێن وان پتر یا ڤەکری بوو و ئازادیەکا بەرفرەهتر هەبوو. ل وێرێ ئەو ب زانستێ ئیمپریسیزمی یێ بریتانی داخباربوون ب تایبەت زانا نیوتن و فیزیا وی یا گەردوونی. هەردیسان فەیلەسۆف لوکی و فەلسەفەیا وی یا سیاسی کو ئەڤە ژی بۆ ئەگەر دەمێ زڤرینە وەلاتێن خوە دژی دەستهەلاتا کەڤن ڕاوەستیان و دەست ب شۆڕەشان کر. یا گرنگ بوو ئەو شیان هەلویستێ ڕەخنەگرتنێ ژ فەلسەفەیا کلاسیکی ل دەڤ خوە پەیدابکەن. بیرۆکەیا

سەرەکی ئەو بوو کو دڤێت تاکەکەس ب خوە بەرسڤا هەمموو پرسیاران بدەت یێن ژ خوە دکەت. ل ڤێرێ نەریتێن هزرا دیکارتی ژی ڕۆلێ خوە هەبوو.

- "ژبەر هندێ دیکارتی هەمموو تشت زڤڕاندنە دەستپێکێ و بەرێ بنیاتێ داناڤە."

- "بەلێ، ڤێ یاخیبوونێ دژی هەمموو شێوەیێن دەستهەلاتا کەڤن دەستپێکر، ئانکو دژی دێرێ پاشا و دەرەبەگان. پێدڤیە ل دەڤ خوە بنڤیسی کو دەزگەهێن جودا جودا ل چەرخێ هەژدێ، ل فرەنسا گەلەك بهێزتر بوون ژ ئینگلتەرا."

- " ژبەر هندێ شۆڕەشێ سەرهلدا."

- " ل سالا 1789ێ شۆڕەشێ دەستپێکر، لێ ئەڤ بیرۆکەیێن نوو بەری هینگێ ب دەمەکێ درێژ سەرهلدابوون."

- "دا دەست ب خالا دووێ بکەین کو ئەو ژی ڕاشیونالیزمە."

- "ئەز دبێژم دگەل مرنا هیومی، دوماهی ب فەلسەفەیا ڕاشیونالیزمێ ژی هات."

- "هیوم ب خوە ل سالا 1776ێ مر، ئانکو پشتی مرنا مۆنتسکیوی ب بیست سالان و دوو سالان ژی بەری ڤۆلتێری و ڕۆسویی کو هەردوو ل سالا 1778ێ مربوون. بەلێ هەرسێ ل بریتانیا ژیابوون و هایداری فەلسەفا لوکی ببوون. کو ئەو ب خوە فەیلەسۆفەکێ ڕەق و توند نەبوو، ئەگەر بیرا تە بهێت. ب دیتنا وی باوەری ئینان ب خودای و هندەك بیروباوەرێن ئەتیکی ب شێوەیەکێ زکماکی دناڤ ئەقلێ مرۆڤی دا هەنە. ئەڤە ژی ناڤەرۆکا فەلسەفا فرەنسی بوو ل چەرخێ ڕەوشەنگەریێ."

- "جارەکێ تە گوتبوو فرەنسی هەمموو دەمان ژ بریتانیان پتر د ڕاشیونالیزم بوون."

- "ئەڤ جوداهیە ڤەدگەڕیت بۆ سەردەمێ چەرخێن ناڤەڕاست. دەمێ بریتانیان بەحسێ تشتێن سروشتی دکر. فرەنسیان بەحسێ وان تشتان دکر یێن ب ئاشکرای ددیتن، ئانکو ئەو تشتێن بۆ هزر و ئەقلێ مرۆڤی د ڕۆهن و ئاشکەرا."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "هەڤدەم دگەل مرۆڤدۆستێن چەرخێ کەڤن وەکو سۆکراتی و ستۆکیان. پتریا فەیلەسۆفێن چەرخێ ڕەوشەنگەریێ باوەریەکا مۆکم ب ئەقلێ مرۆڤی هەبوو. ڤان خالان ژی وەل خەلکی کر بێژنە چەرخێ ڕەوشەنگەریێ "چەرخێ ڕاشیونالیزمێ". پشتی زانستێ نوو بنەمایێن زانستێ ئیمپریسیزمی ب شێوەیەکێ هوور و تێروتەسەل داناین، فەیلەسۆفێن

چەرخێ ڕەوشەنگەریێ ژی ب ئەرکێ خوە زانیە ڕابن ب دانانا یاسا و بنەماییێن ئەتیکی و ئاینی. ئاها ڤێ چەندێ ئەم بەرەڤ بیرۆکەیا چەرخێ ڕەوشەنگەریێ ب ڕامانا وێ یا ڕاستەقینە ڤە برین."

- "ئەڤە خالا سیێ یە. مانە هۆسایە؟

- "بەلێ، ل ڤێرێ مەرەم ژ ڕەوشەنگەریێ، ڕۆهنکرنا تەخ و چینێن مللەتێن دنیایێ یە وەك مەرجەکێ سەرەکی ژ پێخەمەت ئاڤاکرنا جڤاکەکێ باشتر. ل دووڤ هزرا وان دەردەسەری و تەپەسەری ژ ئەگەرێ نەزانینێ پەیدادبیت دەمێ باوەر ژ ئاشوپ و چیڤانۆکان دکەن. ژبەر هندێ یا پێدڤی بوو ل سەر فەیلەسۆفێن ڤێ قۆناغێ هەموو هێز و شیانێن خوە بکاربینن بۆ پەروەردەکرنا خەلکی و زارۆکان، ژبەر هندێ تشتەکێ ژ نیشکەکێ ڤە نەبوو زانستێ پەروەردەکرنێ دووبارە ل چەرخێ ڕەوشەنگەریێ دا دیار بیت."

- "هەروەکو ئەز تێگەهشتیم، دامەزراندنا قوتابخانەیان بۆ چەرخێن ناڤەڕاست ڤەدگەڕیت و زانستێ پەروەردە ژی بۆ چەرخێن ڕەوشەنگەریێ."

- "بەلێ. کارێ سەرەکی یێ چەرخێ ڕەوشەنگەریێ ژ چەرخێن دی جوداکری، دانانا ئینسکلوپیدیایەکا مەزن بوو. ئەڤەژی بەلگەیەکێ ڕۆهن و ئاشکەرایە. ئەڤ ئینسکلوپیدیایە دناڤبەرا سالێن 1751 و 1772ێ دا د 28 بەرگان دا ب هاریکاریا گشت فەیلەسۆفێن چەرخێ ڕەوشەنگیریێ دەرکەفت. وان دگوت: "د ڤێ ئینسکلوپیدیایێ دا هەموو تشت هەنە، هەر ژ دروستکرنا دەرزیکێ هەتا چێکرنا زڕیپۆشان."

- "مانە تە دڤیا بۆ من بەحسێ گەشبینییا ڕەوشەنبیری ژی بکەی."

- "بێ زەحمەت دەمێ ئەز د ئاخڤم دێ شێی وێ کارتێ دەیە لایەکی؟"

- "ببورە."

- "فەیلەسۆفێن ڤی سەردەمی دگوت، ب تنێ بەربەلاڤبوونا زانستی و بەرفرەهبوونا ئەقلی بەسە کو جڤاك و مرۆڤایەتی پێشکەفتنێن مەزن ب دەست خوە ڤە بینیت، داکو مژارا جهگرتنا چارەسەرییێن مرۆڤایەتی و ڕۆهنکری ل جهێ نەزانین و سێرەبەندیێ ب تنێ پەیوەندی ب دەمی ڤە هەبیت. هەردیسان ئەو د وێ باوەرێ دابوون کو پێشکەفتن دێ تشتەکێ باش بیت ئەگەر ل دووڤ ڕۆناهیا ئەقلێ سروشتی بیت. ب ڤی ڕەنگی دەستەواژەك دناڤ خەلکی دا بەربەلاڤبوو، ئەو ژی: زڤڕین بۆ سروشتی. لێ فەیلەسۆفێن وی سەردەمی تا

رادده‌یه‌كی سروشت ل به‌رامبه‌ری په‌یڤا ئه‌قل بكاردئینا، چونكی ئه‌قلێ مرۆڤی یێ ژ سروشتی هاتی.

جان جاك رۆسۆ ژی خوه‌دانێ ڤی دروشمی بوو: پێدڤیه بۆ سروشتی بڤه‌گه‌ڕین، چونكی سروشت یێ باشه و مرۆڤ ژی ب شێوێ خوه یێ سروشتی یێ باشه. ئانكو سروشتێ مرۆڤی یێ هۆسایه كو یێ باش بیت. هه‌روه‌سا دگوت خراپی د جڤاكی دا هه‌یه. ل دووڤ هزرا رۆسوی، هندی د شیان دابیت دڤێت ده‌رفه‌ت بۆ زارۆكی په‌یدابیت ب سروشتێ خوه یێ پاقژ و بێگونه‌ه بژیت. ئه‌م دشێین بێژین بلند راگرتنا بهایێ زارۆكی ڤه‌دگه‌ریته چه‌رخێن ره‌وشه‌نگه‌ریێ، ژبه‌ركو به‌ری هینگی زارۆك ب تنێ ئاماده‌كرنه‌ك بوو ژ بۆ قۆناغا سنێله‌ی و پێگه‌هشتنێ. ئه‌م مرۆڤین و ژیانا خوه ل سه‌ر ئه‌ردی دبورینن خو هه‌كه ئه‌م زارۆك ژی بین."

- "پێدڤیه ئه‌ز ژی هۆسا هزر بكه‌م."
- "ب دیتنا وان پێدڤی بوو ئاین ژی بۆ سروشتێ خوه بڤه‌گه‌ڕیت."
- "ئانكو چه‌وا؟"
- "پێدڤی بوو ل سه‌ر ئاینی دووباره ڕهوڕیشالێن خوه یێن ڕاشیونالیزمی ئاشكه‌را بكه‌ت، ژبه‌ر هندێ گه‌له‌ك كه‌سان خه‌بات ژ بۆ هندێ كر داكو ئه‌و تشتێ دبێژنێ "ئاینێ سروشتی" بسه‌پینن. ئه‌ڤه ژی خالا من یا شه‌شێ یه. ل ده‌مه‌كی كو هنده‌ك فه‌یله‌سۆفێن سروشتی یێن ڕاسته‌قینه باوه‌ری ب چ خوداوه‌ندان نه‌بوو و ب ئاشكرای خوه ب كه‌سێن بێباوه‌ر نیشان ددا. لێ ب هزرا پتریا فه‌یله‌سۆفێن چه‌رخێ ڕه‌وشه‌نگه‌ریێ مرۆڤ نه‌شێت بێ هه‌بوونا خودای هزرا خوه د جیهانێ دا بكه‌ت. نیۆتنی ژی هه‌مان بۆچوون هه‌بوو. ب دیتنا وی، باوه‌ری ئینان ب نه‌مریا رۆحا مرۆڤان تشته‌كه په‌یوه‌ندی ب ئه‌قلی ڤه هه‌یه نه‌ك باوه‌ریێ، هه‌لبه‌ت دیكارتی ژی هه‌مان بۆچوون هه‌بوو."
- "ئه‌ڤ چه‌نده بۆ من یا سه‌یره، ژبه‌ركو ئه‌ز یا نموونه‌كا هه‌ره به‌رچاڤ یا په‌یوه‌ندی ب باوه‌ریێ ڤه هه‌ی دبینم نه‌ك ب ئه‌قلی ڤه."
- "به‌لێ پا تو ل چه‌رخێ هه‌ژدێ دا ناژی. مه‌ره‌ما فه‌یله‌سۆفێن چه‌رخێ ڕه‌وشه‌نگه‌ریێ ئه‌و بوو دڤیا ئایینێ مه‌سیحیه‌تێ ژ تۆزێ و هه‌موو وان بیروباوه‌رێن

هەرەمەکی و رێنمایێن ئایینی یێن جهێ پەیاما حەزرەتێ مەسیحی ب درێژاهیا دیرۆکا دەستهەلاتا دێرێ گرتین، بداقوتن،

- "ل ڤێرە ئەز دگەل وانم."
- "هژمارەکا مەزن یا خەلکی باوەری ب پەرستنا خودای ب تنێ هەبوو.*"
- "ئانکو چەوا؟"
- "جۆرە تێگەهشتنەکە کو دبێژیت د سەردەمێن گەلەك کەڤن و بەری نوکە دا خودای جیهان ئافراند، لێ پاشی خوە تێدا دیار نەکر. ب ڤی رەنگی خودا وەکو "بوونەوەرەکێ بلند" هاتە نیاسین و ب تنێ ب رێکا سروشتی و یاسایان خوە بۆ خەلکی ددەتە دیارکرن، ئانکو ب رەنگەکێ سروشتی خوە نیشا مرۆڤان نادەت. بەری نوکە مە تێگەهێ "خوداوەندێ فەلسەفی" ل دەڤ ئەرستۆی ژی دیتبوو کو ب دیتنا وی خودا "ئەگەرێ سەرەکی" یان "لڤینەرێ سەرەکی" یێ پەیدابوونا گەردوونی یە."
- "نوکە مە خالەك ب تنێ مایە ئەو ژی مافێن مرۆڤی نە."
- "دبیت ژ هەموو خالێن دی گرنگتر بیت. ب شێوەیەکێ گشتی ئەم دشێین بێژین فەیلەسۆفێن فرەنسی یێن چەرخێ رەوشەنگەریێ ژ فەیلەسۆفێن ئینگلیزی د ڤەکری و چالاکتر بوون."
- "فەیلەسۆفێن فرەنسی تیورێن خوە یێن فەلسەفی دکرنە د بوارێ بجهئینانێ دا؟"
- "بەلێ، وان خەبات ژ پێخەمەت دانپێدانێ ب "مافێن سروشتی" یێن هاولاتیان دکر، یەکەم پێنگاڤێن وان ژی ل دور مافێ "ئازادیا دەربڕینێ" بوو د بوارێن ئایینی و ئەتیکی و سیاسی دا. وان دگوت پێدڤیە هەر کەسەك ب ئازادی هزر بکەت و دەربڕینێ ژ بۆچوونێن خوە بکەت. پاشی ل دژی بەندایەتییێ ژی راوەستیان و سەرەدەریەکا باشتر و مرۆڤدۆستانەتر بۆ تاوانباران داخواز دکر."
- "ئەز دبێژم یا ب زەحمەتە هەکە ئەز دگەل وان یا هەڤڕا نەبم."

* خوداپەرستی Deism کو ب عەرەبی دبێژنێ "الربوبیە" ئەوە دەمێ کەسەکی باوەری ب هەبوونا هەبیت لێ باوەری ب پەیامێن پێغەمبەران نەبیت ژبەرکو ب دیتنا وان، ب درێژاهیا دیرۆکی زەلامێن ئایینی ژ بۆ بەرژەوەندییێن خوە یێن تایبەت دەستکاری د پەیامێن پێغەمبەران دا کرینە.

- "پاشی بنەمایێ "قەدەغەکرنا پێشیلنەکرنا مافێن تاکەکەسی" ئێخستە سەر دوماهیا بانگەوازا مافێن مرۆڤی و هاولاتیان ئەوا ل سالا 1789ێ ژ لایێ کومەلا نیشتیمانی یا فرەنسی شەرعیەت دەنگدان ل سەر کری. و پشتی هینگێ پشکەکا مەزن یا دەستورێ نەرویجێ ل سالا 1814ێ ژ ڤێ بانگەوازێ هاتە وەرگرتن.

- "لێ ل سەردەمێ مە یێ ئەڤرۆ، هێشتا هندەك خەلك یێ نەچارە خەباتێ ژ پێخەمەت ب دەستڤە ئینانا مافێن خوە بکەن."

- "بەلێ ب لێبۆرین ڤە هۆسایە. لێ فەیلەسوٚفێن چەرخێ رەوشەنگەرییێ دڤیا وان مافێن رەوا یێن هەر تاکە کەسەکی جێگیر بکەن یێن کو ل دەمێ ژ دایك دبیت هەنە. ئەم دبێژینە ڤان مافان "مافێن سروشتی" یێن تاکەکەسان کو گەلەك جاران دژی یاسایێن بەربەلاڤ یێن وەلاتەکی دراوەستیت. ژبەر هندێ گەلەك کەس و تەخێن جڤاکی خەباتێ ژ بۆ بدەستڤەئینانا ڤان مافان دکەت ژ پێخەمەت ئازادی و سەربەخوبوونەکا زێدەتر."

- "ئەرێ پا مافێن ژنێ؟"

- "شۆرەشا 1789ێ بوو ئەگەرێ بدەستڤەئینانا کۆمەکا مافان کو تەڤ هاولاتی ب خوە ڤە گرتبوون، راستە ل پلا یەکێ گەلەك کەسان هزردکر ئەڤ مافە بۆ "زەلام"ی ب تنێ نە، لێ دگەل هندێ هەر یەکسەر پشتی هەلکرنا چریسکا شۆرەشا فرەنسی یەکەمین خەباتا ژنان دهێتە دیتن."

- "بەلێ ئەڤ چەندە ل دەمەکێ زوو پەیدانەبوو."

- "ل سالا 1787ێ فەیلەسوٚف "کوندۆرسی" گۆتارەك دەربارەی مافێن ژنان بەلاڤکر. ل دووڤ دیتنا ، ژن ژی وەکو زەلامی خوەدان هەموو "مافێن سروشتی"یە. ژنان ب خوە ژی ل شۆرەشا 1789ێ خەباتەکا چالاك دژی رژێمێن دەرەبەگایەتی یێن کەڤن دکر. بۆ نموونە ئەو ل پێشیا خونیشاندەران بوون وەل پاشای کر کۆچکا ڤێرسای بجە بهێلیت. ل پاریسێ ژی کۆمەلەیێن ژنان هاتنە دامەزراندن. ژ بلی ڤێ ژی وەکو زەلامان داخوازا مافێن سیاسی ژی دکر، داخوازا چاکسازیان دکر ب تایبەت یێن گرێدای ب شووکرنێ و رەوشا جڤاکی یا ژنێ."

- "پاشی وان ئەو ماف ب دەست ڤە ئینان؟"

- "نەخێر. هەروەکو جارێن دی، ل دەمێ سەرهلدانا شۆڕەشێ بەحسێ مافێن ژنێ دهێته کرن و پاشی هەموو تشت د ڕژێمێن نوو دا بێدەنگ دبن و جارەکا دی هەژموونا زەلامی ل سەر جڤاکی دهێته سەپاندن."

- " ئەڤ چەندە هەموو گاڤان پەیدادبیت."

- "یەك ژ وان ژنێن خەباتکەر د شۆڕەشا فرەنسی دا ب شێوەیەکێ بەردەوام خەبات و تێکۆشین بۆ مافێن ژنێ دکر، ناڤێ وێ" ئۆلیمپ دو گۆج" بوو. ل سالا 1791ێ ئانکو ب دوو سالان پشتی سەهلدانا شۆڕەشێ، بانگەوازەك دەربارەی مافێن ژنێ بەلاڤ کر، چونکی ڤان مافان چ جهێن دەستنیشانکری د ئەو بانگەوازا مافێن مرۆڤی و هاولاتیان نەبوون."

- " و پاشی؟"

- "ل سالا 1793ێ هاتە سێدارەدان و پشتی هینگێ ژن ژ هەموو کارێن سیاسی هاتە دوورئێخستن."

- "ئەڤە نە یا باش بوو!"

- "پێدڤی بوو ژنان خوە ل چەرخێ نوزدێ گرتبا هەتا جارەکا دی ل ئەورۆپا هەموویێ خەباتا ژنان دەستپێکری. ژ وی دەمی هێدی هێدی خەباتا وان ئارمانج ب دەست خوە ڤە ئینان. بۆ نموونە، ل نەرویج ل سالا 1913ێ ژنان مافێ دەنگدانێ ب دەست ڤە ئینا، لێ دەمێ ئەم تەماشەی ڕەوشا ژنان ل هندەك وەلاتێن دی یێن جیهانێ دکەین، دێ بۆ مە دیار بیت کو هێشتا خەباتەکا درێژ ل بەر سینگێ ژنان مایە."

- "د ڤی بواری دا، ئەز دبێژم بەلێ ڕاستە."

ئەلبێرتۆ بۆ دەمەکی تەماشەی دەریاچێ دکر و پاشی گوت" ئەڤە ئەو تشت بوون یێن من دڤیای تو ل دور چەرخێن ڕەوشەنگەریێ بزانی."

- "بۆچی ئەڤ تشتە ب تنێ بوون؟"

- "ئەز هەست پێ دکەم کو ژ ڤێ چەندێ زێدەتر چ تشتەکێ دی هێژای بەحسکرنێ نینە بۆ تە بکەم."

ژ نیشکەکێ ڤە تشتەك دناڤ ئاڤێ دا ڕوویدا دەمێ ئەلبێتوی دوماهیك ئاخفتنێن خوە دگوتین، د نیڤەکا ئاڤێ بلقێن بای بسەرکەفتن و پاشی لەشەکێ کرێت و ڕەش ب سەر ئاڤێ کەفت.

ئینا سۆفیایێ کرە هەوار: "مارێ ئاڤی یە!"

مارێ ئاڤی چەندین جاران ب سەرئاڤ دکەفت و بنئاڤ دکەفت هەتا ل دوماهیێ دووبارە چوویە د کووراتیا ئاڤێ دا و ڕوویێ ئاڤێ وەکو بەرێ ئارام بوویە ڤە.

ئەلبێرتۆی ب ئاورینەکێ گوتە سۆفیایێ: "دا بزڤڕین."

پشتی دەمەکێ کێم هەردوو چوونە ناڤ کۆلکی ڤە. سۆفیا ل بەرامبەر هەردوو کەڤالێن بێرکێلی و بجێرکلی ڕاوەستیا و ئاماژە کرە وێنێ دووێ و گوت: "ئەز دبێژم هێلد ل جهەکێ دناڤ ڤی کەڤالی دا دژیت."

دناڤبەرا هەردوو کەڤاڵان دا، پارچە ڤۆماشەك هاتبوو هەلاویستن ل سەر نڤیسابوو: **ئازادی، یەکسانی، برایەتی**

- "تە ئەڤە هەلاویستیە؟"

ئەلبێرتۆی ب بەرسڤا نەخێر سەرێ خوە هەژاند.

پاشی چاڤێ سۆفیایێ ب نامەکێ کەفت کو دناڤ کونا کۆچکا ئاگری کەفتە خوارێ و ل سەر نڤیسابوو: "بۆ سۆفیا و هێلدێ". نە یا گرنگ بوو سۆفیا پرسیار بکەت کا ژ دەڤ کێ هاتیە، لێ دەمێ ناڤێ خوە ل سەر دیتی، سوپڕایزەك بۆ چێبوو.

سۆفیایێ نامە ڤەکر و ب دەنگەکێ بلند خواند.

خوشتڤیێن من یێن بچووك:

*پێدڤی بوو مامۆستایێ فەلسەفێ ئاماژە ب هندێ کربایە کو دەستورێ وەلاتێ نەتەوەیێن یەکگرتی مفا ژ گەلەك وان بنەما و بیروباوەران وەرگرتیە یێن فەیلەسۆفێن چەرخێ ڕەوشەنگەریێ ل فرەنسا دانایین. ل وی دەمی خەلکێ فرەنسی ب دەنگەکێ بلند دروشمێ "ئازادی، یەکسانی، برایەتی" بلند دکر، لێ پێدڤیە ئەڤرۆکە ژی ئەڤ پەیڤە ل جیهانێ هەموویێ بهێنە گوتن.*

*هندی چ سەردەمێن بەری نوکە مرۆڤایەتیێ پێدڤی ب خێزانەکا مەزن و یەکگرتی نینە. ئەرێ کیژ جیهان وەك میرات بۆ زارۆك و نەڤیێن مە دێ مینیت؟*

دایکا هێلدێ گازی کرێ و گوتێ پشتی دەھ خۆلەکێن دی دێ بەرنامێ دیریك دەستپێکەت. وێ پیتزایەك ژی کربوو د فڕنێ دا. هێلد پشتی خواندنێ گەلەك ماندی ببوو، ژبەرکو ئەڤە ژ دەمژمێر شەشی سپێدێ وەرە هشیار بووی.

هێلدێ بڕیار دا پشتی هنگێ ئاھەنگا جەژنا بوونا خوە دگەل دایکا خوە ببورینیت. لێ بەری هەر تشتەکی دڤێت تەماشەی ئینسایکلوپیدیا خوە بکەت و بابەتەکی دەستنیشان بکەت.

*گۆج... نەخێر . دو گۆج؟ هەر نەخێر.*
*ئۆلیمپ دو گۆج؟ ب هیچ ڕەنگەکی نە*

وێ ئینسایکپلوپیدیا مەزن خو پەیڤەکا ب تنێ دەربارەی وان ژنان بەحس نەکریە یێن سەرا هزروبیرێن خوە یێن سیاسی و مافێن ژنان هاتینە سێدارەدان. ما ئەڤە نە شەرمزاریە؟

هێلد چوو خوارێ داکو ئینسایکلوپیدیایەکا مەزنتر بینیت.

**وێ گوته دایکا خوه "ئەز یا ل دووڤ بابەتەکی دگەڕم و پاشی پشکا پیتا "گ" هەلگرت و بەرەڤ ژوورا خوه ڤە هات."**

***گۆج... و ل دوماهیێ من دیت.***

**- "گۆج ماریا ئۆلیمپ "1748-1793" نڤیسەرەکا فرەنسی بوو، ل سەردەمێ شۆرەشا فرەنسی ڕۆلەکێ گرنگ هەبوو و چەندین بابەت دەربارەی مژارێن جڤاکی و چەندین شانۆگەری بەلاڤکرینە، یەك بوو ژ وان کەسێن دیار یێن د شۆرەشا فرەنسی دا خەبات ژ بو مافێن مروڤان کری. ل سالا 1791ێ بانگەوازا مافێن ژنێ بەلاڤکریە. ل سالا 1793ێ هاتیە سێدارەدان ژبەرکو بەرگری ژ لویسێ شازدێ دکر و ڕەخنە ل ڕۆبیسپێری دکر. (ل. لاکۆر. ژێدەرێن فیمینیزمێن هەڤچەرخ 1900)."**

# كانت

*....ئەسمانەکێ پڕی ستێرێن گەش ل هنداڤی سەرێ من و یاسایا*

*ئەتیکی د ناخێ من دا...*

ل نیڤا شەڤێ بوو مایجەر ئەلبێرت کناگی ب هەلکەفتا پیرۆزباهیکرنا جەژنا بوونا کچا خوە هێلدێ، پەیوەندی ب مالێ کر. دایکا هێلدێ بەرسڤا تێلەفۆنێ دا.

- " هێلد، تێلەفۆنەك بۆ تە یا هاتی."
- "ئەلو؟"
- "ئەز بابێ تەمە."
- "ئەرێ ما تو یێ دینی؟ ئەڤە نیڤا شەڤێ یە."
- "ب تنێ من دڤیا جەژنا بوونا تە پیرۆز بکەم."
- "لێ ب درێژیا ڕۆژێ تە ئەڤ چەندە نەکر."
- "... من دڤیا خوە بگرم هەتا دنیا دبیتە شەڤ."
- "بۆچی؟"
- "دیاریا من گەهشتە تە؟"
- "ئاهـ... بەلێ، بەلێ گەلەك سوپاس."
- "یا ب دلێ تە بوو؟"

- "هزرەکا گەلەك جوان بوو، هند یا بالکێش بوو، ب درێژاهیا ڕۆژێ ئەز نەشیام خوارنێ بخوم."

- "بەلێ پێدڤیە هەر خوارنێ بخوی."

- "نێ من دڤیا بزانم کا پشتی هنگی دێ چ ڕوودەت."

- "بێژە من تو گەهشتیە کیڤە؟"

- "ئەو نوکە یێن چووینە د کۆلکێ مایچەری ڤە، چونکی ژبەر وی مارێ ئاڤی تە ترانە پێ دکرن."

- "ئاها... چەرخێ ڕەوشەنگەرییێ."

- "و ئۆلیمپ دو گوج ژی."

- "باشە، ئەز گەلەك شاش نەبووم؟"

- "شاش نەبووی؟ شاشیا چ؟"

- " چنە. جارەکا دی ژی دێ پیرۆزباهییێ ل تە کەم، لێ ڤێ جارێ ب مۆزیك ڤە."

- "من دڤێت بەری بنڤم پیچەکا دی ژی ل سەر جهێن خوە بخوینم."

- "ئەو تشتێ تو دخوینی تو تێدگەهی؟"

- " ئەو تشتەکێ د ڕۆژەکا ب تنێ دا ژ خواندنا ڤێ پەڕتووکێ ئەز فێربوویم، د ژیانا خوە هەموویێ دا فێرنەبوویمە! ئەز هێشتا باوەرناکەم کو ب تنێ بیست و چوار دەمژمێر یێن بورین دەمێ ئەو چەندە خواندی کو سۆفیا ژڤڕیە مال و یەکەم نامە د سندوڤا پۆستەی دا دیتی."

- "پتریا جاران مە پێدڤی ب چەند تشتێن کێم هەیە."

- "بەلێ پا دلێ من پێ ب وێ ڤە"

- "بۆ دایکا تە؟"

- "نەخێر، بۆ سۆفیا ئاموندسنێ."

- "ئاها."

- "هەی ژارێ ئەو چ جاران نزانیت ئەو ل کیڤە یە؟"

- "بەلێ پا ئەو ب تنێ... مەرەما من..."

- "ئەو ب تنێ کەسایەتیەکە تە ژ ئاشوپا خوە دروستکری؟"

- **"بەلێ، تا ڕادەیەکی."**
- **"بەلێ پا ئەز د وێ باوەرێ دا مە کو سۆفیا و ئەلبێرتۆ ژ ڕاست ل جهەکی دژین."**
- **"دەمێ ئەز دزڤرم دێ بەحسێ ڤێ چەندێ کەین."**
- **"باشە."**
- **"نوکە ڕۆژا تە ب خێر."**
- **"تو چ دبێژی؟"**
- **"مەرەما من، شەڤ تە خوش."**
- **"شەڤ باشتر."**

**دەمێ هێلد چوویە دناڤ جهێن خوە دا، ژ دەرڤە ئەسمان هند یێ ڕۆهن بوو، ئەو ب سانەهی دشیا باخچەی و داروباران ببینیت. د ڤی وەرزێ سالێ دا چ جاران ب تەمامی ڕۆژ ئاڤا نابیت و دنیا ب یەکجاری تاری نابیت.**

**هێلدێ هزرێن خوە د وێنەیێ خوە دا ل سەر کەڤالێ هەلاویستی ل سەر یەك ژ دیوارێن کۆلکێ دناڤ دارستانێ دا دکر. تو بێژی ئەو بشێت دناڤ چوارچۆڤەیێ وی کەڤالێ دا دەرکەڤیت و تەماشەی جیهانا ژ دەرڤە بکەت؟"**

**بەری بنڤیت، دیسان جارەکا دی دەست ب خواندنێ کر.**

سۆفیایێ نامەیا بابێ هێلدێ دانا دناڤ کۆچکێ ئاگری دا.

ئەلبێرتۆ: "دبیت ئەو تشتێ بەحسێ نەتەوەیێن یەکگرتی بکەت هند یێ تەمسار نەبیت، لێ من نەڤێت ئەو مایێ خوە د کارێ من بکەت کا چەوا تشتان پێ شرۆڤە بکەم."

- "هند گرنگییێ پێ نەدە و بۆ خوە نەکە خەم."
- "باشە، ئێدی ئەم دێ دیاردەیێن سەیر ژ بیرا خوە بەین، بۆ نموونە وەکو مارێ ئاڤی، وەرە دا ل بەر پەنجەرێ بڕوونین، من دڤێت بۆ تە بەحسی "کانت"ی بکەم."

بەرێ سوفیایێ ب وان بەرچاڤکان کەفت یێن ل سەر مێزەیا بچووك یا دناڤبەرا هەردوو کورسیکان دا، ئاوێنەیێن وێ د سۆر بوون... ئەرێ تو بێژی بەرچاڤکەکا هەتاڤێ تا ڤی رادەی یا تارى هەبیت؟"

- "چ نەمایە دێ دەمژمێر بیتە دوو. پێدڤیە ل دەمژمێر پێنج ل مال بم، بێگومان نوکە دایکا من ب هەلکەفتا جەژنا بوونا من، تشتەك بۆ من ئامادەکریە."

- "ئانکو مە سێ دەمژمێر هەنە."

- "فەرموو گوهێ من ییّ ل تە."

- "ئیمانوێل کانت ل سالا 1724ێ ل باژێرێ کینگسبێرگ "کالینگرادا ئەڤرۆکە" ل رۆژهەلاتا برۆسیا ژ دایکبوویە، بابێ وی کارێ چێکرنا زینێن هەسپان* دکر. ژیانا خوە ل ڤی باژێری دەربازکریە هەتا ژیێ هەشتێ سالیێ وەغەرکری ل وێرێ مابوو. کانت دناڤ هندەك کاودانێن ئاینی یێن گران و توندرەو دا مەزن ببوو، ژبەر هندی ئەڤێ باوەریێ فاکتەرەکێ هەرە گرنگ د هەموو فەلسەفەیا وی دا پەیداکر، وی ژی وەکو بێرکلی هزردکر یا پێدڤیە بنەمایێن ئاینێ مەسیحیەتێ بهێنە قورتالکرن."

- "بێرکلی. ئەز تێگەهشتم، سوپاس."

- "دناڤبەرا وان هەموو فەیلەسۆفێن مە بەحسکرین، کانت یەکەمین فەیلەسۆف بوو وەك پرۆفیسۆر ل زانکۆییێ هاتیە دامەزراندن، ژبەر هندێ ئەو ببوو فەیلەسۆفەکێ خوەدان شیان."

- " فەیلەسۆفەکێ خوەدان شیان؟"

- "ل سەردەمێ ئەڤرۆ، زاراڤێ "فەیلەسۆف" ب دوو رامانێن جودا دهێتە بکارئینان. فەیلەسۆف ئەو کەسە یێ ل دووڤ بەرسڤێن خوە یێن تایبەت ل دور پرسیارێن فەلسەفی یێن وی ب خوە کرین دگەرییێت. هەردیسان دبیت فەیلەسۆف ئەو کەسێ تایبەتمەند د دیرۆکا فەلسەفێ دا بیت ، ئانکو مەرج نینە خوەدان فەلسەفەیا خوە یا تایبەت بیت."

- "کانت ژی یەك بوو ژ ڤان جۆرە فەیلەسۆفان بوو؟"

---

* السرج Saddle

- "نەخێر، كانت ژ هەردوو جۆران بوو. ئەگەر ب تنێ ئەو پرۆفیسۆرەكێ زیرەك با، ئانكو ب تنێ د هزرا فەیلەسۆفێن دی دا یێ تایبەتمەند بایە. ئەڤرۆكە وی جهەكێ مەزن دناڤ دیرۆكا فەلسەفێ دا نەدبوو.

لێ ئەڤ چەندە نابیتە ڕێگر كو وی ب باشی و كووراتی پێزانین و شارەزاییەكا بەرفرەهـ ل دور فەلسەفا بەری خوە هەبیت. وی شارەزای هەبوو ل دور هزرا فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی وەك دیكارت و سپینۆزای هەبوو. دیسان فەیلەسۆفێن ئیمپریسیزمی وەك لوك و بێركلی و هیومی."

- "من گوتبوو تە ئێدی بەس بەحسێ بێركلی بكە."

- "بیرا تە دهێت كو ب بۆچوونا فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی، ئەقلێ مە بنەمایێ هەموو زانینان دناڤ خوە دا هەلگرتیە، لێ فەیلەسۆفێن ئیمپریسیزمی دگوت نەخێر هەستێن مە دەلیڤێ ددەنە مە تشتێن دەوروبەرێن خوە بزانین. هەردیسان هیومی ب ئاشكەرای ئەو سنوورێن دەرئەنجامان دیاركربوون یێن هەستێن مە دشێت بگەهیتێ."

- " باشە كانت دگەل كێ یێ هەڤڕا بوو؟"

- " كانت د وێ باوەرێ دابوو كو هەردوو د ڕاست و د هەماندەم دا د شاش بوون. ژبەركو مژار مژارا زانینێ یە: ئانكو كیژ زانینا جیهانێ دێ ب دەست مە كەڤیت. ئەڤە ئەو پرۆژەیێ هەڤپشك بوو یێ هەموو فەلەسۆفێن پشتی دیكارتی ل سەر كاردكری. لێ نوكە مژار، مژارا زانینا وێ چەندێ یە ئەرێ گەردوون یێ ب وی ڕەنگی یە ئەڤێ ئەم ب ڕێكا هەستێن خوە ئەم هەست پێدكەین، یان ب وی ڕەنگی یە یێ ئەم ب ڕێكا ب ئەقلی هزر تێدا دكەین؟

- "باشە بۆچوونا كانتی چبوو؟"

- "ب بۆچوونا وی، هەست و ئەقلێ مە ڕۆلەكێ گرنگ هەیە. لێ ئاریشە ئەوە كو فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی زێدەڕویی د بۆچوونا خوە دا كریە و ئیمپریسیزمان ژی ب تنێ گرنگی ب سەربۆرێن هەستان دایە."

- "تو نەشێی نموونەیەكا بەرچاڤ بۆ من بینی؟"

- "کانتی بیرۆکەیا هیومی و ئیمپریسیزمان پەسەند کر کو ئەزمۆنێن هەستێن مە بنەمایێ هەمور زانیاریانە. لێ وی تشتەکێ دی ل سەر زێدەکر ئەو ژی ئەقلێ مە ب تنێ مەرجێن پێدڤیی هەنە ژ بۆ شرۆڤەکرنا چەوانیا تێگەهشتنا جیهانا دەوروبەری مە."

- "ئەڤە بوو نموونەیا تە؟

- "یا باشترە تاقیکرنەکێ بکەین. وێ بەرچاڤکا ل سەر مێزێ بکە بەر چاڤێن خوە."

سۆفیایێ بەرچاڤك کرە بەر چاڤێن خوە، هەمور تشتێن ل دورماندوری وێ سۆر خویا کرن. ڕەنگێن ڤەبی هەمور بوونە پیڤازی یێ تاڕی و سۆر."

- "تو چ دبینی؟"

- "ئەز هەمور تشتێن بەری نوکە دبینم، لێ ب ڕەنگێ سۆر."

- "ژبەرکو بەرچاڤکان بۆ تە دەستنیشانکر کا چەوا دێ جیهانێ بینی. ئانکو هەر تشتەکێ تو ل دەروبەرێن خوە دبینی ژ جیهانا ژ دەرڤە دهێن. لێ چەوا ئەم دبینین؟ مژارەکە پەیوەندی ب بەرچاڤکێ ڤە هەیە. ژبەر هندێ تو نەشێی بێژی جیهان یا سۆرە چونکی ب تنێ تو ب وی ڕەنگی دبینی."

- "هەلبەت، نەخێر."

- "ئەگەر نوکە پیاسەیەکێ بۆ ناڤ دارستانێ بکەی یان بزڤڕیە مالێ، دێ هەمور وان تشتان وەکو جارێن بەری نوکە بینی. لێ ب تنێ ڕەنگێ وان دێ یێ سۆر بیت."

- "بەلێ، ئەو ژی هەکە ئەز بەرچاڤکان چ چاڤێن خوە نەکەم."

- "باشە. ئاها ب هەمان ڕێك، کانت د وێ باوەرێ دا بوو کو ئەقلێ مە شیان هەنە هەمور سەربۆرێن مە یێن هەستان دەستنیشان بکەت."

- "ئەرێ ئەو چ شیانن؟"

- "ئەو تشتێن ئەم هەست پێدکەین خو چ بن، ل بەری هەر تشتەکی وەکو دیاردەکا دەمی و جهی تێدگەهین. کانتی دگوتە دەمی و جهی، "شێوەیێن دەستپێکێ" یێن هەست و تێگەهشتنا مرۆڤی. ئانکو ئەڤ شێوەیە بەری سەربۆرێن مە دهێن. کەواتە بەری هێنگێ ئەم دزانین کا هەر سەربۆرەك ل کیژ دەمی و جهی دێ ڕوودەت، چونکی ئەم نەشێین بەرچاڤکێن ئەقلی بێخین."

- "ئەو د وێ باوەرێ دا بوو دیتنا تشتان ل دووڤ دەمی و جهی، تشەکێ زکماکی یە؟"

- "بەلێ، تا ڕادەیەکی. لێ ئەو تشتێن ئەم دبینین ل سەر هندێ دمینیت کا ئەم ل هندێ دژین یان ل گرینلاندێ. لێ هەر جهەکێ ئەم لێ بژین جیهان وەکو پرۆسەیەکا دەمی و جهی دهێته دیتن. ئانکو ئەم دشێین پێشبینیا ڤێ چەندێ بکەین."

- "لێ ئەرێ دەم و جه ئەو تشت نینن یێن ژ جیهانا مە یا دەرڤە دا هەین؟"

- "نەخێر، کانت یێ ڕژد بوو ل سەر ڤێ خالێ: دەم و جه یێن د پێکهاتا مرۆڤی دا هەین. دەم و جه دوو پێکهاتەیێن مرۆڤی نە، نەك دوو ساخلەتێن جیهانی."

- "ئەڤە شێوازەکێ نوو و جودا یێ دیتنا تشتانە."

- " ئاگەهیا مرۆڤی نە وەکو لاپەڕەکێ سپی یە کو ڕەنگڤەدانێن هەستێن مە ب شێوەیەکێ نەرێنی ل سەر بهێنە چاپکرن، بەلکو بەروڤاژی، هەر ل دەستپێکێ ب ئەرێنی و چالاکانە کار دکەت و پشکداریێ د تێگەهشتنا مە بۆ جیهانێ دا دکەت. ئەم دشێین دگەل پرکرنا پەرداغەکێ ئاڤێ جوداهیێ بکەین، ئاڤ ل دووڤ شێوێ پەرداغی خوە دگونجینیت. ب هەمان شێوە ڕەنگڤەدانا هەستێن مە ل دووڤ دوو شێوەیێن هەلسەنگاندن و تێگەهشتنا مە خوە دگونجینن."

- "نوکە ئەز ئاخفتنا تە تێگەهشتم کو هەر یەك ژ فەیلەسوڤێن ڕاشیونالیزم و ئیمپریسیزم تا ڕادەیەکی د ڕاست بوون! ڕاشیونالیزمان گرنگیا هەستان ژبیرکربوو هەروەکو کا چەوا ئیمپریسیزمان گرنگیا ئەقلی ژبیرکربوو."

- "کانتی دووپات دکر ئەگەر ئاگەهی خوە دگەل تشتان نەگونجینیت، هۆسا تشت ژێ دێ ژ هوشێ دوور کەڤن و خوە دگەل ناگۆنجینن. وی دگوتە ڤێ خالێ "شۆڕەشا کۆپرنیکی" د بیاڤێ مەعریفی دا. ل ڤێرێ وی دڤیا بێژیتە مە کو ڕێکا خوە یا هزرکرنێ ب ڕێکەکا نوو بگوهۆڕین. هەروەکو کا چەوا کۆپرنکۆسی ل سەردەمێ خوە سەلماندی ئەرد ل دور ڕۆژێ دزڤڕیت نەك بەروڤاژی. دەربارەی یاسایا ئەگەرێ ڕوودانا تشتان ژی ل دەڤ کانتی بەشەك بوو ژ ئەقلێ مرۆڤی، ئەو یاسایا کو هیومی دگوت ئەم نەشێین بێ وێ ل دووڤ ڕاستیا جیهانێ بگەرین."

- "پتر ڕۆهن بکە؟"

- "ل بیرا تە یە دەمێ هیومی دگوت، نەریت وەل مە دکەن، مە پەیوەندیەك دگەل دیاردەیێن سروشتی هەبیت. ژبەرکو ل دووڤ هزرا هیومی ئەم نەشێین هەست پێبکەین

تەپا بلیاردێ یا ڕەشە، ئەگەرێ لڤینا وێ، تەپا سپی یە. ئانکو ئەم نەشێین بسەلمینین تەپا سپی هەردەم تەپا ڕەش دلڤلڤینیت. بەلێ ئەو تشتێن ل دەڤ هیومی ئەم نەشێین بسەلمینین، کانت وان تشتان دکەتە ساخلەتێن مرۆڤی. یاسایا ئەگەری ژی دێ مینیت یا ڕەها.

- "ئەز پشتا وێ چەندێ مە کو یاسایا ئەگەری دناڤ هەر تشتەکی دا هەیە، پتر ژ وێ یا د ناخێ مرۆڤی دا هەی."

- "کانتی چ گومان ل سەر هندێ نەبوو کو یاساییێن ئەگەری د سروشتی دا هەنە لێ د مرۆڤی دا نینن. تا ڕاددەیەکێ دگەل بۆچوونا هیومی یێ هەڤڕا بوو دەمێ دگوت، ئەم نەشێین بزانین کو جیهان د ناخێ خوە دا ژ چ پێکدهێت. ب تنێ ئەم دشێین وێ بزانین کو جیهان ل دەڤ من چیە. یان کا ل دەڤ مە وەك مرۆڤان کا چیە. هەردوو تێگەهێن Das ding an sich و Das ding für mich جوداهیا خالێن سەرەکی یێن د فەلسەفەیا کانتی دا دیار دکەن."

- "تو دزانی کو ئەز زمانێ ئەلمانی نزانم."

- "کانتی جوداهیەکا گرنگ دناڤبەرا "هەر تشتەکێ ب خوە" و "وی تشتی ل دەڤ مرۆڤی" دیارکر. ئەگەر ئەم چ پێزانینان ل سەر هەر تشتەکی ب خوە نەزانین، ئەم نەشێین بێژین کا پشتی سەر سەربۆرەکێ دێ چەوا جیهانێ بینین."

- "تو بێژی ئەم بشێین؟"

- "بەری سپێدێ ژ مال بدەرکەڤی، تو دزانی کو ئەو کارێن تو دێ ئەنجام دەی دناڤ دەم و جهەکی دا هاتینە دانان، خو هەکە تە چ بیرۆکە ل سەر هندێ نەبن کا ل وێ ڕۆژێ هەموویێ دێ چ بینی یان هەست ب چ کەی. لێ یاسایا ئەگەرێ ڕوودانا تشتان، تو دزانی بەشەکێ ژیریا تە پێکدئینیت."

- "ئانکو مەرەما تە ئەوە د شیان دابوو ئەم ب شێوازەکێ جوداتر هاتباینە ئافراندن؟"

- "هەلبەت، چێدبوو مە سیستەمەکێ دی یێ هەستکرنێ یێ جودا هەبایە، ل وی دەمی دا شێین سەربۆرێن خوە دگەل جهی و دەمی گوهۆڕین. هەردیسان ل وی دەمی ئەم دشیاین گرنگی ب ئەگەر و ئەنجامێن ڕوودانێن جیهانا دەوروبەری خوە ژی نەدەین."

- "تە چ نموونە نینن."

- " هزر بکه پشیکەك یا ل هۆلێ نڤستیه و دەملدەست تەپەك کەفتە ئەردی. ل وی دەمی دێ پشیك چ کەت؟"

- "ئەڤە یا ب سانەهی یە. پشیك یەکسەر دێ ل دووڤ تەپێ کەتە غار."

- "باشە، نوکە هزر بکە کو تو ل شوونا پشیکێ ل هۆلێ یا نڤستی و تەپەك کەفتە سەر ئەردی. تو ژی دێ یەکسەر ل دووڤ تەپێ کەیە غار؟"

- " ل دەستپێکێ دێ ل دور خوە زڤرم داکو بزانم کا تەپە ژ کیڤە هاتیە؟"

- "ڕاستە، چونکی تو مرۆڤی و تە دڤێت ئەگەرێ هەموو ڕوودانان بزانی. ئانکو یاساییێن ئەگەری بەشەکن ژ پێکهاتا مرۆڤی."

- "ژ ڕاست؟"

- "هیومی دگوت نە ئەم دشێین هەست ب یاساییێن سروشتی بکەین و نە ئەم دشێین بسەلمینین، لێ کانتی باوەری ب ڤێ چەندێ نەبوو. ل دەڤ وی ڤان یاسایان هەبوونا خوە یا هەی، ژبەرکو شیانێن مە ل سەر زانینێ، ئەون یێن زانینێ ڕێکدئێخن نەك تشتێن دی یێن دەوروبەر."

- "بەلێ پا ئەگەر زارۆکەك ژی ل جهێ من بیت دێ هۆسا ل دور خوە زڤڕیت دا بزانیت کا تەپە ژ کیڤە هاتیە."

- "دبیت وەنەکەت، لێ کانت دبێژیت هێشتا ئەقلێ زارۆکی هند گەشەنەکریە هەتا هەست ب ڤێ چەندێ بکەت و هێشتا چ سەربۆر ژ ژیانێ نەوەرگرتینە. ڤێجا دێ چەوا ی ل سەر ئەقلەکێ ڤالا ئاخڤین کو هێشتا چ تشت تێدا نەهاتینە چاندن؟"

- "نەخێر، ئەڤ چەندە نە یا بەرئاقلە."

- "نوکە دێ کورت کەین: ژلایەکی ڤە، مە هندەك توخمێن دەرەکی هەنە کو بەری ئەم تاقی بکەین، ئەم نزانین ئەو چ توخمن، ئەم دبێژینێ "کەرەستەیێ زانینێ". ژ لایەکێ دی ڤە، مە تایبەتمەندییێن ئەقلێ مرۆڤی هەنە وەك پێشبینیکرنا هەموو ڕوودانان د چوارچۆڤێ دەم و جهی دا، یان دانانا وان دناڤ چوارچۆڤەیێ پەیوەندیا ئەگەران دا، ئەم دبێژینە ڤێ چەندێ "شێوەیێ زانینێ."

ئەلبێرتۆ بۆ دەمەکی بێدەنگ ما، پاشی دگەل سۆفیایێ د پەنجەرێ ڕا تەماشەی ژ دەرڤە کر. دناڤبەرەکێ دا چاڤێ سۆفیایێ ب کچەکێ کەفت کو دناڤ دارستانێ ل لایێ دی دەریاچێ بوو.

سۆفیایێ کرە هەوار" "بەرێ خوە بدێ، ئەڤە کی یە؟"

- "ڕاستی ئەز ژی نزانم کی یە."

پشتی چەند چرکەیێن کێم ئەو کچکە بەرزە بوو. سۆفیایێ تیبینیا هندێ کر کو دەرسۆکەکا سۆر ل سەرێ وێ کچێ بوو.

- "هەرچەوا بیت دا نەهێلین ئەڤ تشتە مە مژویل کەن."

- "باشە. پا بەردەوامیێ بدێ."

- "کانتی سنۆرەکێ دەستنیشانکری بۆ زانینا مرۆڤی ددانا. ئەم دشێین بێژین "بەرچاڤکێن ئەقلی" باشترین دەربڕینە بۆ ڤان جۆرە سنووران."

- "ئانکو چەوا؟"

- "ل بیرا تە یە فەیلەسۆفێن بەری کانتی، پرسیارێن فەلسەفی یێن مەزن ژ خوە دکرن، بۆ نموونە پرسیار دکر ئەرێ ڕۆحا مرۆڤی یا نەمرە یان نە؟ ئەرێ خودا هەیە؟ ئەرێ سروشت ژ چەند بەشێن بچووك پێکدهێت؟ ئەرێ گەردوونی دوماهیك هەیە یان نە؟ .... هتد."

- "بەلێ."

- "بەلێ پا کانت د وێ باوەرێ دا بوو کو مرۆڤ نەشێت ب دروستاهی بەرسڤا ڤان پرسیاران بزانیت، ڤێرێ مەرەما وی ئەو نەبوو ڤان پرسیاران ڕەت بکەت. چونکی ئەگەر کانتی ئەڤ جۆرە پرسیارە ڕەتکربان، وەك فەیلەسۆفەکێ ڕاستەقینە نەدهاتە ل قەلەمدان."

- "پا چ دکر؟"

- "بێهنا خوە فرەهـ بکە... کانتی هزر دکر دەمێ ئەم بەرسڤا ڤان پرسیاران ددەین، ئەقل ژ دەرڤەی بازنا خوە یا زانینێ دا کار دکەت. لێ د هەمان دەم دا پێدڤیەکا بناغەی د سروشتێ مرۆڤی دا هەیە، یان د ئەقلێ مرۆڤی دا، ڕێکێ ژ بۆ ئازراندنا ڤان پرسیاران خوش دکەت. بۆ نموونە دەمێ ئەم دپرسین ئەرێ گەردوونی دوماهی هەیە یان نە، ئەم پرسیارێ

دەربارەی تشتەکی دکەین کو ئەم ب خوە بەشەکێ بچووکین ژ وی تشتی. ژبەر هندێ ئەم نەشێین بگەهینە بەرسڤا ڤێ پرسیارێ."

- "بۆچی نە؟"

- "دەمێ پرسیار دکەین کا جیهان چەوا دروست بوویە و دەست ب دانانا مگرتیان دکەین، ل وی دەمی ئەقل ل سەر شێوەیێ بازنەیەکا ڤالا دزڤڕیت. ب ڕاستی ژی ل ڤێرە مە چ دیاردەیێن هەستپێکری یان سەربۆر نینن کو پشتا خوە پێ گەرم بکەین. ئەم چ جاران نەشێن هەموو تشتێن دەوروبەری خوە تاقی بکەین کو ئەم ب خوە بەشەکێ بچووکین ژێ. ئانکو تا ڕاددەیەکی ئەم ب خوە بەشەکین ژ وێ تەپا ل سەر ئەردی گرێل دبیت بێ کو بزانین ژ کیڤە هاتیە. لێ ئەقلێ مە هۆسا هاتیە دروستکرن کو وەل مە دکەت بەردەوام پرسیارا ژێدەرێ تەپێ بکەین، زێدەباری هەموو مژارێن دی یێن هەڤشێوە خوە هەکە چ تشتێ بەرجەستە د دەستێن مەژی دا نەبیت."

- "سوپاس، ئەز باش د وی هەستی گەهشتم."

- "ل دووڤ سەرنجا کانتی، دەمێ ئەڤ پرسیارێن مەزن و سەرەکی دهێنە کرن، ئەقلێ مرۆڤی دوو مگرتییێن پێشبینیکری یان نەپێشبینیکری بەرهەم دئینیت."

- "بۆ نموونە؟"

- "ئەم دشێین د هەمان دەم دا خوە پشتڕاست بکەین ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان جیهانێ دەستپێکریە، یان ژی هەما جیهان ژ دەستپێکێ وەرە هەبوویە."

- "لێ ئەقلێ مرۆڤی د هەردوو باران دا نەشێت وەك یەك هزر د ڤان پێشبینیان دا بکەت. ئەم دشێین بێژین جیهان ل دەستپێکێ وەرە هەبوویە لێ ئەرێ یا گونجایە تشتەك خو ژ دەستپێکێ وەرە هەبیت بێ کو ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان ژ چنەیێ دەستپێکر بیت؟

- "ئەگەر ئەم بچینە بۆچوونا دی یا بەروڤاژی، دبیت جیهان ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان دروست ببیت ئانکو ژ چنەیێ دروستبوویە. لێ سۆفیا، ئەرێ چێدبیت تشتەك ژ چنەیێ دروست ببیت؟"

- "نەخێر، د هەردوو کاودانان، ئەم دکەڤینە د ئاریشەکێ دا. لێ دگەل هندێ پێدڤیە یەك ژ ڤان هەردوو مگرتیان یا دروست بیت."

- "هەردیسان ل بیرا تە یە کو دیمۆکریتس و فەیلەسۆفێن مەتریالی د وێ باوەرێ دا بوون کو سروشت ژ چەند تۆخمێن بچووك پێکدهێت. ئەڤ تۆخمە تشەکێ پێکدئینن. لێ دووڤ باوەریا هندەك فەیلەسۆفێن دی، بۆ نموونە، وەکو دیکارتی، ڕاستیا درێژبوونا ماددەی ل سەر چەند تشتێن بچووکتر دابەش دبیت. لێ کی ژ ڤان هەردووان یێ دروستە؟"

- "هەردوو ... یان ژی خو یەك ژ وان نە."

- "هندەك فەیلەسۆفێن دی دووپاتکر کو یەك ژ شیانێن هەرە گرنگ ل دەڤ مرۆڤی ئازادی یە. د هەمان دەم دا مە هندەك فەیلەسۆفێن دی دنیاسین وەکو سپینۆزای و ستۆیکیان کو د وێ باوەریێ بوون خو تشتەك برێڤە ناچیت ئەگەر یاسایێن سروشتی نەبن، هەروەسا کانتی ژی ددیت ئەقل نەشێت حوکمێ یەکلاکەر بدەت."

- "هەردوو کاودان بەرەڤانیێ ژ خوە دکەن"

- "هەمان تشت ل سەر هەبوونا خودای دهێتە بجهئینان. پتریا فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی و ل سەرێ وان دیکارتی، پێکۆل دکر هەبوونا خودای بسەلمینن چونکی مە بیرۆکەیا "بونەوەرەکێ تەمام" هەیە. لێ فەیلەسۆفێن وەکو تۆماس ئاکوین و ئەرستۆی ددیت خودا ئەگەرێ پەیدابوونا هەموو بونەوەرێن ل سەر ئەردی یە."

- "و پا کانتی چ دگوت؟"

- "وی باوەری ب خو یەك ژ ڤان سەلماندنان نەبوو. چونکی، ب دیتنا وی، سەربۆر نەشێن چ بنەمایێن ڕاست بدەنە مە و دووپات بکەت کو خودا یێ هەی یان نینە."

- "لێ پا تە ل دەستپێکێ دگوت کانتی دڤیا شەنگەستێن ئایینێ مەسیحیەتێ بپارێزیت."

- "بەلێ، وی دەرگەهێ ئەگەرەکێ ئاینی ڤەکر، ل وی دەمی ئەقل و سەربۆر دگەهنە ڕێکەکا گرتی و ل وێرێ ڤالاهیەك دروست دبیت. د شیان دایە ب باوەریا ئاینی ئەڤ ڤالاهیە بهێتە پڕکرن."

- "ئەرێ وی ب ڤی ڕەنگی مەسیحیەت ڕزگارکر؟"

- "تو دشێی وەبێژی. لێ کانت ب خوە ل سەر ڕێبازا پڕۆتستانتی بوو. ل سەردەمێ چاکسازیا ئاینی دێرا پڕۆتستانتی ب تنێ ب باوەری ئینانێ د بەرنیاس بوون. لێ ل چەرخێن ناڤین، دێرا کاتۆلیکی پەنا دبرە بەر ئەقلی داکو باوەریا خوە پشتڕاست بکەن."

- "تێدگەهم."

- "لێ کانتی ئەو پرسیار بۆ باوەریێ ب تنێ نەهێلان، بەلکو کوورتر تەماشەی بابەتی دکر. وەکو بناغەیێ ئەتیکی ددانا، هەر وەکو بێژین مرۆڤی ڕۆحەکا نەمر هەیە و خودا یێ هەی و مرۆڤی ژی ناخەکێ زیندی هەیە."

- "تا ڕاددەکی وەکو دیکارتی بوو! ل دەستپێکێ گومان ژ وان تشتان هەبوو یێن تێدگەهشت، پاشی ب دزیکی ڤە خودا و کومەکا تشتێن دی دکرنە دناڤ بابەتی دا."

- "لێ ئەو بەروڤاژی دیکارتی بوو، یێ ڕژدبوو ل سەر هندێ کو ب باوەریێ مرۆڤ دێ گەهیتە وی ئەنجامی نەك ب ئەقلی. وی زاراڤێ "مگرتییێن کریاری" بۆ باوەریا مرۆڤی ب نەمریا ڕۆحێ، باوەری ب هەبوونا خودای و باوەری ب نەمریا ناخێ مرۆڤی بکاردئینان."

- "ئەرێ ڕامانا ڤێ چەندێ چیە؟

- "مگرتی ئەو تشتە یێ ب بەلگە دهێتە ددوپاتکرن. مگرتیا کریاری ژی، ئەو تشتە یێ پەیوەندی ب ڕەفتارین مرۆڤی یان ڕەوشتێ وی ڤە هەی. کانت دبێژیت: "باوەری ئینان ب هەبوونا خودای پێدڤیەکا ڕەوشتی یە."

ژ نیشکەکێ ڤە دەرگەهـ هاتە قوتان. سۆفیا یەکسەر ڕابووڤە، لێ دەمێ دیتی ئەلبێرتۆ ژ جهێ خوە نەلڤی. سۆفیایێ پرسیار ژێ کر: "ما ئەم دەرگەهی ناڤەکەین؟"

ئەلبێرتۆی سەرێ خوە هەژاند، ل دوماهیێ ئەو ژی ڕابووڤە. دەرگەهـ ڤەکر و کچکەکا کراس سپی ژ دەرڤە دیت، کولاڤەکێ سۆر ژی ل سەرێ وێ بوو. ئەڤە هەر ئەو کچك بوو یا بەری هنگی سۆفیایێ ل ڕەخێ دی یێ دەریاچێ دیتی و زەمبیلکەکا پڕی خوارن د دەستێ وێ دا.

سۆفیایێ پرسیار ژێ کر: " چەوانی؟ تو کی؟"

- "ما تو من نابینی، ئەز لەیلا یا کولاڤ سۆرم؟"

سۆفیایێ تەماشەی ئەلبێرتۆی کر. وی ژی سەرێ خوە هەژاند و گوت: تە ب خوە گوهلێبوو کا وێ چ گوت؟"

- "ئەز یا ل مالا داپیرا خوە دگەڕییێم. ئەو یا پیر و نەخۆشە. من ژی خوارن یا بۆ ئینای."

- "ل ڤێرێ نینه. ل سەر ڕێکا خوە هەڕە بۆ تە باشترە."

ئەلبێرتۆی دگەل ڤان ئاخفتنان پێشیەك ژ خوە ڤەڕەڤاند، لێ کچکا کولاڤ سۆر بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "لێ نامەیەکا دگەل من، پێدڤیە ئەز بگەهینمە دەستێ وێ."

پشتی دەمەکێ کێم کچکا کولاڤ سۆر ئەو نامە ئینا دەرێ و دا دەستێ سۆفیایێ. پاشی چوو ل سەر ڕێکا خوە و بەرزەبوو.

سۆفیایێ گوتێ: "هشیاری خوە بە ژبەر گورگان."

پاشی سۆفیا ب دووڤ ئەلبێرتۆی کەفت و چوونە د ژوور ڤە و ل سەر کورسیێن خوە ڕوونشتن و سۆفیایێ ب حێبەتی ڤە گوت: "کا کێ هزرا کولاڤ سۆرێ دکر."

- "چ مفا ژی تێدا نینە تە گوتیێ هشیاربە. چونکی دێ چیتە مالا داپیرا خوە و گورگ دێ وێ خوت. ئەو چ جاران فێرنابیت. ئەڤ تشتە دێ دووبارە بیت هەتا هەتاییێ."

- "لێ من چ جاران گوهلێنەبوویە کو بەری بگەهیتە مالا داپیرا خوە ئەو دەرگەهێ مالەکا دی بقوتیتت."

- "ژ وێ بگەرە سۆفیا."

پاشی سۆفیایێ بەرێ خوە دا نامێ، ل سەرێ وێ نڤیسا بوو "بۆ هێلدێ". نامە ڤەکر و ب دەنگەکێ بلند خواند.

***خوشتڤیا من هێلد***

***ئەگەر ئەقلێ مرۆڤی هند یێ ب ساناهی با کو ئەم شیاباین تێبگەهین، ل وی دەمی دا گەلەك د بێ ئاقل بین.***

***سلاڤ ژ دەڤ بابێ تە***

ئەلبێرتۆی سەرێ خوە هەژاند و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "ڕاست دبێژیت. یا ژمن ڤە کانتی ژی هەمان تشت دگوت. ئەم نەشێین چاڤەڕێی هندێ بین تێبگەهین کا ئەم چی نە؟ دبیت مە شیانێن هندێ هەبن تێبگەهین کا گۆلەك چیە؟ ین مێشەك چیە؟، لێ چ جاران ئەم نەشێین د خوە بگەهین. پا چ پێنەڤێت هەر ئەم کێمتر د گەردوونی دگەهین."

سۆفیایێ ئەو ڕستەیا سەیر یا دناڤ نامێ دا دوو سێ جارەکان خواند و پاشی ئەلبێرتۆ بەردەوام بوو.

- "ئەم ل سەر هندێ ڕێکەفتین ئێدی نەهێلین مارێ ئاڤی و تشتێن ژ وی ڕەنگی ببنە ڕێگر. ژ بەری ئەم بابەتێ ئەڤرۆ ب دوماهی بینین من دڤێت بەحسێ زانستێ ئەتیکی یێ کانتی بو تە بکەم."

- "دێ پا لەزێ بکە، چونکی پێدڤیە ب ڤەگەڕمە مالێ."

- "هیومی گومان ژ هەمووو وان تشتان دبر یێن ئەقل و هەستێن مە دبێژن، ڤان گومانێن هیومی کانت نەچارکر جارەکا دی سەر و ژ نوو هزر د پرسیارێن هەڕە گرنگێن ژیانێ دا بکەت. زێدەباری لایەنێ ئەتیکی. لێ هیومی دگوت ئەم نەشێین باشیێ ژ خڕابیێ جودا بکەین ژبەرکو مەرج نینە "ئەو تشتێ پەیدابووی" هەر ئەو تشت بیت یێ کو "پێدڤی بوو پەیدابباباية". ب بۆچوونا هیومی، نە ئەقلێ مە و نەژی سەربۆرێن مە ڕێکێ ددەن باشی و شاشیێ ژ هەڤدوو جودا بکەین، لێ گەلەك ب ساناهی ب ڕێکا هەستێن خوە ئەم دشێین ژ هەڤدوو جودا بکەین. و ئەڤ شەنگەستە ل دەڤ کانتی گەلەك یێ لاواز بوو."

- "ئەز ژی دگەل وی مە."

- "کانتی هەردەم دگوت جوداهی دناڤبەرا باشی و خڕابیێ ژ ژیواری یە. ب ڤێ چەندێ کانت یێ هەڤڕا بوو دگەل فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی دەمێ دگوتن ئەقلێ مرۆڤی شیانێن ژێکجوداکرنا باشیێ و خڕابیێ هەیە. هەموو مرۆڤ دزانن چ باشە و چ خڕابە. ئەڤە ژی نە ژبەرکو تشتەکە ئەم ل سەر فێربووینە بەلکو ژبەر هندێ یە کو یێ دناڤ ئەقلێ مە

دا هاتیە دارێژتن. کانتی دگوت هەموو مرۆڤان ئەقلێ کریاری هەیە، واتە مە شیانێن ئەقلی یێن هەین بزانین چ تشت باشە و چ خرابە."

- "ئانکو تشتەکێ زکماکی یە."

- "بەلێ. شیانێن جوداکرنا باشیێ و خرابیێ، وەکو هەموو شیانێن دی یێن ئەقلی تشتەکێ زکماکی. هەروەکو کا چەوا هەموو مرۆڤ بنەمایێ ئەگەرێ ڕوودانێن دناڤ گەردوونی دا ب سینگەهێ بەرفرەهـ وەردگرن، ب هەمان شێوە هەموو کەس دشێن بگەهنە یاسایێن سروشتی یێن گەردوونی ب خوە. ئەڤ یاسایە ژی هندەك یاسایێن ڕەهانە، هەروەکو کا چەوا یاسایێن فیزیایی یێن دیاردەیێن سروشتی د ڕەهانە. ئەو بنەمایێ ژیانا مە یا ئەتیکی نە و بنەمایێ ئەگەرێ ڕوودانانە ژ بۆ تێشگەهشتنا ڕاستییێن دەوروبەر. بۆ نموونە ئەڤ هاوکێشا بیرکاری: 7+5= 12"

- " ئەڤ یاسایا ئەتیکی چ دبێژیت؟"

- "ئەڤ یاسایە، یاسایەکا ڤەبڕ و یەکلاکەرە، ژبەرکو بەری هەبوونا چ سەربۆران دهێت. ب ڕەنگەکێ دی، نە یا گرێدایە ب چ کاودانێن تایبەت ڤە کو تێدا ئاریشا هەلبژارتنێ پێشنیار بکەین. هەروەسا بۆ هەموو مرۆڤان یا گونجایە ڤێجا د چ جڤاك و سەردەم دا بن. ئەو نابێژیت کا چ بکەی و چ نەکەی، بەلکو د هەموو کاودانان دا دبێژیتە تە کا دێ ب چ ڕەنگ ڕەفتاری کەی."

- "لێ یاسایەکا ئەتیکی یا ب ڤی ڕەنگی ئەگەر د کاودانەکێ دەستنیشانکری دا نەبێژیتە مرۆڤی دڤێت چ بکەی و چ نەکەی، ئەرێ ما دێ چ مفا د وێ یاسایێ دا بیت؟"

- "کانتی ئەڤ یاسایێن ئەتیکی وەکو فەرمانەکا ڕەها ددیت کو ب کێر هەموو کاودانان بهێت، وی دگوتێ "فەرمان" ژبەرکو فەرمانێ ل مە دکەت بکەڤینە ژێر ڤێ یاسایێ."

- "هممم..."

- "کانتی یاسایێن ئەتیکی ب چەندین شێوەیان دداڕێژتن. ل دەستپێکێ دگوت: "دڤێت ب ڕەنگەکی ڕەفتاری بکەی کو ئەو یاسایە ل دووڤ وێ ڕەفتاری ببیتە یاسایەکا گشتی."

- "ئانكو ل دەمێ ئەز تشتەكى دكەم، دڤێت بگەهمە وێ باوەریێ ئەگەر خەلك ژى توشى هەمان كاودان بن دێ وەكو من كەن."

- "هەلبەت. ب تنێ ب ڤێ ڕێكێ دێ شێى هەماهەنگیێ دناڤبەرا یاساییێن ئەتیكى یێن ناخێ خوە دگەل ڕەفتارین خوە كەى. كانت یاساییێن ئەتیكى ب ڤى ڕەنگى دادڕێژیت و دبێژیت: "هەردەم وەكو ئارمانجەكێ ڕەفتارێ دگەل مرۆڤێن دى بكە، نەك وەكو ئالاڤەكى، ژ بۆ كو تشتێن دى ب دەست خوە ڤە بینى."

- "كەواتە نابیت ئەم كەسێن دى بكاربینین ب تنێ داكو بگەهینە بەرژەوەندییێن خوە یێن تایبەت."

- "بەلێ نابیت، ژبەركو هەر مرۆڤەك د خوە دا ئارمانجەكە. ئەڤە ژ خەلكێ دى ب تنێ ناگریت بەلكو ژ تە ژى دگریت. نابیت تو خوە وەك ئالاڤ بكاربینى داكو بگەهیە تشتەكى."

- "ئەڤە تا ڕاددەیەكى وەكو وێ یاسایێ یە یا دبێژیت: "وێ ڕەفتارى دگەل خەلكى نەكە یا تە نەڤێت كەسێن دى وێ ڕەفتارى دگەل تە بكەن."

- "بەلێ، ئەڤە ژى پڕەنسیپەكێ گشتگرە. هەموو لایەنێن ئەتیكى ب خوە ڤە دگریت. ئانكو ئەم دشێین بێژین ئەڤ یاسایە دەربڕینێ ژ هەمان یاساییێن ئەتیكى یێن كانتى دكەت."

- "لێ ئەڤ چەندە ب تنێ مگرتینە. هیومى ژى ڕاست دگوت. دەمێ دگوت ئەم نەشێین ب ڕێكا ئەقلى بسەلمینین چ تشت ڕاستە و چ تشت یێ شاشە."

- "ل دەڤ كانتى یاساییێن ئەتیكى د گشتى و ڕەهانە، بۆ نموونە وەكو یاساییێن ئەگەرێ ڕوودانان. ئەڤ یاسایە ژى ب ڕێكا ئەقلى ناهێتە سەلماندن، لێ دگەل هندێ یا نەگوهۆڕە و مرۆڤ نەشێت حاشاتیێ ژێ بكەت."

- "ئەز هەستپێدكەم ئەم یێ بەحسێ وژدانێ دكەین، هەر مرۆڤەكى وژدانەك هەیە.. مانە هۆسایە؟"

- "بەلێ، دەمێ كانت بەحسێ یاساییێن ئەتیكى دكەت، ب ڕاستى ژى ئەو بەحسێ وژدانا مرۆڤى دكەت. ئەم نەشێین وان تشتان بسەلمینین یێن وژدانا مە دبێژیتە مە، لێ دگەل هندێ ئەم باش دزانین."

- "هندەك جاران ئەز جوان ڕەفتاری دکەم و هاریکاریا خەلکی دکەم، لێ ئەڤە ب تنێ ژبەر هندێ یە ئەز دزانم کو ئەڤ باشیە دێ بۆ من ب خوە زڤڕیت. بۆ نموونە دبیت ژبەر هندێ بیت کو دێ ب ڤێ ڕێکێ دێ هەڤالان بدەستڤە ئینم یان ناڤدار بم."

- "د ڤی ڕەوشێ دا، ل ڤێرێ تو ل دووڤ یاسایا ئەتیکی ڕەفتاری ناکەی. هەتا ئەگەر ڕەفتارا تە دگەل یاسایا ئەتیکی ژی بیت و ئەڤە تشتەکێ باشە. لێ پێدڤیە ڕەفتارا تە یا زالبیت ل سەر ناخێ تە دا ژ هەژی ساخلەتا "کارێ ئەتیکی" بی. وی دەمێ تو تشتەکی دکەی و هەستپێدکەی کو تە ب یاسایێن ئەتیکی کریە هینگی ب ڕەفتارەکا ئەتیکی ل قەلەم بدە. ژبەر هندێ ژی دبێژنە زانستێ ئەتیکی یێ کانتی، زانستێ "ئەتیکێ فەرمانپێکری".

- "ئەز هەستپێدکەم ئەرکێ منە پارەی بۆ ڕێکخراوێن زارۆکان و ڕێکخراوێن دی یێن خێرخوازی کوم کەم."

- "بەلێ، تشتێ گرنگ ل ڤێرێ ئەوە. تە باوەری ب وی تشتی هەبیت یێ تو دکەی. هەتا ئەگەر ئەو پارێ تو کوم دکەی، نەگەهیتە جهێ مەرەم ژی، لێ تە ل دووڤ یاسایا ئەتیکی ڕەفتار یا کری و ئەو تشتێ فەرمان پێ هاتیەکرن تە یێ ئەنجامدای. ب دیتنا کانتی، ئەڤ کارێ تە کری یا گرنگە نەك ئەنجامێن وێ. زانستێ ئەتیکی ل دەڤ کانتی پێکدهێت ژ خواستەکا باش و کارێن چاك."

- "بۆچی وی گەلەك گرنگی ب هندێ ددا بزانیت کا ئەم دێ ڕەفتاری ل دووڤ یاسایا ئەتیکی کەین یان نە ؟ ئەرێ ما یا ژ وێ گرنگتر ئەو نینە کو ئەم ڕەفتاری د باشیا خەلکێ دی دا بکەین؟"

- "چ پێنەڤێت. کانت دگەل ڤێ بۆچوونا تە یێ هەڤڕایە. لێ وی دگوت دەمێ ئەم ب ئازادی ڕەفتاری دکەین ئەم د هشیارین و ئەم ل دووڤ یاسایا ئەتیکی ڕەفتاری دکەین."

- "چ؟ ئەم د ئازاد نینین هەتا ل دووڤ یاسایێ نەچین؟ ئەڤە یا هەڤدژە."

- "نەخێر. ل دەڤ کانتی یا سەیر نینە. ل بیرا تە یە کو وی ئاماژە ب هندێ دکر مرۆڤی خواستەکا ئازاد و سەربەخو هەیە... ئەڤە خالەکا گرنگە، ژبەر هندێ ل دووڤ باوەریا کانتی هەموو تشت ب یاسایێن ئەگەری ب ڕێڤە دچن، واتە چەوا چێدبیت مە خواستەکا "ئیرادەکا" ئازاد هەبیت؟"

- "ئەرێ تو پرسیارێ ژ من دکەی؟"

- "کانت مرۆڤی دکەتە دوو پشك کو بیرا مە ل بیرۆکەیا دوانەیی یا لەشی و ڕۆحێ دئینیت. ئەو هۆسا دبینیت ئەم زیندەوەرێن هەستیارین، دکەڤینە ژێر یاسایێن ئەگەری یێن نەگوهۆڕ. ئەم ب خوە هەستێن خوە ناهەلبژێرین، بەلکو مە بڤێت و نەڤێت هەست وەکو پێدڤیەکێ دهێنە دناڤ ناخێ مە دا و ڕەنگڤەدانێ ل سەر کەسایەتیا مە دکەن. لێ ئەم ب تنێ بوونەوەرێن خوەدان هەست نینین بەلکو مە ئەقل ژی هەیە."

- "بۆ من پتر ڕوهن بکە."

- "ئەم مرۆڤ وەك بوونەوەرێن خوەدان هەست ئەم ناهێینە جوداکرن ژ یاسایێن سروشتی، ژبەر هندێ ئەم نەشێین چ تشتان ل دووڤ خواستا خوە ئەنجام بدەین. لێ وەك بوونەوەرەکێ خوەدان ئەقل، ئەم سەر ب وی تشتی ڤەینە یێ کانتی دگوتیێ " das Ding an Sich" ئانکو "جیهان وەك خوە". ئانکو ئەو بەشێ جیهانێ یێ گرێدای مە نینە. ل وی دەمی مە ب تنێ خواستەکا ئازاد یا هەی کو دبێژنێ "ئەقلێ کریاری"، ئەو ئەقلێ کو وەل مە دکەت بڕیارێن ئەتیکی بهەلبژێرین. ژبەر هندێ دەمێ دبینە خوەدان یاسایێن ئەتیکی ل وی دەمی دبینە خوەدان یاسایەك کو مە ب خوە بۆ خوە دانایینە و ل سەر دچین."

- "بەلێ، تا ڕاددەیەکی ڕاستە. بێ گومان تشتەك د ناخێ من دا دبێژیتە من نابیت بەرامبەر خەلکێ دی ب شێوەیەکێ کرێت ڕەفتارێ بکەم."

- "ل دەمێ بڕیارێ ددەی ب شێوەیەکێ کرێت ڕەفتاری نەکەی، دبیت ئەڤ چەندە دژی بەرژەوەندیێن تە ژی بیت. لێ ل وی دەمی تو ب ئازادانە ڕەفتاری دکەی."

- "لێ هەرچەوا بیت، ئەم د ئازاد و سەربەخۆ نابین ئەگەر ب تنێ ل دووڤ ئارەزوویێن خوە بچین."

- "بەلکو دێ بینە بەندەیێن حەز و ئارەزوێن خوە ژی. داکو ل سەر حەز و ئارەزوویێن خوە زاڵبین مە پێدڤی ب ئازادی و سەربەخوییێ هەیە."

- "باشە سەبارەت گیانەوەران؟ ژ خو ئەو بەس ل دووڤ حەز و پێدڤیێن خوە دچن. ئەوان ئازادیەکا هۆسا نینە کو ل سەر یاسایا ئەتیکی زاڵبن؟"

- "نەخێر، ئەو ئازادی یە ب خو ژی ئەوە یا مە دکەتە مرۆڤ."

- "ئەز نوکە تێگەهشتم."

- "ل دوماهیا دانوستاندنا مه، دێ بێژین کانت شیا ب سەرکەفتیانە خوە ژ فەلسەفەیا ڕاشیونالیزمی و ئیمپریستان دەرباز کەت. ژبەر هندێ قۆناغەکا دی یا فەلسەفێ دگەل کانتی ب دوماهی دهێت. کانتی ل سالا 1804ێ وەغەرکر لێ دگەل مرنا وی یەکسەر زاراڤەکێ نوو دەردکەڤیت دبێژنێ "ڕۆمانسیزم". ل سەر گۆڕێ وی ل باژێرێ کۆنگسبێرك یەك ژ گوتنێن وی یێن هەرە ناڤدار ل سەر هاتیە نڤیسان "دوو تشتان دلێ من پڕی داخباری و ڕێزگرتن کریە و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ پتر پێڤە دهێمە گرێدان: ئەسمانەکی پڕی ستێرێن گەش ل هنداڤی من و یاسایا ئەتیکی د ناخێ من دا."

پاشی ئەلبێرتۆی پالا خوە دا کۆرسیکێ و بەردەوامی دا ئاخفتنێ.

- "دێ ل ڤێرێ ڕاوەستین، یا ژ من ڤە مە گرنگترین تشت دەربارەی کانتی گوتن."
- " دەمژمێر چوار و چارێکەکە."
- "تشتەکێ دی ژی مایە، بێ زەحمەت پیچەك خوە بگرە."
- "هەتا مامۆستاییێ من نەبێژیتە من وانە ب دوماهی هات، ئەز ژ پۆلێ دەرناکەڤم."
- "مانە من گوتبوو تە ل دووڤ باوەریا کانتی، ئەگەر ئەم وەك بوونەوەرێن خوەدان هەست بین، مە چ جۆرە ئازادیەك نینە؟"
- "بەلێ، تە تشتەکێ هۆسا بوو."
- "و من گوت ژی ئەگەر ئەم ل دووڤ ئەقلێ گەردوونی بچین، دێ د ئازاد و سەربەخو بین."
- "چیە تە دڤێت وانێ هەموویێ دووبارە بکەی؟"

ئەلبێرتۆی خوە نێزیکی سۆفیایێ کر و تەماشەی چاڤێن وێ کر و پاشی چوو بەر گوهێ وێ و گوت "سۆفیا. باوەر ژ وان هەموو تشتان نەکە یێن تو ب چاڤێن خوە دبینی."

- "مەرەما تە چیە؟
- "کچا من، هزرا خوە د ڕێکەکا دی دا بکە."
- "ئەز ب چ ڕەنگان د مەرەما تە نەگەهشتم."
- "گەلەك جاران ئەم دبێژین هەتا ئەز تشتی ب چاڤێن خوە نەبینم ئەز باوەر ژێ ناکەم، لێ ئەڤە نە تشتەکێ دروستە."

- "ئەگەر یا شاش نەبم، بەری نوکە ژی تە تشتەکێ هۆسا گوتبوو."

- "بەلێ، ئەو ژی دەمێ مە بەحسێ پارمینیدیسی دکری."

- "لێ ئەز تێناگەهەم تە دڤێت بگەهیە کیژ خالێ."

- "بەلێ تو دزانی. هێی. ئەم ژ دەرڤە د ڕوونشتی بووین دەمێ مارێ ئاڤی د دەریاچێ دا هاتیە ژ دەرڤە و لڤلڤی."

- "بەلێ، ئەڤە یا سەیر بوو."

- "نەخێر، نە یا سەیر بوو. پاشی خوەدانا کولاڤێ سۆڕ هات و دەرگەهـ قوتا و گوت کو یا ل مالا داپیرا خوە دگەڕیێت. ب ڕاستی ژی تشتەکێ نەخوش بوو، سۆفیا ئەڤە هەموو یاریێن مایجەری یێن بێ ڕامانن. هەروەکو نامەیا دناڤ تیڤلێ موزێ دا و بارۆڤەیا دژوار... ل بیرا تەیە؟

- "تو د وێ باوەریێ دای؟"

- "بەلێ من گوتبوو تە من پلانەك یا دانای. هندی ئەم ل دووڤ ئەقلی ڕەفتاری بکەین ئەم ناهێینە خاپاندن. ب ڤی ڕەنگی ژی هەتا ڕادەیەکی ئەم د ئازادین. ئەو دشێت ب ئارەزوویا خوە وەل مە بکەت هەست ب هەر تشتەکی بکەین یێ وی بڤێت. لێ خو تشتەك من حێبەتی ناکەت. خو بلا فیل ل ئەسمانان ژی بفڕن بتنی دێ پیچەك گرنژم، لێ هاوکێشا 5+7= 12 تشتەکێ نەگوهۆڕە و ژ هەموو ڤان کارتێکرنێن وەکو فلم کارتونان دبوریت. فەلسەفە ب تەمامی بەرۆڤاژی چیڤانوکایە."

سۆفیا بێدەنگ ما و ب حێبەتی ڤە تەماشەی وی دکر.

- "نوکە تو دشێی بڤەگەڕیە مال. پاشی دێ داخوازێ ژ تە کەم بهێیە دەڤ من داکو بۆ تە بەحسێ سەردەمێ ڕۆمانسیزمێ بکەم. پاشی دێ بەحسێ هیگلی و کێرکیگاردی کەین. لێ ب تنێ حەفتیەك مایە کو مایجەر دێ ژ لوبنلنێ زڤڕیت. هەتا دزڤڕیت ژی دڤێت خوە ژ ئاشوپیا وی ڕزگار بکەین. ژ بلی ڤێ ئەز چ دی نابێژم سۆفیا، لێ من دڤێت تو بزانی کو ژبەر خاترا مە هەردووان ئەز ل سەر پلانەکا جوان کار دکەم."

- "دێ باشە پا ئەز دێ چم."

- "کا ڕاوەستە. من تشتەکێ گرنگ ژبیر کر."

- "ڤێجا ئەو چیە؟"

- "سترانا جەژنا بوونێ، سۆفیا. ژبیر نەکە ئەڤرۆ هێلد دێ بیتە پازدە سال."
- "ئەز ژی هەروەسا."
- "باشە، دا پێکڤە سترانێ بێژین."

جەژنا بوونا تە پیرۆز

جەژنا بوونا تە پیرۆز، هێلد

جەژنا بوونا تە پیرۆز

دەمژمێر ببوو چوار و نیف. سۆفیایێ کرە غار هەتا گەهشتیە سەر دەریاچێ و ب بەلەمێ ژ ئاڤێ دەربازبوو. پاشی بەلەمە کێشا سەر هشکاتیێ و بەرەڤ دارستانێ کرە غار.

دەمێ گەهشتیە سەر ڕێکێ، دناڤ ڕەهێن داران دا تشتەك دیت کو دلڤلڤی. سۆفیایێ یەکسەر هزرا کچکا کولاڤ سۆر کر ئەوا ل مالا داپیرا خوە دگەریای، لێ ئەو هزرا وێ دکری بچووکتر بوو ژ هندێ کو گورگ بیت. ل دەمێ نێزیك بووی. بووکەکا قەهوای دیت، فانێلەکێ سۆر ل بەر بوو. هەروەکو یاریەکا زارۆکان بوو.

سۆفیا د جهێ خوە دا هشك بوو، دەمێ دیتی کو هرچوکەکا یاریکە. ئاسایی یە ئەگەر هرچوکەکا یاریکێن زارۆکان د دارستانێ دا ژ کەسەکی کەفتبیت، لێ ئەڤ هرچە یا ساخە.. مژوولی تشتەکی یە.

سۆفیایێ گوتێ: "سپێدە باش."

هرچوك ل دور خوە زڤڕی و گوت: "ناڤێ من "وینی یێ هرچوك"ە، ب مخابنی ڤە د ڤێ ڕۆژا خوش دا ئەز ل ناڤ دارستانێ بەرزە بووم. من بەری نوکە چ جاران تو نەدیتیە.

- "دبیت بەری نوکە ئەز د ڤێرێ ڕا نەهاتبم. لێ تو ب ساناهی دشێی دناڤ دارستانا 160 مەتری دا بهێی و بچی."

- "نەخێر، ئەو ژمارە ل دەڤ من گەلەکا ب زەحمەتە. و بلا ل بیرا تە بیت ئەز هرچم و ئەقلێ من یێ کێم و سنووردارە."

- "من یا گوهـ ل ناڤودەنگیا تە بووی."

- "ئانكو تو ئەليسى. جارەكێ كريستوفەر ڕۆبنى بەحسێ تە بۆ من يێ كرى. ئەز دبێژم هەر ب هەمان شێوە مە هەڤدوو ديتبوو. تە شووشەكا ئاڤێ ڤەخوار ڤێجا تو بچووكتر لێ هاتى. پاشى تە شووشەكا دى يا ئاڤێ ڤەخوار تو مەزن بوويە ڤە. پێدڤيە د هشيار بين كا ئەم چ دخوين. ڕۆژەكێ من گەلەك خوارن خوار ئەز ئاسێ بووم و نەشيام ژ كونا خوە دەركەڤم."

- "ئەز نە ئەليسم."

- "گرنگ نينە كا ئەم كينە، يا گرنگ ئەوە كو ئەم يێن هەين. بۆما كەرِ وەدبێژيت. جارەكا دى ژى وە گوتبوو 7+5=12. ئەز و كەر شەرمزار بووين چونكى ئەم ژمارەيان نزانين. ل دەڤ مە پێشبينيكرنا سەقاى ب ساناهيترە."

- "ناڤێ من سۆفيايە."

- "پێخوشحالبووم ب نياسينا تە، چ پێنەڤێت تو كەسەكا نووى ل ڤێ دەڤەرێ، پێدڤيە نوكە ئەز بچم و ل هەڤالێ خۆ يێ بەڕاز بگەڕێم. ئەم هەموو بو ئاهەنگەكا مەزن يێن هاتينە داخواز كرن ژ لايێ كێڤريشكێ و هەڤالێن وێ ل باخچەى وان. پاشى دەستێ خوە بلند كر و خاترا خوە خواست. سۆفيايێ د دەستێ وى يێ دى دا كاغەزەكا پێچاى ديت.

سۆفيايێ پرسيار ژێ كر: "ئەو چيە د دەستێ تە دا؟"

وێنى كاغەز ئينا پێش و گوتى: "ئها ژبەر ڤێ چەندێ ئەز دناڤ دارستانێ دا بەرزەبووم.

- "لێ ئەڤە ب تنێ پارچە كاغەزەكە و چ دى نە."

- "نەخێر، ئەو ب تنێ پارچە كاغەز نينە. نامەيەكە بۆ "هێلدێ" هاتيە ئەوا ل ڕەخێ دى يێ خوديكێ دا دەردكەفتى."

- " باشە ئەز دشێم بگەهينمێ."

- "لێ تو كچا ل ڕەخێ دى يێ خوديكێ دا نينى."

- "نەخێر، لێ..."

- "دوهى كريستوفەر ڕۆبنى گوتە من دڤێت نامە بگەهيتە دەستێ خوەدانێ."

- "لێ ئەز هێلدێ دنياسم."

- "ڤێ چەندێ چ گرنگیا خو نینە. هەتا ئەگەر تو کەسەکی گەلەك باش بنیاسی ژی. لێ چ جاران نابیت نامێن وی ڤەکەی و بخوینی."

- "مەرەما من ئەوە ئەز دشێم بگەهینمە دەستێ وێ."

- "د ڤی باری دا... ها بگرە... ئەگەر ئەز ژ ڤێ نامەیێ ب دوماهی هاتم دێ شێم ب ساناهی رێکا هەڤالێ خوە یێ بەڕاز بینم. لێ دێ بۆ تە یا ب زەحمەت بیت، چونکی ل دەستپێکێ دڤێت تو خودیکەکا مەزن پەیدابکەی و پاشی وێنەیێ بەرامبەر هێلدێ بدەرێخی، ئەڤ چەندە ژی د ڤی بەشێ دارستانێ دا یا ب ساناهی نینە."

پشتی هنگی کاغەز داف سۆفیایێ و ژ ناڤ دارستانێ دەرکەفت و گەلەك ژێ دوور بوو، سۆفیایێ نامە ڤە کر و دەست ب خواندنێ کر.

خوشتڤا من هێلد:

ب ڕاستی ژی شەرمە ئەلبێرتۆی نەگوتیە سۆفیایێ کو کانتی بانگەوازیا دامەزراندنا "یەکەتیا نشتیمانی یا مللەتان" دکر. د پڕۆژەیێ خوە یێ ئاشتیێ دا دبێژیت پێدڤیە هەموو وەلات د یەکێتیەکا نێڤدەولەتی دا کوم ببن داکو پێکۆلا دابینکرنا ئاشتیێ دناڤ هەموو نەتەوەیێن جیهانێ دا پەیدابکەن. ئەڤ نڤیسینە ل سالا 1795ێ بەربەلاڤبوویە، پشتی 125 سالان و پشتی شەڕێ جیهانی یێ یەکێ ژ نوو یەکێتیا نێڤدەولەتی هاتە دامەزراندن.

ل دووڤ دا و پشتی شەڕێ جیهانی یێ دووێ نەتەوەیێن یەکگرتی جهێ وێ گرت. ب ڤی ڕەنگی ئەم دشێین بێژین کانت بابێ مەزن یێ هزرا نەتەوەیێن یەکگرتی یە. مەرەما کانتی ئەو بوو "ئەقلێ کریار"ی یێ مرۆڤی دشێت وەلاتان ژ وی بارێ سروشتی دەربێخیت یێ کو بەردەوام دبیتە ئەگەرێ پەیداکرنا شەڕێن نوو و د هەمان دەم دا دشێت ڕژێمەکا نێڤدەولەتی پێکبینیت کو نەهێلیت ئێدی شەڕ چێببن. هەر چەندە ڕێکا دامەزراندنا یەکێتیا نێڤدەولەتی یا دوورە، لێ ئەرکێ ل سەر ملێن مرۆڤایە پێکۆلێ بکەن ئاشتیا بەردەوام ل سەر ئاستێ جیهانێ پەیدا بکەت. ئەڤە ل دەڤ کانتی ئارمانجەکا دوور بوو. لێ ئەم دشێین بێژین تا ڕاددەیەکی بلندترین ئارمانجا فەلسەفێ بوو. ژ بلی ڤێ چەندێ، ئەز هێشتا یێ ل لوبنانێ.

دگەل سلاڤێن بابێ تە

سۆفیایێ ئەو کاغەز کرە د بەریکا خوە دا و بەرەڤ مالێ چوو. ئەلبێرتۆی ئەو ژ دیتنا هەر تشتەکێ دناڤ دارستانێ دا ئاگەهدار کربوو. لێ ئەو نەدشیا وێ هرچوکا بچووک ب تنێ بهێلیتە دناڤ دارستانێ دا و هەتا هەتایێ ل دووڤ وێنەیێ دناڤ خودیکا هێلدێ بگەڕیت.

# ڕۆمانتیزم

...ڕێکا ڤەشارتی بەرەڤ ژ ناڤ دا دچیت...

**هێلدێ هێلا ئەو فایلا مەزن بکەڤیتە د کوشا وێ دا و پاشی بکەڤیتە سەر ئەردی.**

**ژوورا وێ ڕۆهن ببوو. دەمێ تەماشەی دەمژمێرا خوەکری، یا نێزیکی سێی شەڤێ بووی. وێ ڕوویێ خوە بۆ ڕەخێ دی بادا و پێکۆل کر بنڤیت. ئەرێ بۆچی بابێ وێ کچا کولاڤ سۆر و هرچوکێ بچووك ئینانە دناڤ چیرۆکێ دا؟**

**ئەو هەتا ڕۆژا دی ل دەمژمێر یازدەی سپێدێ ما د خەو، دوولیا وێ وەلێکر هەستپێبکەت ب درێژاهیا شەڤا بوری وێ گەلەك خەون ددیتنە، لێ خو خەونەك نەدهاتە بیرا وێ، دا بێژی ئەو ل جیهانەکا دی بوو.**

**ژ بۆ ئامادەکرنا تێشتێ چوو خوارێ، وێ دیت دایکا وێ بەدلەکا شولی یا رەنگ شین کریە بەر خوە داکو بەلەما مەزن پاقژکربایە و ئامادەکربا بۆ گەشتگرنێ دناڤ دەریاچێ دا بەری کو بابێ وێ ژ لوبنانێ بزڤڕیتەڤە هەرچەندە کو بەری هینگێ وێ چ گەشت پێ ئەنجام ژێ نەدابوون.**

- **"تە دڤێت بهێیە خوارێ و هاریکاریا من بکەی؟"**
- **" لێ پێدڤیە بەری هینگێ پیچەکێ بخینم، تە دڤێت چایێ و لەفەکێ وەك بەرفراڤینك بۆ تە دگەل خوە بینمە خوارێ؟"**

- **"ڤێجا بەرفراڤینك چیە؟"**

**هەر تشتێ کەفتیە بەرچاڤێن هێلدی خوار و پاشی بلەز زڤڕی ژوورا خوە و چوو سەر تەختێ خوە ڕوونشت و دەستێ خوە هاڤێتە فائیلا چیرۆکا سوفیایێ و دەست ب خواندنێ کر.**

پشتی سۆفیایێ خوە ل بن پەڕژانێ باخچەی خشاندی، خوە دناڤ وی باخچەی دا دیت یێ کو ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان د گەل باخچەی عەدەنێ هەڤبەر دکر.

سۆفیایێ بەرێ خوە دا ناڤ باخچەی، ژ ئەگەرێ باڕۆڤە و بارانا دوهی هاتی، چەندین بەلگ و چەقێن شکەستی یێن دارا کەفتبوونە واران. هۆسا دیارە پەیوەندیەك دناڤبەرا باڕۆڤە و چەقێن شکەستی یێن داران و هەڤدیتنا وێ دگەل کچا کولاڤ سۆر و هرچوکێ بچووك دا هەبوو.

سۆفیا بەرەڤ لایێ جۆلانکێ ڤە چوو، بەلگێن وەریای و چەقێن شکەستی یێن داروباری ل سەر ڕاکرن و پاقژ کر، خوشبەختانە جۆلانکا وێ ب پلاستیکی هاتبوو نخافتن، ژبەر هندێ پێدڤی نەدکر دگەل هەر باران بارینەکێ ژێڤەکەت و ببەتە د ژوور ڤە.

پاشی زڤڕی مال و دیت دایکا وێ ژی ژ سەر کاری زڤڕیە مال و هندەك شیشێن سودایێ دکرنە د بەفرگرێ دا و کێکەك و هندەك مەعکەرونێن بادای ژی ل سەر مێزا خوارنێ دانابوون.

سۆفیایێ پرسیار ژێ کر: "ئەرێ تو ل هیڤیا هندەك مێهڤانای؟

- "نەخێر. ئەز دزانم ئاهەنگا جەژنا بوونا تە ل ڕۆژا شەمبیا بهێتە، لێ دگەل هندێ من پێخوشە ئەڤرۆکە ژی تشتەکی بکەین."

- "ئەڤرۆکە؟"

- "بەلێ، من و دایك و بابێن جوانا ژی یێن داخواز کرین."

سۆفیایێ سەرێ خوە هەژاند و گوت: "باشە، نەخاسم ئەگەر ئەڤ چەندە جهێ خوشحالیا تە بیت."

مێهڤاێن ئاهەنگێ دەمژمێر حەفت گەهشتن، تا ڕادەیەکی مێهڤانداری یا فەرمی بوو، چونکی دایکا سۆفیایێ و دایك و بابێن جوانایێ کێم جاران سەرەدانا هەڤدوو دکر. سۆفیا و جوانا ب هێجەتا نڤیسینا داخوازنامێن ئاهەنگا ڕۆژا شەمبیێ، چوونە د ژوورا سۆفیایێ ڤە، ژبەرکو وان بڕیار دابوو ئەلبێرتۆ کنوکسی ژی داخواز بکەن، وان ناڤێ ئاهەنگێ کرە "پێشوازیا فەلسەفی دناڤ باخچەی دا"، ئەڤ چەندە پێشنیارا سۆفیایێ بوو چونکی ئێدی ناڤکرنا ئاهەنگان ببوو تشتەکێ بەربەلاڤ دناڤ خەلکی دا.

پشتی دوو دەمژمێران، کەنی و سحبەتێن خوش، ئەو شیان شێوازێ داخوازنامێ ب ڤی ڕەنگی بداڕێژن.

هێژایان:
پێخوشحالین هەوە داخواز بکەینە ئاهەنگا پێشوازیا فەلسەفی ل ناڤ باخچەی مالا مە ل ڕۆژا 23 خزیرانێ "هەڤدەم دگەل جەژنا قەشە یوحەنای" ل دەمژمێر حەفتی ئێڤاری، تاخێ *کلۆڤەر*.
هیڤیدارین د ڤێ شەڤبیریێ دا نهێنیا ژیانێ ئاشکەرا بکەین.
هیڤیدارین جلکێن گەرم و بیروبۆچوونێن باش دگەل خوە بینن، داکو بشێین مەتەلێن فەلسەفی شرۆڤە بکەین، جهێ داخێیە ئەم نەشێین چ ئاگران هەلکەین، ژبەرکو مەترسی بۆ سەر دارستانێ هەیە. لێ هەر کەسەك دشێت ئاگرێ ئاشوپا خوە ب ئازادی بلند بکەتە بەر ئەسمانی. دناڤ ئامادەبوویان دا، دێ فەیلەسۆفەکێ ڕاستەقینە بەرهەڤ بیت، ژبەر هندێ دێ ئاهەنگەکا گەلەك تایبەت بیت.
تێبینی: هاتنا ڕۆژنامەڤانان قەدەغەیە.

دگەل ڕێز و سلاڤێن
جوانا ئینگەربریگستن "ڕێکخەرا ئاهەنگێ"
سۆفیا ئاموندسن "خوەدانا ئاهەنگێ"

هەردوو کچ چوونە دەڤ کەسوکارێن خوە ل خوارێ کو سەقایێ دانوستاندنا وان ل دەمێ ئامادەنەبوونا وان نەهند یێ گەرم بوو. سۆفیایێ کارتا داخوازنامێ کو ب دەست خەتەکێ جوان نڤیسابوو، داڤ دایکا خوە و گوت: "ئەگەر زەحمەت نەبیت هەژدە دانەیان ژێ کوپی بکە."

ئەڤە نە جارا یەکێ بوو سۆفیا داخواز ژ دایکا خوە بکەت تشتەکی بۆ وێ ل جهێ کارێ خوە کوپی بکەت. دایکا وێ ئەو کارتە خواند و داڤ شیرەتکار ئینگەربریگستنی.

- "فەرمووو، ب چاڤێن خوە ببینن... وان ئاگەهـ ژ خوە نینە."
- "بەلێ ب ڕاستی یا بالکێشە."

وی زەلامی ئەڤ گوتنە گوت و پاشی کارت داڤ هەڤژینا خوە و بەردەوامی دا ئاخڤتنا خوە.

- "ب ڕاستی دێ پێخوش بم ئەگەر من ژی داخواز بکەن."

پاشی گەرا دایکا جوانایێ هات و ب حێبەتی ڤە گوت: "من ژی دڤێت ل ڤێ ئاهەنگێ یا ئامادە بم. دێ سۆفیا مە ژی داخواز بکە."

- "باشە، هب ڤی ڕەنگی ئەز دێ پێدڤی ب بیست کوپیان بم، دادێ."

جوانایێ لێ کرە ڤێژی: "تو یا دینی؟"

بەری سۆفیا بچیتە سەر جهێن خوە یێن نڤستنێ، بۆ ماوەیەکی د پەنجەرکێ دا ڕاوەستیا و بیرا خوە ل وێنەیێ ئەلبێرتۆ کنوکسی ئینا دەمێ بۆ یەکەم جار بەری هەیڤەکێ دناڤ د تارپاتییێ دا دیتی، نوکە درەنگی شەڤێ یە، لێ ل ڤان شەڤێن هاڤینی دنیا هەتا سپێدێ یا ڕۆهنە.

هەتا بەری سپێدەهیا ڕۆژا سێ شەمبی، چ دەنگوباس ژ ئەلبێرتۆی نەهاتن، بەلێ دگەل چوونا دایکا سۆفیایێ بۆ سەر کاری، زەنگا تێلەفۆنا وان لێدا.

- "ئەلو سوفیا، ئەلبێرتۆ کنۆکس دگەل تەیە."
- "من چ گومان ل سەر دەنگێ تە نینە."

- "ببووره بەری نوکە من دەرفەت نەبوو تێلەفۆنێ بۆ تە بکەم، ژبەرکو ئەز یێ مژوولی ب دوماهی ئینانا پلانا مە بووم، دەمێ مایجەر یێب تە ڤە مژوول، ئەز دشێم ب تنێ ب دروستاهی کار بکەم."

- "سەیرە."

- "مەرەما من ئەوە ئەز دشێم خوە بەرزەکەم، تو تێدگەهی؟ هەتا کو باشترین ئامیرێ چاڤدێرییێ د جیهانێ دا، سنوورێ خوە هەیە. ب تایبەتی ئەگەر یەك کەس ب رێڤە ببەت... ب ڕاستی، کارتا تە گەهشتە دەستێ من."

- "مەرەماتە کارتا داخوازنامێ."

- "تو دوێری تشتەکێ هۆسا بکەی؟"

- "بەلێ، بۆچی نە؟"

- "لێ ئەم نزانین کا شەڤبیریەکا ب ڤی ڕەنگی دێ چ ڕوودەت."

- "ئانکو دێ هێی؟"

- "بێگومان دێ هێم، لێ تە هزرا وێ چەندێ کریە کو د هەمان ڕۆژ دا بابێ هێلدێ ژ لوبنانێ دێ زڤڕیت."

- "ئاها... نەخێر."

- "ئەز دبێژم نە تشتەکێ ژ نیشکەکێ ڤەیە ئەو دەلیڤێ بدەتە تە کو د هەمان ڕۆژا ڤەگەڕیانا وی بۆ بجێرکلی، ئاهەنگا پێشوازیا فەلسەفی ساز بکەی."

- "هەروەکو من گوتیە تە، من ئاگەهـ ژ ڤێ چەندێ نەبوویە."

- "بەلێ پا وی هزرا وێ چەندێ یا کری... هەرچەوا بیت، پاشی ئەم دشێین پتر ل سەر باخڤین. دێ ڤێ سپێدێ شێی هێیە کۆلکێ مایجەری؟"

- "دڤێت گژوگیایێ باخچەی ژێڤەکەم و ب سەروبەر بکەم."

- "پا دا ببەینە دەمژمێر دوو.. ئەڤە بۆ تە یا گونجایە؟"

- "بەلێ."

وەکو هەرجار، ئەڤرۆکە ژی ل دەمێ گەهشتنا سۆفیایێ، ئەلبێرتۆ ل بەر دەرگەهی ڕوونشتبوو.

- "ل ڤێرێ بڕوونە خوارێ. بەری نوکە مە بەحسێ چەرخێ ڕێنیسانسێ و چەرخێ باروك و چەرخێ ڕەوشەنگیریێ کربوو. ئەڤرۆکە دێ بەحسێ چەرخێ ڕومانتیزمێ کەین، کو ب دوماهیك قۆناغا کلتوری یا مەزن یا ئەوروٚپا دهێتە هژمارتن، کچا من، ئەم یێ نێزیکی دوماهیێ دبین."

- "ئەرێ قۆناغا ڕومانتیزمێ هەتا ڤی ڕادەی درێژ بوو؟"

- "ڤێ قۆناغێ ل دوماهیا چەرخێ هەژدێ دەستپێکر و هەتا ناڤەڕاستا چەرخێ بیستێ بەردەوامبوو، بەلێ ل سالا 1850ێ و دووڤ ڕا یا بێ ڕامانە ئەگەر ئەم بەحسێ ل قۆناغەکێ بکەین کو ئەدەب و فەلسەفە و هونەر زانست و میوزیکێ ب خوە ڤە گرتبیت."

- "ئەرێ ڕومانتیزم یەك بوو ژ ڤان قۆناغێن مەزن؟"

- "دهێتە گوتن ڕومانتیزم دوماهیك پێکۆل بوو یا شێوازێ ژیانێ دەستنیشانکری. ل دەستپێکێ ل ئەلمانیا وەك بەرسڤەك ژ بۆ دەستهەلاتا تاکڕەوی و ڕاشیونالیزما چەرخێ ڕەوشەنگیریێ سەرهلدا. دبیت پشتی کانتی و فەلسەفا وی یا ڕاشیونالیزمی یا توند، تەخا گەنجان هەستپێکربیت ئەو پێدڤی ب هەلکێشانا بایەکێ هین و پاقژن."

- "وان چ پێشنیار کر؟"

- "پەیڤ و مانشێتێن نوو، بۆ نموونە، "هەست" و "خەیال" و "ئەزمون" و "سوزداری". ڕاستە هندەك فەیلەسۆفێن چەرخێ ڕەوشەنگیریێ بەحسێ گرنگیا هەستان دکر، ب تایبەتی ژی "ڕوسو"ی، لێ چ کاریگەریا هۆسا مەزن نەبوو ب تنێ ئەو نەبیت د وی سەردەمی دا وەکو ڕەخنەکێ ل تاکڕەویا ئاشکرا یا دەستهەلاتا ڕاشیونالیزمی ل قەلەم ددا، هۆسا پێلەکا بیروبۆچوونێن دەستپێکێ د فەلسەفا ئەلمانیا دا سەرهلدا و بوونە تشتەکێ سەرەکی."

- "ئانکو ئێدی مودێلا کانتی نەما؟"

- "بەلێ و نەخێر. پتریا فەیلەسۆفێن ڕۆمانتیزمی، ڕۆمانتیزما خوە وەك میراتگر یان نەڤیێن کانتی دبینن. کانتی دگوت هندەك سنوور هەنە ئەقلێ مە نەشێت ژێ دەرباز ببیت. هەردیسان ئاماژە بۆ گرنگیا بابەتی د بوارێ زانینێ ددا. ڕامانا ڤێ چەندێ ئەوە هەر کەسەك دشێت ب ئازادی پەیوەندیێن خوە دووبارە دگەل جیهانێ بداڕێژیت و ل دووڤ دلێ خوە و پاشی ئەو ب دیتنا خوە یا تایبەت کەتوارێ و ڕاستیێ شرۆڤە بکەت. لێ ڕۆمانتیزمی

هاتن و زێدەڕویی د ڤێ "ئەز ئەزیێ" دا کر، ئەڤ چەندە ژی بۆ ئەگەرێ پەیدابوونا بیرۆکەیەکا بلیمەت یا هونەری وەك بنەمایێ ڕۆحا ڕۆمانتیزمێ."

- "ئەرێ هژمارەکا مەزن یا بلیمەتان پەیدابوون؟"

- "بۆ نموونە، بتهۆفن. موزیکا وی دەربڕینێ ژ هەست و سوز و حەزێن مرۆڤی دکەت. ب ڤی ڕەنگی موزیکا وی هەڤڕکیا مەزنە هونەرمەندێن چەرخێ باروکی دکەت وەك "باخ" و "هاندل"ی کو موزیکا خوە ل سەر هندەك یاساییێن دەستنیشانکری و هوور دانابوو و ژ بۆ ڕێزگرتن و مەزنکرنا خودای تەرخان کربوو."

- "ئەز ب تنێ ناڤێ ئاوازێن وی دزانم: سوناتا ل بەر ڕۆناهیا هەیڤێ و سەمفۆنیا نەهێ."

- "بەلێ د ڤێ سوناتایێ دا تو هەست ب ڕۆمانسیەتێ دکەی، د سەمفونیا نەهێ ژی کو ب سەمفونیا "قەدەر"ێ دهێـە نیاسین، تو هەست ب سەقایەکێ خەمگین دکەی."

- "بەلێ پا تە گوتبوو فەیلەسۆفێن مرۆڤدوست یێن چەرخێ ڕێنیسانسێ ژی کەسێن تاکخواز و سەربەرخو بوون."

- "بەلێ، گەلەك خالێن هەڤپشك دناڤبەرا چەرخێ ڕێنیسانسێ و ڕومانتیزمێ دا هەنە، بۆ نموونە د بوارێ هونەری دا: د هەردوو قۆناغان دا هۆسا ددیت کو هونەر ڕولەکێ گرنگ د بوارێ مەعریفی یێ مرۆڤی دا دبینیت. ئەڤ چەندە بۆ کانت ژی یا سەیر نەبوو، ب تایبەت دەمێ د زانستێ جوانکاریێ دا پرسیارا ژێدەرێ وێ خوشیێ دکر یا مرۆڤ ژ تشتەکێ جوان وەردگریت. بۆ نموونە جوانیا کەڤاڵەکێ هونەری. ب دیتنا وی، دەمێ ئەم هزرێن خوە د کارەکێ هونەری دا بکەین، ژ بلی وەرگرتنا خوشیێ ژ وی کاری ل چ تشتێن دی نەگەڕین، ل وی دەمی ئەم یێ نێزیکی شێوەیەکی ژ شێوەیێن ئەزمونا "وی تشتی ب خوە" دبین ب تایبەت ئەگەر ئەم ژ چوارچۆڤەیێ هزرێن خوە یێن سنووردار بدەرکەڤین."

- "باشە، ئانکو هونەرمەند دشێت بگەهیتە تشتەکی کو فەیلەسۆف نەشێت دەربڕینێ ژێ بکەت؟"

- "هەر چ نەبیت، ئەڤە تێگەهشتنا ڕومانتیزمان بوو. لێ ب دیتنا کانتی، هونەرمەند شیانێن خوە یێن مەعریفی ب ئازادی بکاردئینیت و دەردبڕیت. هوزانڤانێ ئەڵمانی "شیللەر" ژی بەردەوامیێ ب هزروبیرێن کانتی ددەت دەمێ دبێژیت چالاکیێن هونەرمەندی

وەكو یاریەكێ نە، مرۆڤ ژی ب تنێ ل وی دەمی یێ ئازادە دەمێ یاریێ دكەت، ژ بەركو د وی دەمی دا یاسایێن تایبەت ب خوە ڤە دادرێژیت. ب باوەریا ڕومانتیزمان، ب تنێ هونەرمەند دشێن مە ل وی تشتی نێزیك بكەن یێ كو نەهێتە دەربڕین، هندەكێن دی زێدەتر دچوون و هونەرمەند دگەل خودای هەڤبەر دكر."

- "ئەڤ چەندە نە یا سەیرە. هونەرمەد ژی كەتوارێ خوە یێ تایبەت دئافرینن هەروەكو كا چەوا خودای گەردوون ئافراندی."

- "هونەرمەندێ ئاشوپەكا داهێنەر هەیە. ئەو ب شیانێن خوە یێن داهێنانێ دشێت سنوورێن دناڤبەرا خەون و ڕاستیێ دا نەهێلیت و لادەت. "نۆفالیس" كو یەك ژ بیلمەتێن سەردەمێ ڕومانتیزمێ بوو، دبێژیت "جیهان دبیتە خەون و خەون دبیتە جیهان". دەمێ ئەو ل سالا 1801ێ مری، ڕومانەكا نەتەمامكری ب ناڤێ "هێنریك فون ئوفتەر دینگن" ل پشت خوە هێلا، لێ ڕۆمانا وی ناڤودەنگیەكا مەزن پەیداكر.

ئەڤ ڕۆمانە بەحسێ گەنجەكی ب ناڤێ هێنریك دكەت كو پشتی د خەونێ دا "گولا شین" دبینیت، ئێدی ژیانا خوە تەرخان دكەت ژ بۆ لێگەریانا ڤێ گولێ و هەموو هیڤیا وی دبیتە دیتنا ڤێ گولێ. ئەڤە هەمان ئەو بیرۆكە بوو یا شاعرێ ئینگلیز "كولیردیج" ژی ب ڤی ڕەنگی دەربڕینێ ژێ دكەت:*

دێ چ ڕوودەت دەمێ تو یێ نڤستی بی؟

و دێ چ ڕوودەت، دەمێ تو یێ نڤستی خەونەكێ بینی؟"

و دێ چ ڕوودەت، ئەگەر تو د خەونا خوە دا چوویە بەهەشتێ و گولەكا جوان و سەیر بكەی؟

---

* دەقێ هوزانێ یێ ڕەسەن

What if you slept?

And what if، in your sleep، you dreamed?

And what if ،in your dream، you went to heaven and there plucked a strange and beautiful flower?

And what if، when you awoke، you had the flower in your hand?

Ah ،what then?

و دێ چ ڕوودەت، دەمێ تو هشیار دبی، تو وێ گولێ د دەستێ خوە دا ببینی؟

ئاهـ، پاشی دێ چ ڕوودەت؟

- "دەربڕینەکا جوانە."

- "ئەڤ غەریبی و لێگەریانا تشتەکێ دوور و نەدیار، سیمایەکێ بیرتیژیا ڕومانتیزمان بوو. جار جار ژی حەزا ڤەگەڕیانا چەرخێن کەڤن دکر. بۆ نموونە بۆ چەرخێن ناڤەڕاست، یان چەرخێن ڕێنیسانسێ. هەردیسان فەیلەسۆفێن ڕومانتیزمی دڤیا ل دووڤ شوونوارێن کەلتورێن دوورتر ژی بچن، بۆ نموونە کەلتور و ڕۆحانیەتا "سۆفیگەریا" ڕۆژهەلاتی. هەردیسان شەڤێ و ڕۆناهیا ل دەمێ ڕۆژئاڤابونێ و ڕۆژهەلاتنێ و هەموو تشتێن سەر سروشتی دا سەرنجا وان ڕادکێشا، زێدەباری دیاردەیێن شەڤێ."

- "ئەرێ گرنگترین فەیلەسۆفێن ڕومانتیزمی کی بوون؟"

- "ل دەستپێکێ ڕومانتیزم وەك دیاردەیەکا باژێری سەرهلدا کو یا هەڤدەم بوو دگەل بەلاڤبوونا کەلتوری ل پتریا باژێرێن ئەورۆپی ل نیڤا یەکێ یا چەرخێ نوزدێ، ب تایبەت ل ئەلمانیا. شێوەیێ بەربەلاڤ یێ ڕومانتیزمێ گەنج بوون و پتریا وان ژی قوتابی بوون. وان گەنجان دیتنەکا نوو بۆ ژیانێ هەبوو کو دژی تەخا بورجوازی بوو تا وی ڕادەی وان پولیس یان ئەو خانما ژوورەکا مالا وێ ب کرێ دهێتە گرتن ب کەسەکا "بورجوازی یا بچووك و پیس" یان ژی ب "دوژمن"ا خوە ل قەلەم ددا."

- "ئەگەر ئەز ل وی سەردەمی ژیابام، ئەز نەدوێریام ژوورەکێ ب دەمەڤ ڕومانتیزمەکی ب کرێ."

- "ل سالا 1800ێ یەکەمیێن بەرەبابکێ ڕومانتیزمێن گەنج پەیدابوون. ئەم دشێین بێژین ئەو یەکەمین شۆرەشا گەنجان بوو ل ئەورۆپا. نوکە ژی ئەم دشێین پشتی 150 سالان، چەندین ساخلەتێن هەڤپشك دناڤبەرا ڕومانتیزم و کەلتورێ هیپی دا دیار بکەین."

- "بۆ نموونە: گول و پرچا درێژ و ژەنینا گیتاڕی و تەمبەلیێ؟"

- "بەلێ، ڕومانتیزمان دگوت بەتالی نمونەیا بلیمەتیێ یە و تەمبەلی ژی باشیا ڕومانتیزمێ یە. وان ب ئەرکێ ل سەر ملێن خوە دزانی کو ژیانێ تاقی بکەن، یان ژێ برەڤن

و بەرەڤ خەونان ڤە بچن. ژبەرکو ژیانا سادە یا ڕۆژانە ب تنێ بۆ بورجوازییێن بچووك یا باشە."

- "ئەرێ ڕومانتیزمێن نەڕویجی ژی هەبوون؟"

- "بەلێ. ویرگیلاند و ویلهاڤن. هزرا ژیانا ڕومانتیزمێ دناڤ ویرگیلاندی دا هەبوو، ئەو کەسەکێ عاشق بوو لێ خوشتڤیا وی "ستیلا" ئەوا هەموو هوزانێن خوە پێن ئەڤینیێ پێ ڤەهاندین، وێنەیەکێ دوور و مەحال و بوو نەدگەهشتێ، هەروەکو کا چەوا نوفالیس ببوو عاشقێ گولا شین و نەگەهشتبوویێ. ئەڤ چەندە سیمایەکێ بەرچاڤ یێ ڤۆناغا ڕومانتیزمێ بوو. بۆ نموونە، نوفالیسی کچەکا چواردە سالی دەستنیشانکر، لێ دەمێ ژیێ وێ گەهشتیە پازدە سالان ب چەند ڕۆژەکان، ئەو کچ مر، لێ نوفالیسی ب درێژیا ژیانا خوە بەردەوام حەز ژێ دکر."

- "تە گوتی دەمێ ژیێ وێ گەهشتیە پازدە سالیێ مر؟"

- "بەلێ."

- "ژیێ من ژی نوکە پازدە سال و چوار ڕۆژن."

- "تو ژ ڕاستا وە دبێژی؟"

- "ناڤێ وێ کچێ چ بوو؟"

- "ناڤێ وێ سۆفیا بوو."

- "چ؟"

- "بەلێ..."

- "تو یێ من دترسینی ! ئەڤە ڕێکەفتەکا نەخوشە."

- "ئەز نزانم..، لێ ناڤێ وێ سۆفیا بوو."

- "بەردەوام بە!"

- "نوفالیس ب خوە ب تنێ 29 سالان ژیا، ئەو یەك بوو ژ وان گەنجێن هەر زووی مرین، پتریا ڕومانتیزمان د ژیێ گەنجاتیێ دا دمرین، ب تایبەتی ب نەخوشیا سلێ و هندەکان ژی خوە دکوشت."

- "ئوف... ئای خودا!"

- "ئەوێن بەری 30 سالیێ نەمرین ژی، دەست ژ ڕومانتیزمێ بەرددا، هندەك ژی دبوونە بورجوازییێن خوپارێز."

- "ب کورتی، ئەو چوونە بەرەیێ کەسێن ئاسایی."

- "تو دشێی وەبێژی، لێ دا بزڤڕینە تێگەهێ ڕومانتیزمێ بو حەژێکرنێ. ب ڕەنگەکی ئەم وێنەیێ ئەڤینەکا مەحال ل دەڤ "گوتەی" د ڕۆمانا وی یا ب ناڤێ "ئازارێن وێرزەرێ گەنج" ئەڤا ل سالا 1774ێ بەلاڤکری دبینین کو ئەڤ ڕۆمانە ب خوکوشتنا وێرزەری گەنج ب دوماهی دهێت، چونکی نەشیا بگەهیتە وێ کچا وی دڤیای."

- "ئەرێ ئەڤێ چەندێ هندەك زێدەڕویی تێدا نینە؟"

- "پشتی بەلاڤبونا ڕومانێ ڕێژا خوە کوشتنێ ب شێوەیەکێ بەرچاڤ بلند بوو، ژبەر هندێ بۆ ماوەیەکی ل نەرویچ و سوید هاتە قەدەغەکرن. ئانکو ڕومانتیزمبوونێ ژی مەترسیا خوە هەیە، چونکی هەست و سوز و کارڤەدانێن دژوار دهێنە دناڤ یاریێ دا."

- "ل دەمێ تو بەحسێ ڕومانتیزمێ دکەی، ئەز هزرا خوە کەڤالێن دیمەنێن سروشتی دا دکەم، دارستانێن تاڕی و ڕەش و دناڤ مژێ دا بەرزەبووین."

- "یەك ژ سیماییێن ڕومانتیزمێ حەزا ڤەگەڕیانا سروشتی بوو، ئەڤ سیمایە ژی ژ هژمارەکا دیتنێن بەری هینگێ پێکدهات. بیرا تە ل ڕۆسوی و دروشمێ "ڤەگەڕیان ژ بۆ سروشتی" دهێت. ڕومانتیزم هات و هندەك ڕەهەندێن کەتواری دانە ڤی دروشمی، ب تایبەتی ژی چونکی ڕومانتیزمی یا هەڤدژ بوو دگەل تێگەهشتنا چەرخێن ڕەوشەنگیریێ بۆ تێگەهێ جیهانا ئوتوماتیکی."

- "پتر بۆ من ڕۆهن بکە."

- "ئەڤ چەندە تێگەهشتنا سروشتی وەکو "تشتەکێ کوم" دسەپینیت. ل ڤێرێ فەیلەسۆفێن ڕومانتیزمی دگەل بوچوونا سپینوزا و ئەفلاتۆنی و فەیلەسۆفێن چەرخێ ڕێنیسانسێ وەك جاکوب بۆم، جۆردانو دو برونوی د هەڤڕابوون کو هەموویان دووپاتکر وان هەبوونا خوە دناڤ سروشتی دا تاڤیکریە."

- "ئەرێ ئەو ژی پانتیست* بوون؟"

---

* پانتیست Pantheists ئانکو ئەوێن باوەرێ ب ئێکانەیا خودای هەی.

- "هەر یەك ژ دیكارتی و هیومی جوداهیەكا ڕۆهن و ئاشكەرا دناڤبەرا "ئەز" یا بابەتی و "درێژبوونا "كەتواری دا دیاركر. كانت ژی شیا جوداهیەكا مەزن دناڤبەرا "ئەزێ مەعریفی" و "سروشتی ب خوە" دا دیاركر. ژبەر هندێ وان دگوت كو سروشت "ئەز"ەكێ مەزنە! ڕومانتیزمان ژی زاراڤێ وەكو "ڕۆحا جیهانێ" و "ناخێ جیهانێ" بكاردئینا."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "یەكەم فەیلەسۆفێ ڕومانتیزمی یێ مەزن، ناڤێ وی "فریدریك ویلهالم شیلنگ" بوو ئەوێ دناڤبەرا سالێن 1775 هەتا 1854ێ دا ژیای. وی پێكۆل دكر جوداهیا دناڤبەرا "مادەی" و "ڕۆح"ێ دا لادەت، ژبەركو ب دیتنا وی، سروشت هەموو دەربڕینەكا ڕەهایە بۆ ڕۆحا جیهانێ".

- "ئەڤە بیرا مە ل سپینوزای دئینیت."

- "شیلنگی دگوت "سروشت ڕۆحەكا بینراوە" و ڕۆحێ ژی سروشتەكێ نەبینراو هەیە. ژبەرهندێ ئەم دشێین ل هەموو جهێن سروشتی دا، هەست ب "ڕۆحەكا ڕێكخەر" بكەین. هەروەسا وی دگوت "مادده" ژی ژیریەكا نڤستی یە".

- "دێ شێی ڤێ چەندێ بۆ من پتر ڕوهن بكەی؟"

- " شیلنگی ڕۆحا جیهانێ د سروشتی دا ددیت، بەلێ د هەمان دەم دا، ڕۆحا جیهانێ ژی د ئاگەهیا مرۆڤی دا ددیت. ب ڤی ڕەنگی، سروشت و ئاگەهیا مرۆڤی دوو شێوەنە دەربڕینێ ژ هەمان تشت دكەن."

- "بەلێ، بۆچی نە؟"

- "ئانكو ئەم دشێین د سروشتی دا و د ناخێ مرۆڤی ژی دا ل دووڤ "ڕۆحا جیهانێ" بگەڕین. ژبەر ڤێ چەندێ نوفالیسی دگوت "ڕێكا ڤەشارتی بەرەڤ ناڤ دا دچیت". مەرەما وی ئەو بوو كو مرۆڤی هەموو گەردوون یێ دناڤ خوە دا هەلگرتی، چوونا دناڤ خوە دا ژی باشترین ڕێكە داكو د نهێنیێن گەردوونی بگەهی."

- "نە هزرەكا خراپە."

- " ڕومانتیزمان هۆسا ددیت كو ئەدەب و زانستێ كارەكی و فەلسەفە بەشەكن ژ تشتەكێ گەلەك مەزن. ئەگەر د ژوورەكێ ڤە بروونیە خوارێ و هوزانەكێ بنڤیسی یان ڤەكۆلینێ ل سەر ژیانا گولەكێ بكەی، یان ژی دووڤچونێ ل دوور پێكهاتەیا بەران بكەی، چ

جوداهی دناڤبەرا وان دا نینە. ژبەر هندێ سروشت میکانیکەکا مری نینە، بەلکو ڕۆحا جیهانەکا زیندی یە."

- "ئەگەر ب ڤی ڕەنگی یێ بەردەوام بی، ل دوماهیکی ئەز ژی دێ بمە کەسەکا ڕومانتیزمی."

- "شیلنگی تیبینیا وەرارکرنێ د سروشتی دا دکر، وی ژ ئەردی دەستپێکر و پاشی بەرەڤ بەران ڤە چوو هەتا گەهشتیە ئاگەهیا مرۆڤی. ئەوی ئاماژە بۆ گوهۆڕینەکا هێدی دکر کو ژ سروشتێ بیانی دەستپێدکەت و هێدی هێدی بەرەڤ فۆرمەکێ ئالۆزتر دچیت، ب شێوەیەکێ گشتی ڕومانتیزمان وەکو لەشەکی بەرێ خوە ددا جیهانێ، ئانکو ڕێك ددا شیانێن ناڤخۆیی گەشە بکەن، هەروەکو وێ گولا پەڕێن خوە ڤەدکەت و وەکو وی هوزانڤانێ هوزانێن خوە پێشکێش دکەت."

- "ئەڤە چەندە بیرا مە ل ئەڕستۆی دئینیت؟"

- "هەلبەت، دیتنێن فەیلەسوڤێن ڕومانتیزمی ژ گەلەك لایەنان ڤە وەکو دیتنێن فەلسەفەیا ئەفلاتۆنیا نوو و ئەڕستۆیە کو وان ژی پتر ب چاڤەکێ ئەندامەکی تەماشەی دیاردەیێن سروشتی دکر پتر ژ وێ چەندێ یا فەیلەسۆفێن مەتریالی یێن میکانیکی دکری."

- "ئەز تێدگەهم کا مەرەما تە چیە."

- "هەمان شرۆڤەکرن ل سەر دیرۆکێ ژی دهێتە بجهئینان. د ڤی بواری دا، فەیلەسۆفێ ڕومانتیزمی یێ ڕۆلەکێ کاریگەر و هەستیار هەی، ناڤێ وی جوهان جوتفرید هیردیر بوو ئەوێ دناڤبەرا سالێن 1744 هەتا 1803ێ دا ژیای. وی دگوت پێڤاژوویا دیرۆکێ بەرهەمێ پرۆژەیەکی یە کو بەرەڤ ئارمانجەکا دیارکری ڤە دچیت. ئەم دشێین بێژین وی دیتنەکا دینامیکی ل هەمبەر دیتنا "ڕاوەستیای" یا فەیلەسۆفێن چەرخێن ڕەوشەنگیریێ هەبوو. هێردیری جەخت ل سەر هندێ دکر کو هەر قۆناغەکا دیرۆکێ بهایێ خوە یێ تایبەت هەیە. ب هەمان شێوە ژی هەموو گەلان تایبەتمەندیا خوە یان ژی "ڕۆحا نەتەوەیی" یا خوە هەیە. هەموو مژار ژی ب هندێ ڤە گرێدایە بزانین ئەرێ ئەم دێ شێین جهێ خوە دناڤ ڤان کەلتورێن جودا جودا دا گوهۆڕین."

- "ئانکو هەروەکو هندێ یە کا چەوا دەمێ مە بڤێت باشتر د کەسەکی بگەهین، دڤێت ئەم خوە بکەینە دناڤ وان کاودانێن ئەو تێدا دژیت. ئاها هۆسا ئەگەر مە بڤێت باشتر وان گەلان بگەهین، پێدڤیە دناڤ کەلتورێن وان دا بژین."

- "ئەڤرۆکە تا ڕادەیەکی ئەڤ چەندە یا بوویە تشتەکێ ئاسایی، بەلێ د قۆناغا ڕومانتیزمێ دا تشتەکێ نوو بوو. ڕومانتیزمان هاریکاریا هەموو نەتەوان ژی دکر کو هەستێ پێناسەیا خوە بهێزتر بکەن، ئانکو نە تشتەکێ ژ نیشکەکێ ڤەیە ل سالا 1814ێ پێکۆلا نەتەوەی یا سەربەخویا نەرویج بگەهیتە گوپیتکا خوە یا پێشکەفتنێ."

- "نوکە ئەز باشتر تێگەهشتم."

- "لێ پێدڤیە دوو شێوەیێن ڕومانتیزمی ژێکجودا بکەین. شێوێ یەکێ دبێژنێ "ڕومانتیزمێن گەردوونی". مەرەم ژێ ئەو کەسن یێن حەزا سروشتی هەی و گرنگی ب ڕۆحا جیهانێ و بلیمەتیا هونەری ددای، ڤی جۆری بۆ جارا یەکێ ل سالا 1800ێ ل باژێرێ "جینا"یێ ئەلمانی سەرهلدا."

- "و شێوێ دووێ؟"

- " شێوێ دووێ ڕومانتیزمێن نەتەوەی بوون کو پشتی هینگێ ب چەند سالان ل باژێرێ هیدلبێرگ سەرهلدا. ڕومانتیزمێن نەتەوەی گرنگی ب دیرۆکێ و زمانێ مللەتی ددا، ئانکو ب هەموو وان تشتێ پەیوەندی ب کەلتورێ مللی ڤە هەی. ژبەر هندێ وان مللەت وەکو لەشەکی ددانا کو هێزوشیانێن ناڤخۆیی ل سەر شین دبن، ئەو ژی وەکو سروشت و دیرۆکێ."

- "بێژە من نو ل کیڤە دژی، ئەز دێ بێژمەتە کا تو کی."

- "ئەو تشتێ ب پلا یەکێ ڕومانتیزمێن گەردوونی و نەتەوی پێکڤە گرێددان. تێگەهێ لەشی "کیان" بوو. ب ڕەنگەکی کو هەر تشتەك لەشەکێ زیندی یە، ڤێجا ئەو تشت چ مللەت بیت یان هوزان یان سروشت بیت. ڕۆحا جیهانێ ژی کا چەوا د سروشت و هونەری دا هەیە، ئاها هۆسا یا د کەلتورێ مللی ژی دا هەی."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "هێردیری کۆمەکا ستڕانێن فلکلوری یێن چەندین وەلاتان کومکرن و د پەرتوکەکێ دا بناڤێ "کۆمەکا ستڕانێن کلاسیکی" بەلاڤکرن و ل باژێرێ هیدلبێرگ ژی دا

خەلك ڕابوون ب كومكرنا سترِان و سەرهاتییێن فلكلوری. ئەرێ تە گوهـ ل سەرهاتیا برایێن گریم بوویە؟"

- "بەلێ،... بەفرا سپی، كولاڤ سۆر و سەندرێلا و هانسل و گریتل."

- "گەلەكێن دی ژی، هەروەسا ل نەرِویج ژی "ئاسبیۆرنسن" و "موە" ڕابوون ب گەریانان دناڤ وەلاتی دا و ئەدەب و فلكلورێ خەلكی كومدكر، ئەفسانەیێن كەڤن و سەرهاتییێن كەڤن و دروشمێن خوداوەندان ئاشكەرا كرن، ژ بلی هندێ ئاوازدانەرێن هەموو ئەوروپا ژی تۆنا فلكلوری دكرە دناڤ ئاوازێن خوە دا و بكاردئینان. ب ڤی شێوەی هەولددان پرەكێ دناڤبەرا موزیكا فلكلوری و میوزیكا جیهانی دا دروستبكەن."

- "موزیكا جیهانی؟

- "بەلێ، ئانكو ئەو ئاوازێن ژ لایێ كەسەكێ دیاركری ڤە ل دووڤ هندەك ڕێسایێن گەلەك هوور هاتینە دانان، بۆ نموونە ئەو ئاوازێن ژ لایێ بتهۆڤنی ڤە هاتینە دانان. لێ موزیكا فلكلوری ژ لایێ كەسەكێ دیاركری ڤە نەهاتیە دانان، بەلكو ژ لایێ خەلكی ب خوە ڤە هاتیە دانان. ژبەر هندێ ئەم نەشێین بزانین ل كیژ سەردەمی سترِانەكا فلكلوری یان ئاوازەكا دیاركری یا فلكلوری هاتیە دانان. ئەم دشێین ڤان جوداهیان ل سەر ئەدەبێ فلكلوری و ئەدەبێ جیهانی ژی بجهـ بینین."

- "ئەدەبێ جیهانی؟"

- "بەلێ، ئەو ئەدەبە یێ ژ لایێ كەسەكێ دیاركری ڤە دهێتە نڤیسین، بۆ نموونە ژ لایێ هـ. س. ئاندرسونی ڤە، لێ ڕومانتیزمان سەرهاتییێن فلكلوری كوم دكرن. ل ڤێرێ ئەم دێ ئاماژێ ب ناڤێ نڤیسەرێ ئەلمانی "أ. ت. أ. هۆفمان" كەین كو وەك پێشەنگێ ڤی جۆرێ ئەدەبی دهێتە نیاسین."

- "من تشتەك ل سەر سەرهاتییێن هۆفمانی یێ گوهلێبوی."

- "ل سەردەمێ ڕومانتیزمان، شێوێ سەرهاتیێ باشترین شێوێ نڤیسینێ بوو، هەروەكو كا چەوا شانۆ شێوێ بەربەلاڤێ هونەری ل سەردەمێ باروكی بوو، ژبەركو سەرهاتی بوارەكێ مەزن ژ بۆ نڤیسەری ڤەدكەن دەربرِینێ ژ ئاشوپا خوە بكەت."

- "ئانكو ئەو دشێت خوە وەكو خوداوەندەكی ببینیت بۆ وێ جیهانا ئەو ژ لایێ خوە ڤە دئافرِینیت."

- "هەلبەت هۆسایە، نوکە ژی ئەز دبێژم ئەم دشێین بابەتێ خوە کورت بکەین."
- "هیڤیدکەم."
- "فەیلەسۆفێن ڕومانتیزمی ڕۆحا جیهانێ وەکو "ئەز"ەکی ددانا کو د حالەتەکێ ئاشوپی دا دشیان دووبارە جیهانێ بئافرینن. فەیلەسۆفێ ئەڵمانی "جوهان گوتلیب فیخت" دبێژیت سروشت بەرهەمێ چالاکیەکا هزری یا بلند و ب ئاگەهە. شیلنگی ژی هۆسا ددیت کو جیهان یا دناڤ خودای دا و خودای ئاگەهە ژ وان تشتان هەیە یێن ئافراندین، لێ د سروشتی دا هندەك تشتێن بەرزە هەنە کو ڕەنگە ل دەڤ خودای ژی د ئاشنا نەبن ژبەرکو خودای ژی "لایەکێ شەڤێ" یێ تاری هەیە."
- "ئەڤ هزرکرنە یا بالکێش و یا ب ترسە ژی ژی، بێرکلی دئینتە بیرا من."
- "ب هەمان شێوە، ئەم بەرێ خوە ددەینە نڤیسەر و بەرهەمێن وان ژی.، سەرهاتی ڕێکێ ددەتە نڤیسەری یاریێ ب لایەنێ خوە یێ ئاشوپی بکەت، ل ڤێرێ ژی ئەو تشتێ هاتیە ئافراندن، ژ ئاگەهیا نڤیسەری دەردکەڤیت. نڤیسەری دشیا ب جۆرەکی بەرهەمێ خوە ببینیت، هەروەکو ژ هێزەکا تایبەتا ژ ناخێ وی دەردکەڤیت، هەروەکو دێ بێژی ئەو یێ چوویە د ڕەوشا نڤستنا موگناتیسی دا."
- "باشە."
- "بەلێ پا نڤیسەر دشێت د هەر ساتەکی دا خوە ژ وێ ڕەوشا جوان و ئاشوپی بڤەڤەتینیت. ئەو ژی ب ڕێکا ئینانا هندەك گوتنێن ب کەنی بۆ خواندەڤانی داکو بیرا وی بینیت کو ئەو تشتێ دخوینیت ب تنێ سەرهاتیەکە نەك ڕاستی."
- "ئەز تێگەهشتم."
- "ب ڤێ ڕێکێ نڤیسەر دشێت بێژیتە خواندەڤانی کو هەبوونا وی یا تایبەت ژی جۆرەکێ سەرهاتیێ یە. ئەم دبیژینە ڤی جۆرێ سەرهاتیێ برینا ئاشوپی "ئایرونیا ڕومانتیزمی*". بۆ نموونە نڤیسەرێ شانۆیێ یێ ڕومانتیزمی یێ نەرویجی "هێنریك ئیبسم" د شانۆگەریا خوە یا ب ناڤێ "Peer Gynt" دا دبێژیت: "کەس ل ناڤەڕاستا بەشێ پێنجێ دا نامریت".

---

* السخرية الرومانسية Romantic Irony

- "ب ڤێ گوتنا وی دا ئەو باش کومێنتا وی یا ئایرونی دبینم کو ب شێوەیەکێ تەمام ئاشوپا شانۆییێ ددەتە لایەکی."

- "ئەڤ دەربڕینە هند یا هەڤدژە کو کو وەل مە دکەت خوە ل سەر هندەك دێران پاڤێژین و بچینە بەشێ ل دووڤ دا."

- "مەرەما تە چیە؟"

- "چ نینە سۆفیا، بەلێ بەری نوکە مە بەحسێ خۆشتڤیا نوفالیسی کر کو هەروەکو تە، ناڤێ وێ سۆفیا بوو، ب تنێ پازدە سال و چوار ڕۆژان ژی ژیا."

- "تو دزانی ئەڤ چەندە من دترسینیت؟"

ئەلبێرتۆی بێی کو چاڤێن خوە بزڤڕینیت، ب بێدەنگی ل جهێ خوە ما، پاشی ل سەر گوتنێن خوە بەردەوام بوو.

- "نابیت تو ژ چارەنڤیسێ خوشتڤیا نوفالیسی بترسی نەکو ب سەرێ تەژی بهێت."

- "چەوا نەترسم."

- "ژبەرکو هێشتا چەندین بەشێن دی یێن ل بەر سینگێ مە ماین."

- "ئەڤە چ ئاخفتنێن بێ ڕامانن تو دبێژی؟"

- "ئەز یێ دبێژم ئەو کەسێ نوکە چیرۆکا سۆفیایێ و ئەلبێرتۆی دخوینیت، دشێت بزانیت کو هێشتا هندەك لاپەڕ یێن ماین وی نەڤەداینە، ژبەرکو هێشتا ئەم یێ ل بەشێ ڕومانتیزمێ."

- "تە ئەز تێکبرم."

- "د ڕاستی دا مایجەری دڤێت سەرێ هێلدێ گێژ بکەت، ئەرێ ما تو نابینی ئەڤە کارێ مرۆڤێن ترسنوکە؟"

- "دێ، ئەڤە تو گەهشتیە دوماهیا ڤی پاراگرافی."

هێشتا ئەڤ گوتنێن ئەلبێرتۆی ب دوماهی نەهاتین، کورکەکێ بچووك ژ ناڤ دارستانێ دەرکەفت و فانۆسکەك د دەستان دا بوو.

سۆفیایێ ب توندی دەستێ ئەلبێرتۆی گڤێشا و گوتی: "ئەڤە کیە؟"

بەلێ وی کوری ب خوه بەرسف دا: "ناڤێ من عەلائەدینە و هەر نوکە ئەز یێ ژ لوبنانێ دهێم."

- "ئەرێ چ دناڤ فانۆسکا تە دایە کورێ من؟"

کوری دەستێ خوه ب فانۆسکێ دا ئینا و بر و دووکێلەکا مەزن ژێ دەرکەفت، هێدێ هێدێ سیمایێ زەلامەکی دناڤ دوکێلێ ڕا دەرکەڤت. ڕیهێن وی هەروەکو یێن ئەلبێرتۆی بوون، کولاڤەکێ شین ژی ل سەری بوو، گوت: "تە ئاگەهـ ژ من هەیە هێلد؟ ئەز دبێژم ئەڤ جارە درەنگە بێژمەتە جەژنا بوونا تە پیرۆزبیت. لێ ب تنێ من دڤێت بێژم بجێرکلی و گزیرتەیا باشورێ نەرویچ ل دەڤ من هەروەکو سەرهاتیەکێ نە. د چەند ڕۆژێن بهێت دا هەڤدوو بینین."

دیسان سیمایێ زەلامی دناڤ دووکیلێ دا بەرزەبوو و هەمو دووکێل چوو دناڤ فانۆسکێ دا، کورکی ژی فانۆسك کرە بن ملێ خوە ڤە و دووبارە بەرەڤ دارستانێ غاردا و بەرزەبوو.

سۆفیایێ ب خورتی گوت: ""ئەڤە...ئەڤ چەندە ناهێتە باوەرکرن."

- "ئەڤە ب تنێ سینەما بوو، ب تنێ."
- "یا بێ مفایە کچا من."
- "بەلێ پا وی ئەجنەی ژی هەروەکو بابێ هێلدێ دئاخڤت."
- "ئەڤە ب تنێ ڕۆحا وی بوو."
- "بەلێ پا..."

- "ئەز و تو و هەمووو تشتێن دەوروبەری مە، ب تنێ یێ دناڤ کووراتیا ئاگەهیا مایجەری دا. نوکە ل وێرێ ئێڤارەکا درەنگە و هەمووو سەربازێن نەتەوێن یەکگرتی یێن نڤستین، ئەو ب خوە ژی چ نەمایە دێ نڤیت، لێ دڤیا پەرتووکا خوە ب دوماهیك بینیت و وەکو دیاری ل جەژنا بوونا هێلدێ پێشکێشی وێ بکەت. ژبەر هندێ خوە ئەڤ زەلامێ بەلنگاز دەمژمێرێن خوە یێن نڤستنێ کێم دکەت."

- "ئەز بێژم ئەز دێ ب تەمامی خوە بدەستڤە بەردەم."

ئەلبێرتۆ و سۆفیا ب بێدەنگی ڕوینشتبوون و بەرێ خوەددا دەریاچێ، ئەلبێرتۆ وەکو بەری هشك ببوو، پشتی هینگێ سۆفیا وێریا دەستێ خوە ل ملی وی بدەت و پرسیار ژێ بکەت: "چیە تو نڤستنی."

لێ وی بەرسڤ دا و گوت: "نەخێر، ل ڤێ جارێ بابێ هێلدێ ب ڕاستی هاتە دناڤ بابەتی دا. دەستپێکا پەیڤێن دوماهیێ، کوپلە هەموو ژ لایێ وی ڤە هاتنە گوتن، شەرم بکەت باشترە، بەلێ ل دوماهیکێ ماسکێ سەروچاڤێن خوە ژێبر و ب تەمامی خوە بۆ مە دا نیاسین، نوکە ئەم دزانین کو ژیانا مە یا دناڤ پەڕتووکەکێ دا و بابێ هێلدێ دڤێت بکەتە دیاری بۆ جەژنا بوونا کچا خوە، تە گوهـ ل من هەیە من گوتی "ل دوماهیێ"، لێ د ڕاستی من وەنەگوتیە بەلکو بابێ هێلدێ ئەو ئاخفتنە ل سەر ئەزمانێ من گوت."

- ""ئەگەر ئەڤ چەندە ڕاستبیت، ل وی دەمی من دڤێت ژ پەڕتووکێ بڕەڤم و ب پەڕێن خوە بفڕم."

- "پلانا من ژی هەر ئەوە، بەلێ بەری ئەڤ چەندە ڕووبدەت، دڤێت دگەل هێلدێ ب باخڤین، هەروەکو تو دزانی ئەو هەموو پەیڤێن مە دخینیت، ل دەمێ ئەم بشێین ژ ڤێرێ بچین، پاشی پەیوەندی پێکرن دێ گەلەك یا ب زحمەت بیت، ئانکو دا ئەم ئەڤێ دەرفەتێ ژ دەست نەدەین."

- "ئەم دێ چ بێژینێ؟"

- "ئەز بێژم نوکە مایجەر یێ ل سەر ئامیرێ چاپکرنێ و چ نەمایە دێ د خەو چیت، هەرچەندە کو هێشتا تبلێن وی ب باشی یێ ل سەر پیتان دهێن و چن."

- "چەند نەخوشە هزرا وێ چەندێ بکەین."

- "ئاها نوکە و د ڤی ساتی دا، دبیت تشتەکی بنڤیسیت و پاشی ژێ پەشێمان ببیت، ژێبرك ژی ل دەڤ نینە داکو پێ ژێببەت. ئەڤە ژی خاڵەکا گرنگ یا پلانا منە، هشیاربی و چ ژێبرکان نەدەیەف مایجەر کناگی!"

- "ئەز ب چ حالێ هەبیت وە ناکەم."

- "هەر نوکە دێ فەرمانێ دەمە وێ کچا دامایی ل دژی بابێ خوە ڕاببیت، دڤێت هەست ب شەرمێ بکەت، چونکی ڕێکێ ددەتە خوە تامێ ژ یاریا بابێ خوە یێ هەژار وەربگریت، ئاخ، ئەگەر بابێ وێ ل ڤێرێ بایە ل وی دەمی دا زانیت کا دا چ ل مە کەت."

- "بەلێ پا ئەو ل ڤێرێ نینە."

- " ڕۆح و هزرا وی یا ل ڤێرێ، بەلێ د هەمان دەم دا لەشێ وی یێ ل لوبنانی، هەموو تشتێن دەووروبەری مە ژ ناخێ مایجەری دزێن."

- "بەلێ ئەو ژ وان تشتان زێدەترە یێن ئەم دبینین."

- "ئەم ژ سیبەرا ڕۆحا مایجەری زێدەتر نینین و نە یا ب ساناهیە سیبەرەك هێرش بکەتە سەر خوەدانێ خوە، سۆفیا، ئەڤ کارە پێدڤی ب زیرەکی و هەڵسەنگاندنێ یە، بەلێ ئەم دشێین کارتێکرنێ ل هێلدێ بکەین. ب تنێ فریشتە دشێن ژ خودای یاخیبن."

- "ئەم دشێین داخوازێ ژ هێلدێ بکەین کو هەر دەمێ بابێ وێ ڤەگەڕیا مال، خوە ل ناڤ چاڤێن وی بدەت و ب دەنگەکێ بلند لێ بکەتە ڤێری و بێژیتی تو ژ مرۆڤەکێ سەختەچی. دشێت بەلەما وی بن ئاڤ بکەت یان ژی بەرچاڤکێن وی بشکێنیت."

- "هەروەسا هێلد دشێت وی بجھ بهێلیت، ئەڤ کارە ژ لایێ وێ ڤە گەلەك بساناهیترە ژ هندێ کو ئەگەر مە بڤێت ژێ برەڤین، ئەو دشێت بۆ هەتا هەتایێ مالا مایجەری بهێلیت و چ جاران نەزڤریت. مایجەر یێ ژ هەژی ڤی سزای یە چونکی ئەو ل سەر حسابا مە یاریا ب خەیالێ دکەت."

- "ئەز دشێم ڤی دیمەنی بینمە پێشچاڤێن خوە، مایجەر د جیهانا مەزن دا دێ دەربەدەر بیت و ل کچا خوە گەڕییێت، لێ هێلد دێ مالێ بجھ هێلیت ژبەرکو نەشێت ئێدی دگەل بابێ خوە بژیت ئەوێ ل سەر حسابا ئەلبێرتۆی و سوفیایێ بۆ کەیفێ چێکەت."

- "بەلێ ڕاست دبێژی، بۆ خوە کەیفێ ژ مە چێدکەت! مەرەما من ئەو بوو بێژم دێ مە کەتە پێتڕانکێن جەژنا بوونا کچا خوە، بەلێ دڤێت ئەم د هشیاری خوە بین، ئەم و هێلد هەردوو."

- "مەرەما تە چیە؟

- "ئەرێ تو یا باشی؟"

- "بەلێ."

- "پێکۆلێ بکە بینە پێشچاڤێن خوە کو ئەو هەموو تشتێن ئەم دبینین د ئاگەهیا کەسەکێ دی دا ڕوودەن. ئەم ئەو ئاگەهین، ئانکو مە ڕۆحەکا تایبەت ب خوە ڤە نینە، بەلکو ئەم ڕۆحا کەسەکێ دینە، د ڕاستیێ دا هەتا ڤێرێ ژ لایێ فەلسەفێ ڤە ئەم د

کەیفخوەشین و چ تشتێن سەیر و عنتیکە تێدا نینە، بەلێ شیلنگ و بیرکلی گەلەك ب هشیاری گوهدارییێ دکەن."

- "ژ ڕاست؟"

- "ئانکو ئەم دشێین بێژین ئەو ڕۆحا بابێ هێلد موللەر کناگێ یە ل لوبنانێ، ئەوێ ڕومانەکێ بۆ کچا خوە دنڤیسیت ، ئەو کچا سپێدێ پەڕتووك ل سەر نڤینێن خوە دیتی و دەست ب خواندنا وێ کری. بەری هینگێ چەندین جاران بابێ وێ ئاماژە ب وێ چەندێ کربوو کو دیاریا جەژنا بوونا وێ ژ وی جۆری یە دشێت دگەل کەسێن دی دابەش بکەت."

- " ئەو چەندە یا ل بیرا من."

- "من دڤێت بێژمە تە: نوکە هێلد یا وی تشتی دخوینیت کو ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان بابێ وێ ل لوبنانێ دئینا پێشچاڤێن خوە ئەز نوکە یێ دبێژمەتە ئەو یێ ل لوبنانێ."

سەرێ سۆفیایێ تێکچوو، پێکۆل دکر وی تشتێ دەربارەی بێرکلی و ڕومانتیزمان گوهلێبووی بینیتە بیرا خوە، بەلێ ئەلبێرتۆ یێ بەردەوام بوو.

- "بەلێ پێدڤی ناکەت ب تنێ ژبەر ڤی ئەگەری، گەلەك دلێ خوە خوش بکەین و بکەینە کەنی، ژبەرکو ئەڤ جۆرێن کەنییێ دبیت ب سەر ستۆییێ خوەدانی دا بشکێن."

- "ستۆییێ کێ؟

- "بێگومان یێ هێلدێ و بابێ وێ... ما کی ژ بلی وان هەیە؟"

- "بوچی دڤێت دلێ وان هندێ خوش نەبیت؟"

- "چونکی تشتەك یێ دبێژتە مە کو ڕەنگە چ ڕاستی بۆ هەبوونا وان ژی نەبیت و ئەو ژی ژ بەرهەمێ داڕێژتنا ئاگەهیا کەسەکێ دی بن."

- "ئانکو چەوا؟"

- ئەگەر ل دەڤ بێرکلی و ڕومانتیزمان ڕێك بچیتێ، ئانکو ل دەڤ وان ژی ڕێك دێ چیتێ، دبیت مایجەر ب خوە وێنەیێ جۆرە سیبەرەکێ بیت د پەڕتووکەکێ دا کو بەحسێ وی و هێلدێ بکەت، بێ گومان بەحسێ من و تە ژی یێ تێدا، چونکی ئەم ژی بەشەکێ بچووك یێ ژیانا وان پێکدئینین."

- "هۆسا دێ گەلەك خراپتر بیت، چونکی ئەم دێ بینە وێنەیێ سیبەرا چەند وێنەیێن سیبەرەکا دی تر."

- "دبیت نڤیسەرەکێ دی ل جهەکێ دی پەڕتووکەکێ دەربارەی مایجەر ئەلبێرت کناگی بنڤیسیت، کو دڤێت پەڕتووکەکێ بۆ کچا خوە بنڤیسیت و ئەو پەڕتوکە ژی دەربارەی کەسەکی یە ب ناڤی ئەلبێرتۆ کنوکس کو وانەیێن فەلسەفی بۆ سۆفیا ئاموندسنێ دهنێریت."

- "تە باوەری ب ڤێ چەندێ هەیە؟"

- "ب تنێ یێ دبێژم کو ئەڤێ چەندێ ڕێك دچیتێ، هۆسا ئەو نڤیسەرە وەکو خودایەکێ ڤەشارتیە بۆ مە، ئەم چ تشتان دەربارەی وی نزانین، هەرچەندە هەموو ئەو تشتێن ئەم دبێژین و دکەین ژ دروستکرنێن وی نە، ئەم یێن کەفتینە د بنێ بیرێ دا."

بۆ ماوەیەکێ درێژ مانە بێدەنگ و پاشی سوفیایێ گوت: "بەلێ ئەگەر ب ڕاستی نڤیسەرەکێ هۆسا هەبیت کو پەڕتووکەکێ دەربارەی بابێ هێلدێ بنڤیسیت، کو ئەو ژی ژ لایێ خوە ڤە پەڕتووکەکێ دەربارەی مە بنڤیسیت."

- "بەلێ، پاشی چ؟

- "هۆسا ئەم دشێین بێژین کو پێدڤی ناکەت دلێ وی ب خوە ژی یێ خوشبیت."

- "مەرەما تە چیە؟"

- "ئەو نوکە یێ هزرێن مە دکەت، بەلێ ما کی دزانیت کو ئەو ژی یێ دناڤ هزرەکا بلندتر دا دەرباس دبیت."

- ئەلبێرتۆی سەرێ خوە هەژاند.

- "بێگومان سۆفیا، هەموو تشت ڕوودەن، ئەگەر ئەڤە ژی ڕاست بیت، ب تنێ ژبەر دیارکرنا ئەڤی بواری ئەڤ هەموو دانوستاندنا فەلسەفی ب مە کر، ل ڤێرێ ژی ئاماژێ ژ بۆ هندێ دکەت کو ئەو ب خوە ژی شێوێ سیبەرەکا بێ دەستهەلاتە و ئەڤ پەڕتووکا کو هێلد و سۆفیا تێدا دژین، د ڕاستیێ دا پەڕتووکەکا فێربوونا فەلسەفێ یە."

- "پەڕتووکا فوتابخانێ؟"

- "ژبەرکو سەرجەمێ وان هەموو دانوستاندنێن دناڤبەرا مەدا، هەموو وان دیالۆگان، سوڤ..."

- "چ...؟"

- "د ڕاستیێ دا هەموو مونولۆژن."

- "هۆسا هەستپێدکەم هەموو تشت یێ دهێنە گوهۆڕین بۆ ئاگەهیێ و ڕۆحێ، دلێ من ژی گەلەك یێ ب وێ چەندێ خوشە کو هێشا مە چەند فەیلەسۆفەکێن دی ماینە، ژبەرکو ئەو فەلسەفا جوانا ژ تالێس و ئەمفیدوکلیس و دیمۆکریتسی دەستپێکری، نابیت ل ڤێرێ ب دوماهی بهێت."

- "نەخێر، ل ڤێرێ ب دوماهی ناهێت، نوکە ئەز حەز دکەم بەحسێ هیگلی بکەم، ئەو فەیلەسۆفێ پشتی ڕومانتیزمان هەموو تشت د هزر و ڕۆحێ دا حەلاندین، پێکۆل دکر فەلسەفێ ڕزگاربکەت.

- "بێژە، بۆ من نەکە مەرەق."

- "دێ چینە د ژوور ڤە ڕوونین

- ، چونکی ئێدی من نەڤێت ڕۆحەك یان وێنەیەکێ خەیالی سحبەتا مە تێکبدەت."

- "سەڤا ژی یێ سار دبیت..."

- "ڕاوەستێ!"

# هیگل

...ب تنێ تشتێ ڕاشیونالیزمی، شیانیێن ژیانێ تێدا هەنە...

ڤائیلا مەزن ژ دەستێن هیلدێ کەڤت و پاشی کەفتە سەر ئەردی، وێ ل سەر جهێن خوە خوە درێژکر و بەرێ خوە دا بانی، هەست ب سەر گێژیێ دکر و هزرێن وێ تێکشیلین.

ب ڤی ڕەنگی بابێ وێ شیا بگەهیتە ئارمانجا خوە و وێ دناڤ هزران دا نقوم بکەت، لێ چەوا شیا ڤێ چەندێ بکەت؟ سۆفیایێ پێکۆل دکر ڕاستەوخو دگەل هێلدێ باخڤیت، ب ئاشکرای داخوازێ ژێ کر ژ بابێ خوە تۆڕە ببیت. د ڕاستیێ دا شیا گومانێ بێختە د سەرێ وێ دا. ئەرێ تو بێژی ئەو پلانا ئەلبێرتۆی و سوفیایێ پەیرەو بکەت و بابێ خوە بجهـ بهێلیت.

بێگۆمان سۆفیا و ئەلبێرتۆ نەشێن دەستێ خوە ل میەکێ پرچا بابێ وێ بدەن، لێ هێلد دشێت. ب ڤی شێوەی سۆفیا ب ڕێکا هێلدێ دشێت نێزیکی مایجەری ببیت.

ئەو دگەل ئەلبێرتۆ و سۆفیایێ یا هەڤڕابوو کو بابێ وێ گەلەگ کوور یێ چوویە دناڤ ڤێ یاریا خوە ڤەشارتنێ دا. خوە هەکە وی کەسایەتیا وان هەردووکان ژێ داڕێژت بیت، لێ دگەل هندێ ژی ئەو دشێت سنوورەکی بوو کریارێن وی دگەل وان بدانیت.

**سۆفیا و ئەلبێرتۆ یێن بەلنگاز، ب چ شێوا نەشێن بەرهەنگاریا خەیالا مایجەری بین، هەروەکو چەوا شاشەیەك نەشێت بەرهەنگاری وی فلمی ببیت ئەویّ ل سەر دهێتە پێشکێشکرن، ئەو ژی ب هەمان شێوە.**

**هێلدێ ب ڕاستی دڤیا ل وی دەمێ بابێ دهێتە مال وانایەکا باش بدەتێ! ئەوێ د سەرێ خوە دا خوە ئامادەدکر ژ بۆ دەمێ دهێت دنیایێ ب سەری دا بینیت.**

**ئەو بەرەڤ پەنجەرێ ڤە چوو و بەرێ خوە دا بەر لێڤێن ئاڤێ... دەمژمێر نێزیکی دوو بوو، پەنجەر ڤەکر و بۆ بەرەڤ لایێ بەندەری ڤە کرە هەوار.**

- **"دادێ!"**

**بلەز دایکا وێ دەرکەڤت.**

- **"پشتی دەمژمێرەکا دی دێ بو تە خوارنێ ئینم، باشە؟"**
- **"بەلێ، باشە."**
- **"من دڤێت پیچەکێ ل سەر هیگلی بخوینم."**

ئەلبێرتۆ و سۆفیا ل سەر کورسیکێن نێزیکی وێ پەنجەرا هنداڤی دەریاچێ ڕوونشتنە خوارێ، ئەلبێرتۆی دەست ب ئاخفتنێ کر.

- "جۆرج ولیەم فردریك هیگل کورێ ڕاستەڤینەیێ سەردەمێ ڕومانتیزمێ بوو، تا ڕادەیەکی ئاگەهـ ژ پێشکەڤتنێن هزرا ئەڵمانی هەبوو. ئەو ل سالا 1770ێ ل باژێرێ "شتوتگارت" ژ دایك بوویە، د ژیێ هەژدە سالیێ دا ل باژێرێ "توبینگن" دەست ب خواندنا لاهوتێ کریە. هەر ژ سالا 1799ێ دگەل شیلنگی دا ل باژێرێ "جینا" کارکریە ب تایبەت دەمێ بزاڤا ڕومانتیزمێ د گوپیتکێ دا. پشتی ل باژێرێ جینا بوویە مامۆستا، چوو زانکۆیا "هیدلبێرگ" و ل وێرێ بوو پرۆفیسور کو ل وی دەمێ بنگەهێ ڕومانتیزما نەتەوەی یا ئەڵمانی بوو. ل سالا 1818ێ ژی ل زانکویا "بەرلین"ێ وەکو پرۆفیسۆر هاتە دامەزراندن. د هەمان دەم دا بەرلین هێدی هێدی دبوو پایتەختێ ڕەوشەنبیریا ئەڵمانیا. ئەو ل سالا

1831ێ ب نەخوشیا کولێرایێ مر، ئەو ژی کو پشتی ڕێبازا هیگلینیزمێ ل پتریا زانکۆیێن ئەڵمانی جەماوەرەکێ باش ل دور خوە کومکری.

- "ئانکو ل دوماهیکێ، ئەو بسەرکەفت."

- "ب تایبەتی ژی ڕۆلێ وی وەکو فەیلەسۆف کو شیا هەموو ڕێبازێن جودا جودا یێن ڕومانتیزمێ کوم بکەت و پێشبێخیت. هەروەسا یێ دوودل نەبوو دەمێ ڕەخنەیەکا توند ل فەلسەفا شیلنگی گرتی."

- " وی ڕەخنە ل چ دگرت؟"

- "شیلنگی و ڕومانتیزمێن دی تەماشەی ڕۆحا جیهانێ دکر وەك ژێدەرێ ژیانێ. هیگلی ژی زاراڤێ ڕۆحا جیهانێ بکاردئینا، لێ ب ڕامانەکا جوداتر. دەمێ هیگل بەحسێ بیرۆکەیا جیهانێ یان ئەقلێ جیهانێ دکەت، مەرەما وی ژێ هەموو ئەو دیاردەنە یێن سیمایەکێ مرۆڤایەتیێ هەی. ژ بەرکو ژ هەموو بونەوەرێن زیندی ب تنێ مرۆڤی شیانێن هزرکرنێ هەنە. ب ڤی ڕەنگی ئەم دشێین بەحسی پێشکەفتنا بیرۆکەیا جیهانێ ب درێژاهیا دیرۆکێ بکەین. دڤێت ئەم دیسان ئەم ژبیر نەکەین کو ئەم یێ بەحسێ ژیانا هزر و کەلتورێ مرۆڤایەتیێ دکەین."

- "هەروەکو ئەز تێدگەهم، ئەڤ بیرۆکە کێمتر یا شێلی و نەدیار بوو. ئێدی وەکو زیرەکیەکا نڤستی دناڤ داروبەران دا نەما."

- "ل بیرا تە یە دەمێ کانتی بەحسێ تشتەکی دکر کو وی ب خوە دگوتێ "ئەو تشت ب خوە"، هەرچەندە وی دگوت مرۆڤ نەشێت د کووراتیا نهێنیا سروشتی بگەهیت، لێ دگەل هندێ ژی دگوت جۆرە ڕاستیەك هەیە کو مرۆڤ نەشێت بگەهیتێ. هیگلی دگوت ڕاستیا خویی یا سەرەکی یە، هەروەسا باوەری ب هەبوونا ڕاستیا ژ دەرڤە یان د سەر ئەقلێ مرۆڤی دا نەبوو. ب باوەریا وی هەموو زانین مەعریفەت ژی، مەعریفەتا مرۆڤیە."

- "ب کورتی، دڤیا جارەکا دی فەلسەفێ بینیتە سەر ئەردی."

- "ئەم دشێین وەبێژین، لێ ژبەرکو فەلسەفا هیگلی گەلەك یا ئالۆز و فرەشێوەیە، ئەم دنەچارین ئاماژێ ب هندەك خالێن سەرەکی و گرنگ بدەین. بۆ مە یا ب زەحمەتە دووپات بکەین کو هیگل خوەدانێ فەلسەفا خوە یا تایبەتە، ژبەرکو ئەو تشتێ زاراڤێ فەلسەفێ ل دەڤ هیگلی، ل بەری هەموو تشتان، وەکو ڕێبازەکێ بوو ژ بۆ تیگەهشتنا

پێڤاژوویا دیرۆکێ. ژ بەر ڤێ هندێ تا ڕادەیەکی یا ب زەحمەتە ئەم بەحسێ هیگلی بکەین بێ کو ئاماژێ ب دیرۆکا مرۆڤایەتیێ ژی بدەین. هەرچەندە فەلسەفا وی چ تشتان دەربارەی هەبوونا سروشتی دیارناکەت، لێ مە فێر دکەت ب شێوەیەکێ چالاك هزر بکەین."

- "دبیت ئەڤە ژی تشتەکێ خراب نە بیت."

- "خالا هەڤپشك دناڤبەرا هەموو سیستەمێن فەلسەفی یێن بەری هیگلی ئەو بوو کو پێکۆلا ڤەدیتنا هندەك پیڤەرێن جێگیر ژ بۆ دەستنیشانکرنا بوارێ زانینێ ل دەڤ مرۆڤی دکر. ئانکو هەتا چ ڕادەی مرۆڤ دشێت د جیهانێ بگەهیت. ئەڤ خالە ل سەر دیکارتی و سپینوزای دهێتە بجهـ ئینان هەروەکو کا چەوا دگەل کانت و هیومی ژی دگونجیت، هەر یەك ژ وان پێکۆلا دەستنیشانکرنا بنەمایێن زانینا مرۆڤی دکر لێ وان خوە د کرە دناڤ هندەك کاودانێن بەروەخت دا نەك یێن جێگیر و هەتا هەتاییێ."

- "ئەرێ ما ئەڤە نە یەك ژ ئەرکێن سەرەکی یێن ل سەر ملێن فەیلەسۆفی یە؟"

- "هیگل د وێ باوەریێ دایە کو ئەم نەشێین خوە دگەل ڤێ چەندێ بگونجینین، ژبەرکو ئەو تشتێ بنەمایێن زانینا مرۆڤی دەستنیشان دکەت ژ بەرەبابکەکی بۆ بەرەبابکەکێ دی دهێتە گهۆڕین و پێش دکەڤیت. ژبەر هندێ ئەم نەشێین بەحسێ "ڕاستیێن هەتا هەتایی" بکەین و چ ڕاستی بۆ هەبوونا ئەقلەکێ هەردەم مودێرن نینە، لەوڕا ڕێسایا یەکانە کو فەیلەسۆف دشێت ژ وێرێ دەستپێبکەت، دیرۆك ب خوەیە."

- "کا ڕاوەستێ، پێدڤیە پتر بۆ من ڕۆهن بکەی، دیرۆك بەردەوام یا د گوهۆڕینێ دا، ئەرێ چەوا چێدبیت مە ڕێسایەکا نەگوهۆڕ هەبیت؟

- "ڕووبار ژی هەردەم یێ د گوهۆڕینێ دا، لێ دگەل هندێ ئەم بەحسێ وی دکەین، بەلێ پا تشتەکێ بێ ڕامان نینە ئەگەر پرسیار بکەین: کیش خالا ڕووباری پتر هەژی هندێ یە وەك "ڕووبار" ب ناڤ بکەین."

- "نەخێر، ژبەرکو ڕووبار ب درێژاهیا بەردەوامبوونا خوە هەر هەمان ڕووبارە."

- "باشە. ل دەڤ هیگلی دیرۆك وەکو ڕووبارەکی یە. ب درێژاهیا هەموو ڕووباری، هەتا بچووکترین لڤینیا ئاڤێ ل ڤێرە و وێراهە یا ڕووباری دکەڤیتە بن کاریگەریا هێزا ڕێژتنێ و پێلێن ئاڤێ یێن ل سەر ڕوویێ ڕووباری، زێدەباری هەڕی و بەرێن دناڤ ئاڤێ دا و ئاستێ ڕوویێ وێ یێ سەری دەمێ تو ل سەر د ڕاوەستی و بەرێ خوە ددەیێ."

- "ئەز بێژم ئەز تێگەهشتم."

- " دیرۆکا هزران ژی وەکو ڤی ڕووباری یە. هەموو هزر وەکو پێلان دگەل دابونەریتێن مرۆڤان گەهشتینە مە، زێدەباری ئەو کاودانێن ماددی یێن سەردەمێ مە دەستنیشان دکەن، بەشداریێ د دەستنیشانکرنا شێوەیێ هزرکرنا مە دا دکەن. ژبەر هندێ تو نەشێی بێژی هزرەکا دیارکری یا ڕاستەخو بۆ هەتا هەتایێ یا گونجایە، لێ دبیت هزرەك ل وی جهی و سەردەمێ نوکە تو تێدا دژی یا ڕاست و گونجای بیت."

- "یا ل ڤێرێ هۆسا بۆ مە دیار دبیت نە یا گرنگە تشتەك یێ شاش یان دروست بیت، مادەم ل دوماهیێ ئەنجامێ وان هەردووکان وەکو یەکە!"

- "نەخێر. ل دووڤ شێوازێ ئەفسانەیی، هەر تشتەك دبیت یێ شاش یان دروست بیت. بۆ نموونە، ئەگەر پشتگیریا هزرا بەندایەتیێ ل دوماهیا چەرخێ نوزدێ بکەین و تە بینینە پێشچاڤێن خوە، د باشترین کاودان دا، تو دێ وەکو لێبوکەکی هێیە پێشچاڤێن مە. لێ هەکە بەحسێ بەری دوو هزار و پێنج سەد سالان بکەین، ئەم ب وی چاڤی ناسەحەکەینە تە، سەرەڕای هەبوونا هندەك بیرۆکەیێن پێشکەڤتنخواز یێن دژی بەندایەیێ پەیدابووین. دا بەحسێ نموونەیەکا نێزیکتر بکەین: بەری سەد سالان یان کێمتر، ب مەرەما بەرفرەهکرنا ئەردێ چاندنێ، سوتنا دارستانێن مەزن ب تشتەکێ شاش نەدهاتە ل قەلەمدان. لێ ئەڤرۆکە کارەکێ گەلەك شاشە، چونکی نوکە مە چەندین توخمێن باشتر هەنە بشێین کونترۆلێ ل سەر کارەکێ هۆسا بکەین."

- "باشە، نوکە ئەز تێگەهشتم."

- " هیگلی دیارکر هەمان تشت ل سەر هزرکرنا فەلسەفی ژی دگونجیت. ژبەرکو ب دیتنا وی ئەقل تشتەکێ دینامیکی یە، ئانکو پڕۆژەکە یان پڕۆسێسەکە. ئەڤ پڕۆسێسە ژی ڕاستی ب خوەیە. ژبەر هندێ چ پیڤەرێن دەرەکی ژ بۆ ڤێ پڕوسێسا دیرۆکی نینن بشێت ل پلا یەکێ ڕاستیێ یان ئەقلی بۆ مە دەستنیشان بکەت."

- "بۆ نموونە!"

- "بۆ نموونە ئەم نەشێین هزرێن جودا جودا ژ هزروبیرێن چەرخێن کەڤن یان چەرخێن ناڤەڕاست و چەرخێن ڕێنیسانسێ یان چەرخێ ڕەوشەنگیریێ وەربگرین و ژ ڕێبازا وان یا دیرۆکی بینە دەرێ و دووبارە ڕێکبێخین و بێژین: ئەڤ تشتە یێ دروستە و

ئەڤە یێ شاشە. ئەم نەشێین بێژین ئەڕستۆ یێ شاش بوو و ئەفلاتۆن یێ دروست بوو. یان هیوم یێ شاش بوو لێ کانت و شیلنگ د دروست بوون. ئەڤ چەندە نەك تنێ ڕێیەکا نەدیرۆکی یە، بەلکو دژی دیرۆکێ ب خوەیە ژ بۆ شرۆڤەکرنا ئاریشەیان."

- "ڕاست بێژی، ب وی شێوەی نابیت."

- "وەك ڕێسایەکا گشتی، نابیت هیچ فەیلەسۆفەك یان بیرۆکەیەك ژ ڕێبازا وی یا دیرۆکی بهێتە لادان. ل ڤێرێ ب تنێ هزرەکا بنەڕەت هەیە: ژبەرکو بەردەوام تشتێن نوو دهێنە د هەبوونێ دا، ڕامانا ڤێ چەندێ ژی ئەوە کو ئەقل تشتەکێ پێشکەڤتنخوازە و یێ د پێشکەفتنەکا بەردەوام دا. ب ڤی ڕەنگی دێ بینین کو ئەو پێشکەفتنە بەردەوام بەرەڤ پێشڤە دچیت نەك پاشڤە."

- "ئانکو دشێین بێژین کو فەلسەفا کانتی ژ یا ئەفلاتۆنی دروسترە، مانە هۆسایە؟"

- "بەلێ، هزرا جیهانێ ژ ئەفلاتۆنی بۆ کانتی یا گەشەکری و بەرەڤ پێش چوویە و ئەڤ کێمترین تشتە. ئەگەر ب ڤەگەڕینە سەر نموونەیا ڕووباری، ئەم دێ شێین بێژین ڕۆژ بۆ ڕۆژێ ئاڤ پتر یا ڕێژتیە دناڤ ڕووباری دا، ژبەرکو دوو هزار سال پتر ب سەر دا یێن دەربازبووین. ل سەر کانتی یا پێدڤی بوو شاش نەبیت و هزر نەکەت کو ئەڤ ڕاستیە ب شێوەیەکێ ئارام دێ ل بەر لێڤا ڕووباری خرڤە بن و ل دوماهیێ بنە بەر و کەڤر، ژبەرکو هزرێن وی "ئەقلێ وی" ژی دێ کەڤیتە بەر ڕەخنەیێن بەرەبابکێن داهاتی. ئەڤە ژی هەر ئەو تشت بوو یێ ڕوودای."

- "بەلێ پا ئەو ڕووبارێ تە بەحسکری؟"

- "بەلێ، چیە؟"

- "بەرەڤ کیڤە دچیت؟"

- "هیگل دبێژیت هزرا جیهانێ بەردەوام گەشە دکەت داکو بگەهیتە ئاگەهیەکا مەزنتر و بەرفرەهتر. هەروەکو چەوا ڕووبارەك چەند مەزنتر و بەرفرەهتر لێ دهێت دەمێ نێزیکی ئۆقیانوسەکی دبیت. ب بۆچوونا هیگلی هیگلی، دیرۆك هشیاربوونەکا هێدی یا هزرا جیهانێ یە بەرامبەری ئاگەهیا خوە ب خوە. هەروەکو ئەم دزانین جیهان هەر هەبوویە، بەلێ ب ڕێکا کەلتوورێ مرۆڤایەتی و پێشکەڤتنا وێ، هزرا جیهانێ پتر تایبەتمەندیێن خوە وەرگرتینە."

- "چەوا دشێی هند یێ پشتڕاست بی؟"

- "ل دەڤ وی، ئەڤ چەندە ڕاستیەکا دیرۆکی یە نەك پێشبینیە. هەر کەسەکێ ڤەکۆلینێ ل دور دیرۆکێ بکەت، دێ بینیت مرۆڤایەتی بەردەوام بەرەڤ زانینەکا مەزنتر ڤە چوویە. پشتی هینگێ، دیرۆك ژی دیدەڤانە ل سەر هندێ کو مرۆڤایەتی بەرەڤ ئاڕاستەیەکێ مەزنتر یێ ڕاشیونالیزم و ئازادیێ گەشەکریە. سەرەڕای هەبوونا هەموو ئاستەنگان ژی، لێ پێڤاژوویا دیرۆکی بەرەڤ پێشڤە دچیت. ژبەر ڤێ چەندێ دێ بێژین دیرۆکێ ئارمانجەکا ب تنێ هەیە، ئەو ژی ل سەر خوە دا دەرباز ببیت."

- "باشە... هەروەکو تو دبێژی، دێ هزرکەین پێشکەفتنەك پەیدابوو."

- "بەلێ، دیرۆك وەکو زنجیرەکا دوور و درێژ یا بیرۆکەیانە، هیگل ژی وان یاسایان دەستنیشان دکەت یێن کونترۆلێ ل سەر ڤێ زنجیرێ دکەن. تێرا مە هەیە ئەگەر پیچەکێ ل دیرۆکێ بزڤڕین دا ببینین کا چەوا بیرۆکەیەك ل سەر بنەمایێ بیرۆکەیەکا کەڤنتر دهێتە دانان، بەلێ چەند بیرۆکەیەك دهێتە پێشنیار کرن، بیرۆکەیەکا دی ل بەر سینگێ وێ دڕاوەستیت داکو هەڤڕکی دناڤبەرا ڤان هەردوو بیرۆکەیان دا یا بەردەوام بیت هەتا بیرۆکەیا سیێ دهێت و ڤێ هەڤڕکیێ نەهێلیت و بیرۆکەیا ژ هەموویان باشتر دهەلبژێریت و دپارێزیت، هیگل دبێژیتە ڤێ چەندێ گەشەکرنا دیالێکتی."

- "دێ شێی نموونەیەکێ بۆ من بێژی؟"

- "ئەرێ بیرا تە ل دانوستاندنێن فەیلەسۆفێن بەری سۆکراتی ل سەر ماددەیێ دەستپێکی و گوهۆڕینێن وی دهێت؟"

- "ب شێوەیەکێ گشتی، بەلێ."

- "پاشی ئەیلیون ئیلیاتا* هاتن و هەموو جۆرێن گهوڕینان ڕەتکرن و خوە پشتڕاست دکر ماددە ڤەت ناهێتە گوهۆڕین. هەردیسان وان هەموو ئەو گوهۆڕینێن د سروشتی دا پەیدادبووین ژی ڕەتدکرن یێن ب ڕێکا هەستێن خوە هەستپێدکرن. ئەیلیونان ئەڤ

* ئەیلیون Aeolians کومەکا گریکی یێن کەڤن بوون ل رۆژهەلاتێ یونانێ ل ناڤەراستا چەرخێ دوازدێ بەری زایینی دژیان. دگەل نێزیکبوونا دوماهیا چەرخێ دوازدێ بەری زایینی کومەکا دی یا گریکیان ب ناڤێ "دوری" دەڤەرێن وان داگیرکرن، ژبەر هندێ گەلەك ژ وان بەرەڤ ئاسیا بچووك ڤە "تورکیا نوکە" و گزیرتا لیسبوس رەڤین.

دووپاتکرنه دناڤ لێکدانەکا فەلسەفی یا دەستنیشانکری دا دارێژت، هیگلی ناڤێ ڤان جۆره بۆچوونان کره "هەلویست."

- "ئاها؟"

- "لێ دەمێ هەلویستەکێ هۆسا یێ توند دهێته دەستنیشانکرن، هەر یەکسەر هەلویستەکێ هەڤدژ ژی پەیدادبیت.. هیگلی ئەڤ چەندە ناڤکربوو ب "ڕەتکرن". ڕەتکرنا فەلسەفا ئیلیاتا ژی، گریمانا هیڕاکلیتسی بوو دەمێ دگوت "هەموو تشت د بەردەوامیێ دانە". ل ڤێ خالێ هەڤڕکیێ دناڤبەرا هەردوو شێوەیێن هزرکرنێ یێن هەڤدژ دا دەستپێکر، لێ ئەڤ هەڤڕکیە ل وی دەمی نەما، دەمێ ئەمفیدۆکلیسی ئاماژە بۆ هندێ کر کو هەردوو لایەن پیچەك ڕاست دبێژن و د هەمان دەم دا هەردوو دیتنان چەند شاشیەك ژی هەنە."

- "نوکە یا بۆ من ڕۆهنتر دبیت."

- "ئیلیاتی د ڕاست بوون دەمێ دگوتن چ تشت ب شێوەیەکێ بنەڕەتی ناهێنە گوهۆڕین، بەلێ د شاش بوون دەمێ دگوتی ئەم نەشێین باوەریێ ب هەستێن خوە بینین. هیڕاکلیتس ژی یێ ڕاست بوو د دەمێ دگوت ئەم دشێین باوەر ژ هەستێن خوە بکەین، لێ یێ شاش بوو دەمێ دگوت هەموو تشت د بەردەوامیێ دانە."

- ژبەرکو چ ماددەیێن دەستپێکی یێن ب تنێ نەبوون، هەردیسان پێکهاتەیا تشتان دهێتە گوهۆڕین نەك ئەو توخمێن وی تشتی پێکدئینن."

- "ڕاستە، دیتنا ئەمفیدۆکلیسی یا هەردوو خالێ تێدا د بەشدار، کو ب دیتنا من ئەو هەردوو خالێ د هەڤدژن، هیگلی دگوتێ ڕەتکرنا ڕەتکرنێ."

- "ئای خودا، ڤێجا ئەڤە چ زاراڤە!"

- "وی هەرسێ قۆناغێن زانینێ ب ڤی شێوەی شرۆڤە دکرن: تێزا زانیاریان، دژی تێزا زانیاریان و یەکگرتنا تێزا زانیاریان. ب ڤی ڕەنگی ئەم دشێین بێژین ڕاشیونالیزمیا دیکارتی تێزەکا زانیاریان بوو و ئیمپریسیزمیا هیومی ل دژی وێ ڕاوەستیا. ل ڤێرێ هیوم دبیتە دژی تێزا زانیاریان. لێ ئەڤ هەڤکریا دناڤبەرا ڤان هەردوو هزرێن هەڤدژ دا ژ لایێ کانتی ڤە هاتە ڕەتکرن، ب ڤێ چەندێ ژی دبێژن یەکگرتنا تێزا زانیاریان کانتی فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی د تشتەکی دا ڕاست ددانان و ئیمپریسیزمی ژی د تشتەکێ دی د ڕاست ددانان، د هەمان دەم دا دیارکر کو هەردوولا د هندەك خالێن گرنگ دا د شاشن لێ

دیرۆك ل دەڤ كانتی نەڕاوەستیا، چونكی یەكگرتنا تێزا زانیاریان یا كانتی بۆ دەستپێكا پەیدابوونا زنجیرەكا نوو كو ژ ڤان هەرسێ هزرێن بەری نوكە پێكدهات یا هیگلی دگوتیێ "هزركرنا سێ لایەنی" ب ڕەنگەكی هەر یەكگرتنەكا تێزا زانیاریان ببوو تێزەكا زانیاریان و ل هەمبەر دژی تێزا زانیاریان ڕاوەستیا."

- "ئەڤ چەندە تشتەكێ زێدە تیوری یە."

- "بەلێ، د ڕاستی دا زێدە یا تیوری یە. لێ هیگلی نەدڤیا ئەم پڕاكتیزە بكەین بەلكو هەما ب تنێ هندەك یاساییێن كونترۆلێ ل سەر پێشكەفتنا ئەقل یان ڕۆحا جیهانێ ب درێژاهیا دیرۆكی ئاشكەرا بكەین. بەلێ دیالێكتیا هیگلی ل سەر دیرۆكێ ب تنێ ناهێتە پڕاكتیزە كرن، دەمێ دانوستاندنێ ل سەر تشتەكی دكەین یان ڕۆهن بكەین، جارەكا دی ب شێوەیەكێ دیالێكتی دێ هزرێن خوە تێدا كەین و پێكۆلێ كەین شاشیێن هزركرنێ دیار بكەین. هیگلی دگوتە ڤێ چەندێ "هزركرنا نێگەتیڤ"، لێ دەمێ ئەم شاشیێن لایەنەكێ هزركرنێ دیار دكەین، د هەمان دەم دا ئەم یێ دا لایەنێن وی یێن دپارێزین."

- "نموونەكێ بۆ من بینە."

- "بۆ نموونە ل دەمێ كەسەكێ سۆشیالیست و كەسەكێ ڕاسترەو پێكڤە ژ بۆ چارەسەركرنا ئاریشەیەكا جڤاكی ل سەر مێزەكێ دروونە خوارێ، ل وی دەمی یەكسەر ئالۆزی دناڤبەرا بۆچوونێن وان دا دروست دبیت، ئانكو جۆرە دژایەتیەكێ دناڤبەرا شێوەیێن هزركرنێن وان دا دبینین، بەلێ ئەڤ چەندە وێ ڕامانێ نادەت كو لایەنەك ب تەمامی یێ ڕاستە و لایەنەك ب تەمامی یێ شاشە. بەلكو بەروڤاژی، هەردوو لایەنان هندەك ڕاستی و هندەك شاشی هەنە، پشتی كو هێدی هێدی دەمێ دانوستاندنا وان بەردەوام بیت، گەلەك جاران باشترین لایەنێن دانوستاندنێ دەردكەڤن."

- "هیڤیا من ژی ئەوە."

- "هەرچەندە چ گەرەنتی نینە، بەلێ ل دەمێ ل ناڤەڕاستا دانوستاندنەكا هۆسا دا بین، نە یا ب ساناهیە بڕیارێ بدەین كیش لایەن دروسترە، دیرۆك دیار دكەت ل دوماهیكێ كیش لایەن یێ دروستە و كیشك یێ شاشە. تشتێ دروست ئەوە یێ ل سەر ژیانێ بەردەوام دبیت"

- "ئانكو ئەو تشتێ دمینتە ساخ ئەو یێ دروستە، مانە هۆسایە؟"

- "یان ژی بەروڤاژی، ئەو تشتێ دروست ئەو دێ مینتە ساخ."
- "ئەگەر زەحمەت نەبیت، بۆ من نموونەکێ بینە."
- "باشە، بەری سەد و پێنجی سالان، هژمارەکا خەلکی داخوازا یەکسانیا مافێن ژن و زەلام و دکر، لێ پتریا کەسێن دی دژی ڤێ داخوازێ بوون و ب هەموو شێوەیان ڕەتدکر. ئەگەر نوکە ئەم بهێین دادوەریێ دناڤبەرا هەردوو لایەنان دا بکەین، دێ یا ب زەحمەت بیت بزانین کا کیژ لایەن یێ ڕاست بوو. پێدڤیە ل بیرا مە بیت ئەم یێ د دەمەکی دا بڕیارێ دەین کو ئەڤ تشتە یێن ڕوودابن، ئانکو پاشی هۆسا دەرکەفت ئەوێن داخوازا یەکسانیا مافێن ژن و زەلامان دکر د ڕاست بوون. بێگۆمان ڕێژەیەکا مەزن خەلکی ژی ئەڤرۆکە هەست ب شەرمزاریێ دکەن دەمێ بیروباوەرێن باب و باپیرێن خوە دەربارەی وێ چەندێ دخوینن."
- "چ تشتێ سەیر تێدا نینە، لێ بۆچوونا هیگلی چ بوو؟"
- "دەربارەی یەکسانیا ژن و زەلامان؟"
- "بەلێ، مانە تە بەحسێ ڤێ چەندێ دکر؟"
- "تە دڤێت بوتە تێکستێ هیگلی دەربارەی ڤێ چەندێ بخینم؟"
- "بەلێ، ب خوشحالی ڤە."
- "هیگل دبێژیت: جوداهی دناڤبەرا ژن و زەلامان دا وەکو جوداهیا دناڤبەرا گیانەوەر و ڕووەکان دایە، سروشتێ گیانەوەری پتر وەکو یێ زەلامیە و یێ ڕووەکی ژی وەکو ژنێ یە، ژبەر هندێ ژن وەکو ڕووەکی ب ئارامی گەشە دکەت و ب شێوەیەکێ دەستپێکێ هەستەکێ نەدیارێ گشتی هەیە، ئەگەر ژن وەلاتی برێڤە ببەن، دەولەت دێ کەڤیتە د مەترسیێ دا، چونکی وەکو پێدڤیێن گشتی کار ناکەت، بەلکو ل دووڤ حەز و بۆچوونان دێ کار کەت، هەروەسا ژن ب جۆرەکێ تایبەت هۆسا دێ دروست بیت ئەگەرێ وێ چەندێ ژی نە یێ ئاشکرایە، دبیت دیتنێن وێ پتر ژ ژیانا ڕۆژانە هاتبن ل شوونا هندێ پێکۆلێ بکەت بنەمایەکێ مەعریفی بۆ خوە بدەستڤە بینیت. بەلێ زەلام بەروڤاژی نەشێت خوە زالێ بکەت ئەگەر ب ڕێکا هزرکرنێ نەبیت و ب پێکۆل و خەباتەکا مەزن دێ خوە گەهینیتە جهێ مەرەم پێ هەی."
- "سوپاس، من نەڤێت زێدەتر گوهدارییێ بکەم."

- "بەلێ ئەڤ تێکستێ هیگلی دهێته هژمارتن ژ باشترین نموونەیان و ل ڤێرێ بۆ مە دیار دبیت کو تێگەهشتنێن ڕاشیونالیزمی ب چ شێوە بەردەوام گوهۆڕین ب سەر دا دهێن، هەروەسا نیشا مە ددەت کو هیگل کورێ سەردەمێ خوە بوو، ئەم ژی هەروەسا زاڕوکێن سەردەمێ خوەینە، تێگەهشتنێن مە یێن نوکە کو د ڤەبرن، بۆ هەتا هەتایێ نامینن و دێ هێنە گوهۆڕین."

- "چ نموونە نینن تو پتر ڕۆهن بکەی؟"

- "نەخێر."

- "بۆچی؟"

- "ژبەرکو ئەم یێ بەحسی تشتەکی دکەین یێ د گوهۆڕینێ دا، ئەم نەشێن بێژین بکارئینانا ترۆمبێلێ تشتەکێ نەباشە، چونکی دبیتە ئەگەرێ پیسکرنا ژینگەهێ. گەلەك کەسان بەری من بەحسی ڤێ چەندێ یا کری، ئانکو دیسان ئەڤەژی دێ بیتە نموونەیەکا خراب، بەلێ دیرۆك ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان دێ بۆ مە دووپاتکەت، کو پتریا وان تشتێن ئەم دبینن پێدڤی بەلگەیا نینن و د بێگومانن، ل بەرامبەری دادگەها دیرۆکێ خوە ل بەر ناگرن."

- "تێگەهشتم."

- "وەك تیبینەکا هەڤرك، دێ بێژین بزاڤا ئازادکرنا ژنێ ڕووناهی دیت، ژبەرکو بەهرا پتریا زەلامێن سەردەمێ هیگلی دگوت پێدڤیە ژن یا گوهداربیت."

- "چەوا؟"

- "وان زەلامان مگرتیەك داڕێژت. ژبەرکو ل وی دەمی ب شێوەیەکێ گشتی خەباتا ژنان دەستپێکربوو، هەروەکو ئەم دزانین یا بێ مفایە ئەگەر هەڤڕکیا خاڵەکێ بکەین کو ئەم هەموو ل سەر د هەڤڕا بین. هندی گوتنێن زەلامان توندوتیژتر لێ دهاتن، ڕەتکرنا ژنان ژی بهێزتر و بهێزتر لێ دهات، ئانکو هندی نەڕازیبوونا کەسێن بەرامبەری تە یا بهێزتر بیت، ڕەنگڤەدانا تەژی بۆ وان دێ یا دژوارتر بیت. دبێژنە ڤێ چەندێ "ڕەشاندنا ئاڤێ ل سەر ئاشی."

- "ئەز دبێژم نوکە ئاشێ من ب هەموو هێزا خوە ڤە یێ کار دکەت."

- "ئەگەر ب دیتنەکا فەلسەفی یان لۆژیکی یا پەتی بەرێ خوە بدەینێ، گەلەك جاران دێ هەڤڕکیەکا دیالێکتی دناڤبەرا دوو تێگەهان دا بینین."

- "زەحمەت نەبیت، نموونەکێ."

- " ئەگەر هزر د زارڤێ "هەبوون"ێ دا بکەم، دێ نەچاربم هزر د زارڤێ دژی وێ ژی بکەم ئانکو "نەبوون"ێ دا. ئەم نەشێین ب تنێ هزر د هندێ دا بکەین کو ئەم یێن هەین، بەلکو دڤێت بەردەوام هزر د هندێ ژی دا بکەین کو هەروهەر ئەم ل ڤێرێ نابین. هەڤرکی و ئالۆزی دناڤبەرا زارڤێ هەبوون و نەبوونێ خوە د تێگەهێ "یێ بوویە" دا دبینیت.

- "تێدگەهشتم."

- "ژبەر هندێ دێ بێژین ڕاشیونالیزما هیگلی ڕاشیونالیزمەکا دینامیکیە، د دەمەکی ژی دا کو کەتوار ژ گەلەك هەڤدژیان پێکدهێت، ئانکو تشتەکێ لوژیکی یە ئەگەر بارودوخێ وی یێ هەڤدژ بیت. بۆ نموونە: دبێژن ڤەکولەرێ فیزیای یێ ناڤدار یێ دانیمارکی "نیلز بۆهر" نالەکا هەسپی ل سەر دەرگەهێ ژ دەرڤە هەلاویستبوو."

- "ئەو ڕامانا بەختی ددەت."

- "لێ جۆرەکێ ئەفسانە و سەختەکاریانە. نیلز بۆهری خەلك ژ ڤێ چەندێ ددا پاش. ڕۆژەکێ هەڤالەکێ وی دچیتە دەڤ و ئەڤ دانوستاندنە دناڤبەرا وان پەیدادبیت:

- *"نەبێژی من باوەری ب ڤان تشتان هەیە!"*

- *"نەخێر، لێ من گوهلێنەبوویە کەسەکی گوت بیت ئەڤە کارەکێ نە ژ هەژی یە.*

- *"بەلێ ئەڤ کارە بێهنا مرۆڤی تەنگ دکەت."*

- "بەرسڤا وێ هەتا ڕادەیەکێ یا دیالێکتیە، دبیت ژی یا هەڤدژ ژی بیت. نیلز بۆهر دگوت دوو جۆرێن ڕاستیێ هەنە: ڕاستیێن سەرڤە سەرڤە، کو تێگەهێ وێ یێ هەڤدژ ب تەمامی یێ شاشە. ڕاستیێن کوور ژی کو دبیت هەڤدژێ وێ یێ ڕاست بیت."

- "ئەڤە چ جۆرە ڕاستینە؟"

- "بۆ نموونە ئەگەر بێژم ژیان یا کورتە..."

- "ئەز ژی دگەل تە مە."

- "بەلێ دبیت د بوارەکێ دی دا دەستێ خوە بکێشم و بێژم ژیان یا درێژە."

- "هەروەسا ئەڤ چەندە ژی ڕاستە."

- "ل دوماهیێ، دێ نموونەکێ بۆ تە ئینم کو دبیت هەڤدژی یا دیالێکتی تێدا ببیتە ئەگەرێ ئەنجامدانا کریارەکا ڕاستەخو و ئەو کریارە ژی ببیتە ئەگەرێ گوهۆڕینەکێ."

- "گوهێ من یێ ل ته."

- "کچەکا گەنج بینه بەر چاڤێن خوه کو هەردەم دبێژیته دایکا خوه: بەلێ دادێ، سەرچاڤا دادێ، هەروەکو ته دڤێت دادێ، هەر نوکه ئەوا تو دبێژی کەم."

- "ئەڤێ چەندێ تەزینك ل سەر لەشێ من دا ئینا."

- "هەتا کو ڕۆژەکێ ئەو دایکه ژ گوهداریا کچا خوه گەلەك بێزار دبیت و دکەته هەوار و دبێژیتێ: بەسە ئێدی ئەڤ هەموو گوهداریە و ڕێزە! کچا وێ ژی بەرسڤا وێ ددەت و دبێژیت: نەخێر دادێ."

- "ئەگەر ئەز بام دا دوو زلەهان ل ڕوویێن وێ دەم..."

- "هۆسا؟ ل وی دەمی دا چ کەی ئەگەر د بەرسڤێ دا گوتبایە: بەلێ دادێ؟"

- "دا بەرسڤەکا سەیربیت بۆ من، بەلێ دبیت ل وی دەمی من هەر زلەهەك لێدابا."

- "ئانکو ب شێوەیەکی دی بێژین، کاودان یێ د جهێ خوه دا ڕاوەستیای، دژایەتیا دیالێکتی د وێرێ دا یا گەهشتیە ڕادەیەکی، کریارەکا دەرەکی نەبیت ب دوماهی ناهێت."

- "مەرەما ته زلەهـ لێدانە؟"

- "دڤێت دوماهیك خالا فەلسەفا هیگلی بەحس بکەین."

- "تو دزانی هێشتا گوهێ من یێ ل ته."

- "ل بیرا ته یە مە دگوت ڕومانتیزم کەسێن تاکەکەسی بوون."

- "ڕێگا نهێنی بەرەڤ ژناڤ دا دچیت."

- "باشە. د فەلسەفا هیگلی دا، ڕەتکرن و هەڤدژیا ڤێ تاکەکەسیێ دبینین، هیگل گرنگیێ ب وان تشتا ددەت، یێن دگوتنێ "هێزا بابەتی" و مەرەما وی ژی خێزان و دەولەت بوون. ئەم دشێین بێژین هیگلی ب چاڤێ گومانێ بەرێ خوه ددا تاکەکەسیێ. ب باوەریا وی تاکەکەس بەشەکێ ئەندامێ گشتیە، ل دەڤ وی ئەقل یان هزرا جیهانێ تشتەکە، کو پتر ب ڕێکا پەیوەندییێن مرۆڤان دەردکەڤیت."

- " ڕوهن بکە."

- "ل دەستپێکێ، ئەقل ب ڕێکا زمانی خوه دیار دکەت. زمان ژی تشتەکه دەمێ ژ دایکبووین یێ دگەل مە. زمانێ فرەنسی دشێت بێ هێزا "دوبون"ی بژیت، لێ دوبون

نەشێت بێ زمان بژیت. ئانکو تاکەکەس زمانی دروست ناکەت بەلکو زمان تاکەکەسی دروست دکەت."

- "ژ ڤی لای ڤە ڕاستە..."

- "دەمێ تاکەکەس د زمانەکێ دەستنیشانکری دا ژ دایکدبیت، ب هەمان شێوە د سەروبەرەکێ دیرۆکی یێ دەستنیشانکری دا ژ دایکدبیت.. چ کەس ژی د پەیوەندیێن خوە دگەل وی سەروبەری دا یێ ئازاد نینە. ئانکو ئەو کەسێ جهێ خوە د وەلاتی دا نەبینیت، کەسەکێ دیرۆکی نینە. دبیت ل بیرا تەبیت کو ئەڤ جۆرێ هزرکرنێ ل دەڤ فەیلەسۆفێن مەزن یێن ئەسینایێ ژی یێ گرنگ بوو. هەروەکو چەوا ئەم نەشێین وەلاتەکی بێ هاولاتی بینینە پێشچاڤێن خوە، ب هەمان شێوە ژی ئەم نەشێن تاکەکەسەکی بێ وەلات بینینە پێشچاڤێن خوە."

- "تێگەهشتم."

- "ل دەڤ هیگلی، وەلات ژ تاکە هاوڵاتیەکێ سادە پترە، بەلێ، بەلکو ژ کومەلەکا هاولاتیان ژی پترە. ب بۆچوونا وی مەحالە بشێی ژ جڤاکەکی بهێیە ژ دەرڤە. ئەو کەسێ ل دەمێ بەحسێ جڤاکی بۆ دکەین، ئەگەر خوە جودا بکەت و هۆسا ببینیت ب تنێ بۆ خوە بژیت، ئەو کەسەکێ گەمژەیە."

- "نزانیم ئەگەر ب تەمامی دگەل ڤێ چەندێ یا هەڤڕابم یان نە، بەلێ هەرچەوا بیت بەردەوام بە."

- "ل دەڤ هیگلی ئەو تاکەکەس نینە کو خوە دبینیت، بەلکو ڕۆحا جیهانێ یە."

- "ڕۆحا جیهانێ خوە دبینیت؟"

- "هیگلی دگوت ڕۆحا جیهانێ ب سێ قۆناغێن ل دووڤ یەك ڤەدگەڕیتە سەر خوە. مەرەما وە ئەو بوو کو ب سێ قۆناغا ئاگەهـ ژ خوە دبیت."

- "ئانکو چەوا؟"

- "یەکەم: ڕۆحا جیهانێ د تاکەکەسەکی دا ئاگەهـ ژ خوە دبیت، هیگل دبێژیتە ڤێ چەندێ "ئەقلێ خویی". پاشی ژی پلەیەکا بلندتر یا ڕۆحا جیهانێ دهێت کو ئەو ژی د خێزان و دەولەتە ، هیگلی دگوتە ڤی تشتی "ئەقلێ بابەتی"، ژبەرکو ئەقل ب ڕێکا پەیوەندیێن دناڤبەرا مرۆڤان دا دەردکەڤیت، بەلێ هێشتا مە دووەمین قۆناغ یا مای..."

- "بۆ من بۆ مەرەق.."

- "ڕۆحا جیهانیٚ دناڤ ئەقلیٚ ڕەها دا، دگەهیتە بلندترین ئاستیٚ زانینیٚ. ئەقلیٚ ڕەها ژی هونەر و ئایین و فەلسەفەیە. د ناڤ ئەڤان ژی دا فەلسەفە بلندترین شیٚوەییٚ ئەقلی یە، ژبەرکو ئەقلیٚ جیهانیٚ دناڤ فەلسەفیٚ دا هزر د چالاکییٚن تایبەتیٚن خوە دکەت ب دریٚژاهیا دیرۆکیٚ. ئانکو ڕۆحا جیهانیٚ ب تنیٚ د فەلسەفیٚ دا دگەهیتە خوە ب خوە. دشیٚی بیٚژی فەلسەفە خودیکا ڕۆحا جیهانیٚ یە."

- "ئەو تشتیٚ تو دبیٚژی ییٚ سەیرە. هەستپیٚدکەم من پیٚدڤی ب دەمی یە داکو بشیٚم بابەتی وەربگرم. لیٚ من گەلەك حەز ژ وی ویٚنەییٚ دوماهییٚ کر ییٚ تە بکارئینای."

- "بەلیٚ ییٚ جوانە، تە باوەری هەیە ئەڤیٚ پەیوەندیەك ب خودیکا برۆنزی یا کەڤن ڤە هەبیت؟"

- "مەرەما تە چیە؟

- "ئەز د ویٚ باوەریٚ دامە کو ڤیٚ خودیکیٚ ڕیٚنیشاندەرەکا تایبەت هەیە."

- "باشە تو دزانی کا تو بەحسیٚ چ دکەی؟"

- "نەخیٚر، نەخیٚر... من گوت ئەگەر خودیکیٚ ل دەڤ هیٚلدیٚ و بابیٚ هیٚلدیٚ هند ڕامانەکا تایبەت نەبایە، هۆسا گەلەگ ناڤیٚ ویٚ نەدئینا، بەلیٚ چ ڕامان هەیە؟ هیٚلد ب تنیٚ دشیٚت بەرسڤا ویٚ چەندیٚ بدەت."

- ئەڤەیە کو دبیٚژنیٚ ئایرونیا ڕومانتیزمی؟

- "ڤیٚ پرسیارا تە چ بەرسڤ نینن، سۆفیا."

- "بۆچی؟"

- "هەروەکو تو دزانی ئەم نینن وان تشتا دبیٚژین. ئەم ب تنیٚ قوربانییٚن ڤیٚ ئایرونییٚ نە. ئەگەر زارۆکەکیٚ نەخۆش هیٚلکاریەکیٚ ل سەر پارچە کاغەزەکیٚ بکیٚشیت، ئەو کاغەز نەشیٚت بیٚژیتە تە کا ڕامانا وی هیٚلکاری چیە."

- "ئەز یا هەست ب تەزینکیٚ ل سەر پشتا خوە دکەم."

# کیرکیگارد

...ئەوروپا هێدی هێدی یا بەرەڤ مفلسبوونێ دچیت...

هێلدێ تەماشەی دەمژمێرا خوە کر یا بوویە چواری ئێڤاری، فائیلە دانا سەر مێزێ و بلەز بەرەڤ لێنانگەهێ ڤە چوو داکو هاریکاریا دایکا خوە بکەت و خوارنێ بۆ ببەت بەری کو دایکا وێ ژ هاریکاریا وێ بێهیڤی ببیت، لێ ب ڕێکێ ڤە چاڤێ وێ ب خودیکێ کەفت.

وێ بلەز ڤوریکێ ئاڤێ بۆ چایێ دانا سەر تەباخێ و هندەك ساندەویچ بەرهەڤ کرن. وێ کربوو د سەرێ خوە دا کو چەندین فێلان ل بابێ خوە بکەت. سۆفیا پتر هێدی هێدی پتر هەست ب ڕەوشا سۆفیایێ و ئەلبێرتوی دکر، ژبەر هندێ پلانا وێ هینگێ دێ دەستپێکەت دەمێ بابێ وێ دگەهیتە کوبینهاگن.

پاشی ئەو چوو سەر بەندەرێ بەلەمێ ڕاوەستیا و سێنیکەك د دەستان دا بوو و گازی دایکا خوە کر. "دادێ، خوارنا مە یا بەرهەڤە."

دایکا وێ بلوکەکێ دناڤ پارچەکا کاغەزێ دا نخافتی ب دەستێ خوە هەلگرتبوو. ب دەستەکی پرچا خوە یا گرێدای برە پشتی. هندەك ئاخ مابوو ب پرچا وێ ژێ ڤە.

- "ئەڤە تە کرە شیڤ."

پاشی ئەو هەردوو دناڤ گیای دا ڕوونشتنە خوارێ و پێکڤە خوارن خوار.

هێلدێ پرسیار کر: "ئەرێ بابێ من دێ کەنگی زڤڕیت؟"

- "شەمبیێ، من هزردکر تو دزانی."
- "ل وی دەمی؟ ما تە نە گوتبوو ل دەستپێکێ ئەو دێ ل کوپنهاگن هێتە خوارێ."
- "ئەڤ چەندە ڕاستە."

دایکا وێ لەڤەك ل ساندەویچا خوە دا.

- "فرۆکەیا وی نێزیکی دەمژمێر پێنجی ئێڤاری دێ ل کوپنهاگن دادەت و پاشی فرۆکەیا کریستیانستاند ل دەمژمێر هەشت و چارێکەك دێ ڕابیت، ئەز دبێژم ئەو دێ نێزیکی دەمژمێر نەھ و نیڤ گەهیتە کجیفیك."

- "ئانکو ب چەندین دەمژمێران ئەو دێ مینتە کاستروپێ؟"
- "بەلێ. بۆچی تو پرسیارا ڤێ چەندێ ژ من دکەی؟"
- "ب تنێ من دڤیا بزانم کا دێ کەنگی زڤڕیت."

دەمێ هیلدێ هەستپێکری نوکە دەم یێ گونجایە پرسیارەکێ ژێ بکەت، گوت: "ئەرێ ل ڤێ دوماهیێ تە چ دەنگوباسێن ئان و پیتەری نەزانینە؟"

- "بەلێ. ئەز دبێژم دوو یان سێ جاران تێلەفۆنا من یا کری. ل هەیڤا تیرمەهێ دێ بۆ بهێنڤەدانا هاڤینێ ڤەگەڕن."

- "ئانکو بەری هینگێ ناهێن؟"
- "نەخێر. باوەر ناکەم."
- "ئانکو ل ڤێ حەفتیێ ئەو دێ ل کوپنهاگن بن."
- "ب ئەڤ پرسیارە هەموو بۆ چنە. هیدا؟ تو تشتەکی ل من د ڤەشێری؟"
- "نەخێر. چ تشتێ هۆسا نینە."
- "بەلێ پا تە دوو جاران بەحسێ کوپنهاگنێ کر."
- "ژ ڕاستا؟"
- "من گوتە تە کو بابێ تە ل دەستپێکێ دێ ل وێرێ هێتە خوارێ."
- "چ پێنەڤێت ئاها ڤێ چەندێ بیرا من ل ئانێ و پیتەری ئینا."

**پشتی ئەو ژ خوارنێ ب دوماهی هاتین، هێلدێ سێنیك و كوپك خركرن و گوت: "پێدڤیه ئەز بچمه ژوورا خوه داكو بەردەوامیێ بدەمه خواندنێ."**

- **"بەلێ تە بەری نوكه ژی وەگوت."**

**ئەرێ تو بێژی سفكاتی د تونا دەنگێ دایكا وێ دا بیت؟ چونكی دایكا وێ دڤیا هاریكاریا وێ بكەت ژ بۆ پاقژكرنا بەلەمێ بەری بابێ وێ بزڤڕیت.**

- **"بەلێ ب ڕەنگەكی ژ ڕەنگان بابێ من وەل من كر ئەز سوزێ بدەمێ بەری بزڤڕیت پەڕتووكا وی ژ خواندنێ ب دوماهی بینم."**

- **"ئەز دبینم ئەڤ چەندە نە یا بەرئاقله. ئەگەر ئەو ل ڤێرێ نەبیت ئەو ئاریشا وی یە، لێ ئەز ڕازی نابم ئەو ل ڤێرێ نەبیت و مایێ خوه د هەموو كاروبارێن مالێ دا بكەت و هەموو تشتان ب ڕێڤە ببەت"**

**هێلدی ب دەنگەكێ نزم گوت: "خوزی تە زانیبا كا ئەو چ ب ڕێڤە دبەت، لێ تو نزانی كا ئەو چەند خوشیێ ژی ژ ڤێ چەندێ دبینیت."**

**پاشی سۆفیا بەرەڤ ژوورا خوه ڤە چوو و دەست ب خواندنێ كر.**

ژ نیشكەكێ ڤە سۆفیایێ گوهـ ل دەنگێ قوتانا دەرگەهی بوو. ئەلبێرتۆی ب حێبەتی ڤە تەماشەی وێ كر.

- "ئەز ناهێلم كەس ئاخفتنا مە ببڕیت."

دووبارە دەرگەهـ هاتە قوتان، لێ ئەلبێرتۆی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوه.

- "نوكه ئەز دێ بۆ تە بەحسێ فەیلەسۆفەكێ دانیماركی كەم كو گەلەك ب فەلسەفەیا هیگلی یێ داخبار بوو."

پاشی دەرگەهـ هۆسا حێل هاتە قوتان تا وی ڕادەی دەرگەهـ دلڤلڤی.

- "گومان تێدا نینە ئەڤەژی فێلەكا نوو یا مایجەری یە كو ئەڤ جارە ژی كەسایەتیەك فرێكریە داكو مە پێ تاقیبكەت بێ كو ئەو زەحمەتێ ببەت."

- "بەلێ پا هەکە ئەم نەڤەکەین ڕەنگە ئەو کۆلکی هەموویێ ژناڤ ببەت."
- " دبیت ئاخفتنا تە ڕاست بیت، کا دا بچین ڤەکەین."

ئەو بەرەڤ دەرگەهی ڤە چوون، ل دووڤ دەنگێ قوتانا دەرگەهی، سۆفیایێ هزر کر دێ زەلامەکێ ب کەلەخ ل بەر دەرگەهی بینیت، لێ حێبەتی ما دەمێ کچەکا بچووك و پرچ زەر و درێژ دیت کو کراسەکێ هاڤینێ ل بەر بوو و دوو شووشە د دەستان دا بوون، یەك یا سۆر و یەك ژی یا شین بوو.

سۆفیایێ گوتێ: "سپێدەباش، تو کی؟"

وێ کچکا بچووك ب ڕێزگرتن ڤە گوت: ناڤێ من ئەلیسە."

- "من گومان ژ ڤێ چەندێ دبر، ئەڤە ئەلیسا وەلاتێ سەیروسەمەرانە*."
- "بەلێ ئەو چەوا هاتیە ڤێرێ؟"

ل وی دەمێ ئەلیسێ دەست ب ئاخفتنێ کر.

- "وەلاتێ سەیروسەمەران وەلاتەکە چ سنوور نینن، ڕامانا وێ ئەوە یێ ل هەموو جهان، تا ڕادەیەکی وەکو وەلاتێن یەکگرتی یە. ژبەر هندێ پێدڤیە ببمە ئەندام تێدا و پێدڤیە د هەموو شاندان دا مە نوینەرێن خوە هەبن."

ئەلبێرتۆی د بن لێڤکان ڕا گوت: "ئاخ، ئەڤە چیە مایجەر؟"

- "باشە تو بۆچی هاتیە ڤێرێ؟"
- "ئەز یا هاتیمە ڕاسپاردن ڤان هەردوو شووشەیێن فەلسەفی بگەهینمە دەستێ سۆفیایێ."

دگەل گوتنا ڤێ ئاخفتنێ، وێ دەستێ خوە بەرەڤ سۆفیایێ ڤە درێژ کر.

---

* ئەلیس ل وەلاتێ سەیروسەمەران Alice's Adventures in Wonderland ڕۆمانەکا زارۆکانە ژلایێ نڤیسەرێ ئینگلیز چارلز دودگسونی ڤە ل ژێرناڤێ وێ یێ ڤەشارتی "لویس کارۆل" هاتیە نڤیسین و ل سالا 1865 هاتیە بەلاڤکرن کو تێدا بەحسێ کچەکێ ب ناڤێ ئەلیس دکەت دکەڤیتە دناڤ کولکەکێ کێڤریشکان دا و ل وێرێ بەرەڤ جیهانەکا ئاشوپی دچیت.

ئەو هەردوو شووشە هندی یەك بوون و چ جوداهی دناڤبەرا وان دا نەبوو ب تنێ ڕەنگێ شەربەتا تێدا نەبیت. ل سەر شووشەیا ڕەنگ سۆر نڤیسابوو "من ڤەخو"، ل سەر شووشەیا ڕەنگ شین نڤیسابوو "من ژی ڤەخو".

پشتی دەمەکێ کورت، کێڤریشکەکا ڕەنگ سپی بلەز د بەر کۆلکی ڕا بووی، ئەو ل سەر دوو پیان ب ڕێڤە دچوو و چاکیتەك ل بەر بوو. دەمژمێرەکا دەستێ ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ و گوت: "ئای خودا، ئەز دێ گیرو گەهم."

پاشی وێ کێڤریشکێ پێن خوە خوش کرن و ئەلیس ژی ب دووڤ کەفت، لێ بەری بچیت دووبارە ل دور خوە زڤڕی و تەماشەی سۆفیایێ کر و گوتێ: "باشە، ئەڤ چەندە دێ دووبارە بیت."

- "سلاڤێن من بگەهینە دینایێ و شاهژنێ."

بەری ئەو د ناڤ دارستانێ دا بەرزەبیت سۆفیایێ ئەڤ ئاخفتنە گوتنێ. پشتی هینگی سۆفیا و ئەلبێرتۆ مانە ب تنێ و دەست ب ڤەکرنا هەردوو شووشەیان کر.

- "**من ڤەخو، من ژی ڤەخو**. ئەز نزانم کا ئەز دێ وێرم ڤەخوم یان نە."

ئەلبێرتۆی سەرێ خوە هەژاند و گرنژی.

- "هۆسا دیارە مایجەری یێن بۆ مە هنارتین، هەر تشتەکێ ژ دەڤ وی دهێت، ژ ئاگەهیا وی یە. چ پێنەڤێت ئەڤە ژی "شەربەتێن هزرێ" نە."

سۆفیایێ شووشەیا ڕەنگ سۆر ڤەکر و ب هشیاری نێزیکی دەڤێ خوە کر وچەند فرەك ژێ ڤەخوارن. تاما وێ یا شیرین و سەیر بوو، لێ پشتی هینگێ ژ نیشکەکێ ڤە هەموو تشتێن دەروبەری وێ هاتنە گوهۆڕین."

دەریاچە و دارستان و کۆلك هەموو دناڤ توخمەکێ ب تنێ دا حەلیان و بوونە یەك تشت، پاشی هەستپێکر ئەو چ مرۆڤان ل پێشچاڤێن خوە نابینیت ب تنێ یەك کەس نەبیت کو ئەو ژی سۆفیا ئاموندسن ب خوە بوو. وێ سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی ئەلبێرتۆی کر لێ ئەو ژی یێ بوویە بەشەك ژ ڕۆحا سۆفیایێ.

سۆفیایێ گوت: "کارتێکرنا وێ گەلەك یا سەیرە. نوکە ئەز یا هەموو تشتان وەکو بەرێ دبینم لێ هۆسا دیارە هەموو تشتان پەیوەندی دگەل هەڤدوو هەیە. هەستپێدکەم هەموو تشت یەك ئاگەهیا ب تنێ یە."

ئەلبێرتۆی سەرێ خوە خوراند، سۆفیایێ هەستپێکر ئەو ژی یا سەرێ خوە دخورینیت.

- "ئەڤە دەربرینێ ژ پانتینیزمێ "فەلسەفەیا سەرجەمی" دکەت. ئانکو بیرۆکەیا جیهانێ ل دەڤ فەیلەسۆفێن سەردەمێ ڕۆمانتیزمێ. ب دیتنا من، جیهان هەموو دەربرینە ژ "ئەز"ەکێ مەزن و بەرفرەهـ. هەرچەندە هیگلی تێگەهێ تاکەکەسیێ ژبیرنەکربوو، لێ وی هەموو تشت وەکو دەربرینا یەك ئەقلێ جیهانێ یێ ب تنێ ددیت."

- "ئەرێ پێدڤیە ژ شووشەیا دووێ ژی ڤەخوم؟"
- "پا هۆسا یا ل سەر نڤیسایە."

سۆفیایێ شووشەیا ڕەنگ شین ژی ڤەکر و هندەك ژێ ڤەخوار. هەرچەندە تاما وێ یا دژوار بوو لێ یا خوش ژی بوو. ل وی دەمی ژی هەموو تشتێن دەوروبەری وێ هاتنە گوهۆڕین. ب هاریکاریا ڤێ شەربەتا شین، کاریگەریا شەربەتا ڕەنگ سۆر ل سەر وێ نەما و هەموو تشت وەکو بەرێ زڤڕین. جارەکا دی ئەلبێرتۆ بۆ ئەلبێرتۆڤە و داروبار زڤڕینە سەر ڕەنگێ خوە یێ ئاسایی و دەریاچە وەکو بەرێ لێ هات.

لێ ڤێ چەندێ ژی گەلەك نەڤەکێشا، بەلکو ئێدی هەر زوو هەموو تشت ل پێشچاڤێن سۆفیایێ ژێکدوور کەفتن. دارستان وەکو خوە نەما، ئێدی دارێن بچووك بوونە جیهانەکا تایبەت، هەتا بچووکترین بەلگێن داران وەکو جیهانەکا ئەفسانەی هاتە پێشچاڤێن وێ کو دشیا ب هزاران چیرۆکان ل سەر بدانیت.

د دەمەکێ کێم دا، ئەو دەریاچەیا بچووك بۆ دەریایەکا بێ دوماهی، ئەو ژی نە ژبەر کووراتی یان بەرفرەهیا وێ ب تنێ، بەلکو ژ بەر ڕەنگڤەدانا تیشکێن ڕۆناهیێ دناڤ ئاڤا وێ دا و هووردەکاریێن هێلێن کنارێن وێ. هێلد تێگەهشت ئەو دێ شێت ژیانەکا دوور و درێژ ب تەماشەکرنا ڤێ دەریاچەیا بچووك ڤە بورینیت، ڕەنگە هەتا پشتی مرنا وێ ژی ئەڤ دەریاچە هەروەکو نهێنیەکێ بمینیت.

پاشی سۆفیایێ سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی سەرێ دارەکێ کر کو سێ چووچکێن بچووك ئاواز دخواندن و یاری دکرن. سۆفیایێ دزانی بەری هینگێ ئەو چووچکە ل سەر وێ دارێ بوون لێ پشتی وێ شەربەتا ڕەنگ سۆر ڤەخواری، چ چووچك نەکەفتنە بەر چاڤێن وێ چونکی شەربەتا سۆر هەموو تشت کربوونە یەك و چ جوداهیێن تاکی نەهێلابوون.

سۆفیا ل سەر ڕێکا بەران ڕا هات هەتا گەهشتیە سەر گیاییێن وێ. جیهانەك ئاشکەرا کر کو بەری هینگێ قەت پێشبینیا وێ نەدکر، هەروەکو کا چەوا دەمێ مرۆڤ چاڤێن خوە دگریت و دچیتە دبن ئاڤێ ڤە چاڤێن خوە ڤەدکەت و بۆ یەکەم جار جیهانەکا نوو و سەیر دبینیت. چاڤێ سۆفیایێ ب تەڤنپیرکەکێ کەفت کو ب خۆرتی دناڤ گیایی دا یا دشێت ڕێکا خوە بکەت، پاشی مێشومورەکا ڕەنگ سۆر ژی کەفتە بەر چاڤێن وێ کو ژ سەرێ بەلگەکی دهاتە خوارێ و دچوو سەری ڤە، ل دووڤ دا ژی لەشکەرەکێ مێریان کو هەموویان پێکڤە ژ دل کار دکر. سۆفیایێ تێبینیا هندێ کر کو هەر مێریەك ب ڕێکەکا تایبەت یا پێن خوە بلند دکەت.

لێ تشتێ ژ هەموویێ سەیرتر ئەو بوو دەمێ چاڤێ وێ ب ئەلبێرتۆی کەفتی کو ل سەر دەرەجکان یێ ڕاوەستیای بوو. ئەلبێرتۆی وەکو کەسەکێ سەیر و بیانی خویا دکر و تا ڕادەیەکی وەکو بونەوەرێن ئەسمانی بوو، یان ژی وەکو کەسایەتیەکێ دناڤ چیرۆکان دا. سۆفیا ب خوە ژی هاتبوو گوهۆڕین، ئێدی ئەو نە ب تنێ بونەوەرەکا مرۆڤی یا د ژیێ پازدە سالیێ دا بوو، بەلکو سۆفیا ئاموندسنەکا ب تنێ و یەکانە بوو.

ئەلبێرتۆی پرسیار ژێ کر: "ئەرێ تو چ دبینی؟"

- "تو وەکو کەسەکێ سەیر یێ دهێیە پێشچاڤێن من."
- "ئاها هۆسایە؟"
- "ڕەنگە ئەز چ جاران تێنەگەهم کا مرۆڤ چیە و چەوا پەیدابوویە. د جیهانێ دا دوو مرۆڤێن وەك یەك نینن."
- "باشە تو دارستانێ چەوا دبینی؟"

- "وەکو بەری نوکە هەموو تشت پێکڤە دگرێدای نینن. نوکە وەکو گەردوونەکێ پڕی چیرۆك و سەرهاتیێن سەیر خویا دکەت."

- "ئەڤە وی تشتی دوپات دکەت یێ من هزرا خوە تێدا دکری. شووشەیا شین دەربڕینێ ژ تاکەکەسیێ دکەت، ئانکو ڕەنگڤەدانا فەیلەسۆف "سورین کیرکیگاردی" یە بەرامبەر فەلسەفەیا سەرجەمی یا ڕومانتیزمان. کەسەکێ دی یێ نەڕوێجی ل سەردەمێ کیرکیگاردی دژیا، ئەو ژی ڕومانڤیسێ ناڤدار هـ. س. ئەندرسون بوو، کو دیارکر دناڤ سروشتی دا چەندین نهێنی هەنە. ب ڤێ چەندێ ئەو دگەل بۆچوونا فەیلەسۆفێ ئەڵمانی "لیبینز"ی هەڤڕا دبیت ئەوێ بەری وی ب دوو چەرخان ژیای و هەمان بۆچوون ل دور سروشتی هەی و پاشی ڕەخنە ل فەلسەفەیا فەیلەسۆف "سپینوزای" ل دور سەرجەمیێ گرتی، هەروەکو کا چەوا کیرکیگاردی پشتی هینگێ ڕەخنە ل فەلسەفەیا هیگلی دگرت."

- "گوهێ من یێ ل تە، لێ بابەت هۆسا یێ سەیرە تا وی ڕادەی کەنیا من یا دهێت."

- "ئەز تێدگەهم. فرەکا دی ژ شووشەیا ڕەنگ سۆر ڤەخو و وەرە ب ڕەخ من ڤە ب ڕوونە خوارێ. بەری ڕۆژا خوە ب دوماهی بینین مە هند وەخت یێ مایی بەحسێ کیرکیگاردی بکەین."

پشتی سۆفیایێ فرەك ژ شەربەتا سۆر دای، هات و ب ڕەخ ئەلبێرتۆی ڤە ڕوونشت. جارەکا ی هەموو تشت وەکو بەرێ چوونە دناڤ یەك دا ڤە، هۆسا دیارە وێ فرەکا مەزن ل شەربەتا سۆر دابوو لەورا نەچاربوو فرەکا دی یا بچووك ل شەربەتا شین بدەت داکو هەموو تشت وەکو بەری هاتنا ئەلیسێ لێ بهێن.

- "بەلێ پا... ئەرێ ڕاستی چیە؟" کیژ ژ هەردوو شووشەیان، یا سۆر یان شین، سەربۆرا ڕاستەقینە یا ژیانێ دیار دکەت؟"

- "هەردوو پێکڤە، سۆفیا. ئەم نەشێین بێژین فەیلەسۆفێن ڕۆمانتیزمی د شاش بوون چونکی وان دگوت ب تنێ یەك ڕاستی هەیە. ڕەنگە ب تنێ وان لایەکێ ڕاستیێ دیت بیت لەورا یا وەگوتی."

- "باشە پا شووشەیا ڕەنگ شین؟"

- "چ پێنەڤێت کیرکیگاردی فرەکا مەزن یا لێدای، ژبەر هندێ وی گەلەك بەرەڤانی ژ تێگەهێ تاکەکەسیێ دکر. ب دیتنا وی، ئەم ب تنێ "کورێن سەردەمێ خوە" نینین، بەلکو هەر یەك ژ مە کەسایەتیەکا یەکانە هەیە و ب تنێ بۆ جارەکێ دژیت."

- "ئەرێ ما هیگلی ژی گرنگیەکا تایبەت ب ڤێ مژارێ نەددا؟"

- "نەخێر، وی بەهرا پتر تەماشەی دیرۆکێ دکر، ئاها ژبەر هندێ جۆرە هەستیارەك ل دەڤ کیرکیگاردی پەیدابببوو. ب دیتنا وی، فەلسەفەیا سەرجەمی یا ڕومانتیزمان و گرنگیپێدانا دیرۆکێ ل دەڤ هیگلی، بەرپرسیاریا تاکەکەسی بەرامبەر ژیانێ بەرزە دکەت. ژبەر هندێ کیرکیگارد د وێ باوەرێ دا بوو کو هەر یەك ژ هیگل و ڕومانتیزمان وەکو یەك بوون."

- "ئەز دزانم نوکە ئەو ژبەر ڤێ چەندێ نەساخبوویە."

- "سورین کیرکیگارد ل سالا 1813ێ ژ دایکبوویە. دایك و بابێن وی سەرەدەریەکا ڕەق دگەل کربوو و ب شێوەیەکێ توند پەروەردە کربوو، ژبەر هندێ هەستەکێ ئاینی یێ کوور د ناخێ وی دا هاتبوو چاندن."

- "ئەڤە نە یا هاریکارە."

- "ئەڤ هەستا وی یا ئاینی بۆ ئەگەر نیشانیا خوە تێکبدەت. ئەڤ کارێ وی ل دەڤ تەخا بورجوازی یێن کوپنهاگنێ کارەکێ نەشیرین و شەرمزار بوو، ژبەر هندێ ئەو بۆ جهێ ترانەپێکرن و ڕەخنەگرتنێ لێ پشتی هینگێ فێربوو کا چەوا دێ بەرسڤا ڕەخنەیێن وان دەت و بەرەڤانیێ ژ خوە کەت. ل دوماهیێ گەهشتە وی ڕادەی هەتا "ئیسبن"ی ناسناڤێ وی کریە "دوژمنێ خەلکی."

- "ئەڤە هەموو، چونکی وی نیشانیا خوە تێکدا."

- "نە ژبەر ڤێ چەندێ ب تنێ. د قۆناغێن دوماهیێ یێن ژیێ خوە دا، ڕەخنەیێن دژوار ل کەلتورێ ئەوروپی دگرت و دگوت: "ئەوروپا هەموو یا بەرەڤ ئیفلاسبوونێ دچیت". وی هەستپێدکر یێ د سەردەمەکێ دلڕەق و بێ هاریکاری دا دژیت، ژبەر هندێ ڕەخنەیەکا مەزن ل دێرا دانیمارکی یا لوتەری دگرت و ناڤێ وێ کربوو "دێرا ڕۆژا یەکشەمبێ."

- "د سەردەمێ ئەڤرۆکە ژی دا ئەم دشێین ناڤێ وێ بکەینە "مەسیحیا هەلکەفتنێن مەزن یا مەسیحیبوونا وان"، پتریا خەلکی ژبەر وەرگرتنا دیاریان حەز ژ وێ رۆژێ دکەن."

- "ئاها تە دەستێ خوە دانا سەر برینێ. کیرکیگارد دگوت ئاین ب خورتی خوە ل سەر خەلکی زالێ دکەت و ل دژی ئەقلی دراوەستیت، ژبەر هندێ ئەم دکەڤینە دناڤبەرا دوو هەلبژارتنان دا و نەچار دبین ئاینی یان ئەقلی بهەلبژێرین. بۆ نموونە کەسەك نەشێت ببیتە "مەسیحیەکێ نەتەمام" یان "مەسیحیەکێ تەمام". یان کا مەسیح زیندی بوویە یان نە. یان ژی هەکە ئەو ژناڤ مریان رابوویە ڤە، دیارە ئەو یێ ژبەر رزگارکرنا مە مری."

- "تێگەهشتم."

- "لێ کیرکیگاردی ئاگەهـ ژ هندێ هەبوو کو دێرا مەسیحی و پتریا کەسێن مەسیحی وەکو شێوازێ قوتابخانێ تەماشەی مژارێن ئاینی دکەن. ب دیتنا وی، ئاین و ئەقل وەکو ئاڤ و ئاگری نە. ژبەر هندێ هەتا کەسەك ببیتە مەسیحی نابیت ب تنێ باوەریێ ب مەسیحی بینیت، بەلکو باوەریا وی هینگێ دێ تەمام بیت دەمێ ل دووڤ رێبازا حەزرەتێ مەسیحی دچیت."

- "باشە هیگلی چ پەیوەندی ب ڤێ چەندێ هەموویێ ڤە هەبوو؟"
- "باشە. دبیت یا باشتر ئەو بیت ئەم ژ ڤێرێ دەست پێنەکەین."
- "باشە، دا بزڤرینە پاشڤە و سەر و ژ نوو دەستپێبکەین."

- " کیرکیگاردی د ژیێ هەڤدە سالیێ دا دەست ب خواندنا لاهوتی کر، لێ رۆژ بۆ رۆژێ پتر هزرا وی دچوو سەر مژارێن فەلسەفی. د ژیێ بیست و حەفت سالیێ دا بروانامەیا دبلومێ د بوارێ فەلسەفێ دا بدەستڤەئینا، ئەو ژی ب رێکا ڤەکۆلینەکێ ل ژێر ناڤێ "ڤەکۆلینەك ل دور تێگەهێ ئایرونی و پەیوەندیا وێ دگەل سۆکراتی" کو تێدا هێرش دکرە سەر تێگەهێ رومانتیزمێ بۆ ترانەپێکرنێ. وی د "ئایرونی یا سۆکراتی" دا هەڤدژیەك دگەل ڤی جۆرێ ئایرونیێ دا ددیت، ب رەنگەکی سۆکراتی ترانەپێکرن وەك ئالاڤەك بکاردئینا ژ بۆ دیارکرنا بەهایێ راستەقینە و کوور یێ ژیانێ. کیرکیگاردی ددیت کو سۆکرات، بەروڤاژی فەیلەسۆفێن رومانتیزمی، بیرمەندەکێ هەبوونخوازی* یە، ئانکو هەبوونێ پشکەکا هەرە مەزن و سەرەکی یا فەلسەفەیا وی پێکدئینا."

---

* الوجودية Existentialism

- "و پاشی..."

- "پشتی کیرکیگاردی نیشانیا خوە دگەل ڕێجین ئۆلسونێ ب دوماهی ئیناى، ل سالا 1841ێ بەرە ڤ بەرلینێ چوو و دەست ب خواندنا وانەیێن شیلنگی کر."

- "باشە وى هیگل ل وێرێ دیت؟"

- "نەخێر.. هیگلی بەرى هینگێ ب دەهـ سالان وەغەرکربوو لێ هێشتا هزروبیرێن وى د ساخبوون، نە ل بەرلینێ ب تنێ بەلکو تا ڕادەیەکی ل ئەوروپا هەموویێ و ڕێبازا وى وەکو نموونەیەکا هەڕەباش ژ بۆ شرۆڤەکرنا مژارێن جودا جودا دهاتە بکارئینان. ئەو د وێ باوەرێ دا بوو کو "ڕاستییێن بابەتی" یێن فەلسەفەیا هلینیزمێ بانگەوازى بۆ دکر، ل سەر هەبوونا تاکەکەسی ناهێنە بجهـ ئینان."

- "باشە پا کیژ جۆرێ ڕاستیان د گرنگن؟"

- "ل دووڤ بوچوونا کیرکیگاردی، نە یا گرنگە ئەم ڕاستییێ ب تنێ وەك ناڤ ببینین، بەلکو یا گرنگ ئەوە ئەم وان ڕاستیان ببینین یێن پەیوەندى ب ژیانا هەر کەسەکی ڤە هەین... یا گرنگە وێ ڕاستییێ ببینم یا بۆ من گرنگ. ب ڤی ڕەنگی کیرکیگارد وەل مرۆڤی دکەت بەرامبەر ڕێبازا وى براوەستی. هەروەسا وى ددیت کو هیگلی ژبیرکربوو ئەو ژى مرۆڤە. وى ب ڤی رەنگی بەحسێ پرۆفیسورێن هیگلیزمی دکر: دەمێ پرۆفیسور هەموو ژیانێ شرۆڤە دکەت و بەحسێ هەبوونێ دکەت، لێ ژبەر هزرێن وى یێن بەربەلاڤ، ژ بیرا وى دچیت کا ناڤێ وى چیە، هەروەسا ل بیرا وى نینە کو ئەو ژى مرۆڤە. ب راستی ژى ئەو مرۆڤەکە نەك زێدەتر. نەك بەشەکێ بچووك یێ یاسایەکا جوان."

- "یا ب زەحمەتە ئەز بشێم بەرسڤەکا گشتی بدەمە تە. ب دیتنا کیرکیگاردى، وەسفکرنا سروشتێ مرۆڤی چ مفا تێدا نینە، بەلکو هەبوونا مرۆڤی وەك تاکەکەس یا گرنگە. مرۆڤ نەشێت ل سەر مێزەکا نڤیسینێ هەبوونا خوە ببینیت، بەلکو دەمێ مرۆڤ دکەڤیتە هەمبەر چەندین هەلبژارتنان، وێ گاڤێ هەست ب هەبوونا خوە دکەت. ئەم دشێین بۆ پتر ڕۆهنکرنا ڤێ چەندێ بیرا خوە ل وێ چیرۆکێ بینین یا "بودا" بۆ مە ڤەدگێرێت."

- "بودا؟"

- "بەلێ. فەلسەفەیا بوداى ژى هەبوونا مرۆڤی دەست پێدکەت."

- "ڕەبەنەك هەبوو هزردکر بودا چ بەرسڤێن باوەپێکری بەرامبەر پرسیارێن مەزن و گرنگ نادەت، وەکو وێ پرسیارا دبێژیت کا جیهان چیە و مرۆڤ چیە. بودای ب ڤی ڕەنگی بەرسڤا وی دا: دەمێ تیرەکا ژەهکری ب کەسەکی دکەڤیت و بریندار دبیت، لێ ئەڤ زەلامێ بریندار ب چ ڕەنگان پرسیار ناکەت کا ئەڤ تیرە ژ چ هاتیە دروستکرن یان چ کیژ جۆری یە، یان ژ کیژ لای هاتیە و ڤێکەفتیە؟"

- "بەلکو ب تنێ وی دڤێت تیری ژ لەشێ وی بینە دەرێ و برینا وی دەرمان بکەین."

- "بەلێ، مانە هۆسایە؟ ل دەڤ وی ئاها ئەڤ چەندە یا گرنگە."

- "بودای ژی وەکو کیرکیگاردی ب شێوەیەکێ کوور هزرکر دکر. هەبوونا وی ب تنێ بۆ ماوەیەکێ کورت دێ ڤەکێشیت، ژبەر هندێ چ مفا تێدا نینە ل پشت مێزا خوە ب ڕوونتە خوارێ و دانوستاندنێ ل دور سروشتێ "بیرۆکەیا جیهانێ" بکەت."

- "تێگەهشتم."

- "هەردیسان کیرکیگارد دبێژیت: ڕاستی تشتەکێ خویی یە د ناخێ مرۆڤی دا، لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت هەموو بۆچوون د وەکهەڤن، بەلکو ئەو ڕاستی د گرنگن یێن دناڤ کەسایەتیا مرۆڤی ب خوە دا هەین."

- "دێ شێی نموونەیەکێ ل سەر ڤان ڕاستیێن خویی بۆ من ئینی."

- "باشترین نموونە ل ڤێرێ ئاینێ مەسیحی یە کا ئەرێ یێ ڕاستە یان نە. ئەڤ پرسیارە هند یا ب زەحمەتە ئەم نەشێین ب شێوەیەکێ تیوری یان ئەکادیمی بەرسڤێ ل سەر بدەین. ئەڤ پرسیارە ل دەڤ کەسەکێ کو خوە وەك "بونەوەرەك د هەبوونێ دا" دبینیت، پەیوەندی ب مرن و ژیانێ ڤە هەیە. ئانکو نە بابەتەکێ هۆسایە مرۆڤ بشێت گەنگەشێ ل سەر بکەت ب تنێ دا بۆ خوە خوشیێ ژ گەنگەشێ ببینیت، بەلکو تشتەکێ هۆسایە ئەم پێکۆلێ دکەین ب هەموو خوینگەرمی و ڕۆح و ناخێ خوە ڤە لێ نێزیك بین."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "ئەگەر تو کەفتیە د ئاڤێ دا، ژ نوو تو ناهێی پرسیارێن فەلسەفی ژ خوە بکەی کا ئەرێ دێ خەندقی یان نە. هەردیسان بۆ تە یا گرنگ نابیت کا ئەرێ تیمساح د ئاڤێ دا هەنە یان نە، چونکی مژارا هەڕە سەرەکی د ڤی کاودانی دا پەیوەندی ب مرن و ژیانێ ڤە هەیە و کا تو دێ شێی خوە قورتال کەی یان نە."

- "سوپاس بۆ ڤێ ڕۆهنکرنێ."

- "پێدڤیە تو جوداهیێ بێخیە دناڤبەرا پرسیارەکا فەلسەفی دەربارەی هەبوونا خودای و هەلویستی تاکەکەسەکی ل دور هەبوونا خودای. چونکی دێ بینین هەر کەسەك دشێت ژ دەڤ خوە بەرسڤا ڤان جۆرە پرسیاران بدەت لێ باوەری ئینان ب تنێ دشێت مە نێزیکی ڕاستیا ڤان مژارێن سەرەکی بکەت. لێ ب بۆچوونا کیرکیگاردی، ئەو مژارێن ئەم دشێین ب ڕێکا ئەقلێ خوە بەرسڤ بدەین، مژارێن یەدەگ و نەهند گرنگن."

- "نەخێر. ئەز تێنەگەهشتم، بۆ من پتر ڕۆهن بکە."

- "ئەگەر بێژین (8+4=12)، ئەم ب تەمامی ژ ئەنجامێ ڤێ هاوکێشێ د پشتڕاستین. ئەڤە نمونەیەك بوو ل سەر وان ڕاستیان یێن ئەم ب ڕێکا ئەقلێ خوە دشێین بەرسڤ بدەین و هەموو فەیلەسۆفێن سەردەمێ دیکارتی ژی وەرە بەحسێ وان کریە. لێ ل دەمێ کرنا نڤێژان ئەم بەحسێ ڤان ڕاستیان دکەین؟ هەلبەت نەخێر، چونکی ئەڤ ڕاستیە د گشتینە."

- "باشە پا باوەری، ڕۆلێ باوەریێ د ڤان ڕاستیان دا چیە؟"

- "تو چ جاران نزانی کا کەسەك ل دور شاشیەکا تە ل تە بوری یە یان نە، ژبەر هندێ بۆ تە گەلەك یا گرنگە تو بزانی کا دێ ل تە بوریت. دبیت ئەڤ مژارە ب درێژاهیا ژیانێ دگەل تە بمینیت. هەردیسان تشتەکێ دەگمەنە بزانی کا کەسەك ژ دل حەز ژ تە دکەت یان نە، بەلکو ب تنێ تو دشێی هیڤیا هندێ بخوازی ئەو کەس ژ دل حەز ژ تە بکەت. لەوڕا ئەڤ مژارە بۆ تە وەك تاکەکەس گەلەك ژ هندێ گرنگترە بزانی سەرجەمێ هەرسێ گوشەیێن سێگوشەکێ دبنە 180 پلە. یان ژی نموونەیەکا دی، دەمێ بۆ یەکەم جار کەسەك ماچەکێ ددانیتە تە، ل وی دەمی ڤەت "یاسایا ئەگەرێ ڕوودانان" بۆ تە یا گرنگ نینە."

- "هەلبەت نەخێر، چونکی ل وی دەمی ژ کەیفادا دێ فڕم."

- "یەکەم، باوەری بۆ هەموو وان مژاران یا گرنگە یێن پەیوەندی ب ئاینی ڤە هەی. ئەگەر ئەز بشێم خودێ ببینم یان دەستێ خوە بکەمێ، ل وی دەمی من باوەری نامینیت، لێ ژبەرکو ئەز نەشێم وە بکەم، ئەز پێدڤی ب باوەری ئینانێ مە. ئەگەر من دڤێت باوەریا خوە بپارێزم، پێدڤیە ئەز خوە ژ وێ هزرێ دوور بکەم کو خودای ببینم یان دەستێ خوە بکەمێ."

- "ئەڤ ئاخفتنا تە گوتی بۆ تێگەهشتنێ یا ب زەحمەتە."

- "گەلەك كەسان بەری نوكە پێكۆل كریە هەبوونا خودای بسەلمینن یان ژی هەر چ نەبیت ب رێكا ئەقلی هەست ب هەبوونا وی بكەن. لێ ئەگەر ئەم ب ڤان بەلگەیێن ئەقلی ل سەر هەبوونا خودای رازیبووین، ل وی دەمی دێ باوەریا خوە یا راستەقینە ژ دەستدەین و پشتی هینگێ هەموو بیروباوەرێن هەستێن ئاینی ژی ل دەڤ مە دێ مرن. نە یا گرنگە بزانین كا ئاینێ مەسیحیەتێ یان هەر ئاینەكێ دی یێ دروستە یان نە، لێ یا گرنگ ئەوە بزانم ئەو ئاینێ ئەز ل سەر بۆ من وەك تاكەكەس یێ دروستە یان نە. ل چەرخێن ناڤەراست، گوتنا Credo quia absurdum گەلەك یا بەربەلاڤ بوو."

- "رامانا وێ چیە؟"

- "ئانكو "ژبەر هندێ ئەز باوەر دكەم، چونكی ئەڤ چەندە دژی ئەقلی یە". ئەگەر ئاینێ مەسیحیەتێ یان هەر ئاینەكێ دی ئاراستەی ئەقلێ مە كربایە، ل وی دەمی پێدڤی ب باوەرییێ نەدبوو."

- "ئەز د ڤێ گەهشتم."

- "ئاها ب ڤی رەنگی مە زانی كا مەرەما كیركیگاردی ل دور تیگەهێن "هەبوون" و "راستیا خویی" و "باوەری"ێ چیە. وی ئەڤ هەرسێ تێگەهە وەك رەخنەیەك دژی دابونەریتێن فەلسەفێ ئازراندن ب تایبەت دژی فەلسەفەیا هیگلی. بەلێ د كاكلكا خوە دا، رەخنە ل شارستانیەتێ دگرت: ب رەنگەكی مرۆڤ د جڤاكێن سەردەم دا یێ بوویە "بینەر" یان "تشتەكێ گشتی". هەردیسان سیمایێ پتریا خەلكی ژی یێ بوویە "ئاخفتنكەرێن پربێژ"، ئانكو هەموو مرۆڤ هزرا خوە د هەمان تشت دا دكەن یان ژی هەموویان باوەری ب هەمان تشت هەیە بێ وان پەیوەندیەكا راستەقینە و راستەخو دگەل وی تشتی هەبیت."

- "من دڤیا پرسیار بكەم كا ئەرێ چ هێلێن پەیوەندییێ دناڤبەرا كیركیگاردی و بابێ جوانایێ دا نینن."

- "كێمترین تشتێ ل دور ڤێ پرسیارێ بشێم بێژم ئەوە كو وی هەموو گاڤان ب چاڤێ دلوڤانییێ تشت شرۆڤە نەدكرن بەلكو پێنوسێ وی گەلەك یێ دژوار بوو و دزانی دێ چەوا رەخنێ گریت. گەلەك جاران هند پەند دگوتن، بۆ نموونە وی دگوت "پتریا مرۆڤان دوژمنێن راستییێ نە" یان ژی "راستی هەموو گاڤان یا دگەل كەسێن كێمینە". هەردیسان د

وێ باوەرێ دا بوو کو پتریا خەلکی ب شێوەیەکێ ئاسایی دژین بێ کو پرسیارێ ژ خوە بکەن کا بۆچی ئەو دژین."

- "خراپە ئەم یاریکان ل دور خوە کەم بکەین، لێ یا خراپتر ئەوە ئەم ببینە یاریك."

- "ئەڤ گوتنا تە بەرێ مە ددەتە هندێ بەحسێ تیورا کیرکیگاردی ل دور "هەرسێ قۆناغێن ل سەر رێکا ژیانێ" بکەین."

- "ببورە؟"

- " کیرکیگارد د وێ باوەرێ دا بوو کو سێ جۆرێن جودا یێن دیتنا دنیایێ یان فەلسەفەیا ژیانێ هەنە، وی پەیڤا "قۆناغ" بۆ وان بکاردئینا و ناڤێن وان کربوونە "قۆناغا جوانییێ" و "قۆناغا ئەتیکی" و "قۆناغا ئاینی". مەرەما وی ژ بکارئینانا پەیڤا "قۆناغ" ئەو بوو کو وی دڤیا بێژیت ئەم دشێین ل دەڤ هەردوو قۆناغێن دەستپێکێ براوەستین و پاشی ژ نیشکەکێ ڤە خوە پاڤێژیتە د قۆناغا ل دووڤ دا. سەرەرای کو پتریا مرۆڤان ب درێژاهیا ژیانا خوە ب تنێ د یەك قۆناغ دا دژین."

- "ئەز پێدڤی پتر رۆهنکرنێ مە، من دڤێت بزانم نوکە ئەز د کیژ قۆناغێ دا یا راوەستیای مە."

- "ئەو کەسێ د قۆناغا جوانییێ دا دژیت، ئەو کەسە یێ ب تنێ د ساتێ خوە دا دژیت و د هەر خولەکەکێ دا ب تنێ ل خوشیێ دگەرییێت و باشیێ د جوانی و خوشیێ ب تنێ دا دبینیت، مرۆڤەکی ب ڤی رەنگی ب تەمامی دناڤ جیهانا هەستان دا دژیت. ژبەر هندێ ئەو کەس دێ بیتە ئێخسیرێ حەز و ئارەزوییێن خوە و دێ کەربێن خوە ژ هەموو وان تشتان ڤەکەت یێن ب دلێ وی نەبن یان وی بترسینن."

- "سوپاس... ئەز گەلەك کەسێن ژ ڤی جۆری دنیاسم."

- "کەسەکێ رومانتیزم یێ نموونەیی ژی جوانپەرستەکێ ئاشکەرایە. نەك ب تنێ ئەو تشتێ هەستێ خوشیێ ژێ وەردگرن، قۆناغا جوانییێ دەستنیشان دکەن، بەلکو هەلویستێ وان ل دور راستیا هونەر و فەلسەفێ ژی دەستنیشان دکەت. تا وی رادەی ئەو دشێت ب چاڤێ جوانی تەماشەی نەخوشی و ئێش و ژانان ژی بکەت. ل ڤێرێ تشتێ سەرڤە سەرڤە کونترۆلێ ل سەر وی دکەت. ئیبسن د Peer Gynt خوە دا بەحسێ کەسایەتیا جوانپەرستیێ دکەت."

- "ئەز تێگەهشتم کا تو چ دبێژی."

- "ئەرێ بیرا تە ل کەسەکی هات؟"

- "نە گەلەك، لێ دبیت ئەڤ چەندە ل سەر مایجەری بگونجیت."

- "بەلێ. هەرچەندە ئەڤە نموونەیەکا هەرە باش بوو ل سەر تڕانەپێکرنا ڕۆمانتیزمان، لێ پێدڤیە جارەکا دی تە ئاگەهـ ژ دەڤێ خوە هەبیت."

- "تو چ دبێژی؟"

- "چ نە. ئەڤە نە خەتایێن تەنە."

- "باشە بەردەوام بە."

- "ئەو کەسێ د قۆناغا جوانییێ ب تنێ دا دژیت، هەر زوو دوودلی و ڤالاهی دەستێ خوە ب سەر ژیانا وی دا دگێڕیت. لێ ئەگەر ئەڤ چەندە ڕووبدەت ژی، ئەڤ چەندە تشتەکێ ئەرێنی یە و هێشتا هیڤیەك هەیە. ب دیتنا کیرکیگاردی، دوودلی تا ڕادەیەکی یا ئەرێنی یە، چونکی وەل مرۆڤی کەت خوە د "قۆناغا هەبوونێ" دا ببینیت، دبیت ل ڤێرێ کەسێ جوانپەرست پێنگاڤەکا مەزن بهاڤێژیت و بچیتە د قۆناغەکا بلندتر دا، دبیت ژی وەنەکەت و چ تشت ژی ڕوونەدەن. چ مفا د تێڕابوونا دناڤ تارپاتییێ دا نینە ئەگەر هەتا دوماهیێ مرۆڤ یێ بەردەوام نەبیت و نەگەهیتە ڕووناهیێ. مژار ل ڤێرێ مژارا "دەستپێشخەرییێ"یە و کەس نەشێت ژ بلی تە ڤێ دەستپێشخەرییێ بکەت. پێدڤیە تو ب تنێ بهەلبژێری."

- "ئەڤ چەندە بیرا من ل بڕیارا هێلانا جگارەکێشانێ دئینیت."

- "بەلێ تا ڕادەیەکی. دەمێ کیرکیگارد بەحسێ ڤێ چەندێ دکەت، ئەو بیرا مە ل سۆکراتی دئینیت ئەوێ دگوتی هەر ئاگەهیەکا ڕاستەقینە ژ ناخێ مرۆڤی دەردکەڤیت و پێدڤیە هەلبژارتنەك هەبیت کو مرۆڤی پالبدەت خوە ژ قۆناغا جوانییێ بهاڤێژتە د قۆناغا ئەتیکی دا و پاشی بەرەڤ قۆناغا ئاینی. ئاها ئیبسنی ئەڤ تشتە د Peer Gynt دا دیارکربوو. ب هەمان شێوە، نڤیسەرێ ڕۆسی "فیودور دوستۆیوڤیسکی" ژی شڕۆڤەکرنەکا هەرەباش ل دور ڤێ هەلبژارتنێ د ڕۆمانا خوە یا ناڤدار "تاوان و سزا" دا پێشکێشی مە دکەت و دیار دکەت تا چ ڕادە ئەڤ هەلبژارتنە ژ ئەنجامێ نەچاری و گومانێن ناخێ مرۆڤی دا دزێن."

- "ئانکو تە دڤێت بێژی: د باشترین ڕەوش دا، مرۆڤ قۆناغەکا دی یان دیتنەکا دی بۆ ژیانێ دهەلبژێریت."

- "بەلێ. ب ڤی ڕەنگی ئەم دچینە دناڤ قۆناغا ئەتیکی دا کو قۆناغەکا بالکێشە و مرۆڤ تێدا پێکۆلێ دکەت ل دووڤ پیڤەرێن ئەتیکی بژیت. دبیت ئەڤ قۆناغە فەلسەفەیا کانتی بینتە بیرا مە ئەوێ دگوتی دڤێت ئەم پێکۆلێ بکەین ل دووڤ یاسایێن ئەتیکی یێن د ناخێ خوە دا بژین. کیرکیگارد ژی وەکو کانتی بەرێ خوە ددەتە بەشەکێ هەستیار د لەشێ مە دا و دبێژیت: نە یا گرنگە بزانین کا چ تشت یێ ڕاستە و چ یێ شاشە، بەلکو یا گرنگ ئەوە ل سەر بنەمایێ جوداهیا دناڤبەرا ڕاستی و شاشیێ دا ڕەفتاری بکەین. ئەڤە ل دەمەکی کەسێ جوانپەرست ب تنێ گرنگیێ ب وان تشتان ددەت یێ خوشیێ ژێ دبینیت."

- "ئەگەر مە بڕیار دا ب ڤی ڕەنگی بژین، مانە دێ ژیانێ ل بەر خوە گران کەین؟"

- "چ پێنەڤێت، بەلێ. دگەل ڤێ چەندێ، کیرکیگارد د وێ باوەرێ دا نەبوو کو قۆناغا ئەتیکی بەسە بۆ مرۆڤی، چونکی مرۆڤەکێ خوەدان ئەرك ژی ل دوماهیێ دێ هەست ب واستیانێ کەت و ژ وی ئەرکی بێزار بیت، چونکی دڤێت هەموو گاڤان ئاگەهـ ژ شولێ خوە هەبیت و ڕەنگە بەهرا پتر د ژیێ دانعەمریێ دا هەست ب ڤێ واستیانێ بکەت. ڕەنگە هندەك کەس دووبارە بزڤڕنە قۆناغا جوانیێ، لێ هندەکێن دی ژی دێ بەرەڤ قۆناغا دوماهیێ یا ئاینی ڤە چن، ئانکو دێ وێرن پێنگاڤەکا مەزن بەرەڤ ناخێ باوەریێ ڤە هاڤێژن. ل وی دەمی، ئەو دێ باوەریێ ژ خوشیا هەستان و ئەنجامادانا ئەرکان باشتر بینن. ل دووڤ گوتنا کیرکیگاردی، هەکە یا بترس بیت کو مرۆڤ ب زیندی بکەڤیتە بەر دەستێن خودای، ل وی دەمی دێ پتر شێت ب ئاشتی و ئارامی ژیت."

- "هەلبەت ب ڕێکا ئاینێ مەسیحیەتێ."

- "بەلێ. ب دیتنا کیرکیگاردی، قۆناغا ئاینی، ئاینێ مەسیحیەتێ یە. لێ ڤێ بۆچوونێ کاریگەریەکا مەزن ل سەر فەیلەسۆفێن نەمەسیحی ژی بجهـ هێلا. ل چەرخێ بیستێ، جۆرەکێ نوو یێ فەلسەفێ سەرهلدا ب ناڤێ "فەلسەفا هەبوونخوازیێ" و پتریا بیرۆکەیێن خوە ژ کیرکیگاردی وەرگرتن."

سۆفیایێ تەماشەی دەمژمێرا خوە کر و گوت: "پێدڤیە نوکە ئەز بزڤڕم هەکە دایکا من دێ ئاریشەکێ چێکەت."دگەل ڤێ گوتنێ، وێ دەستێ خوە بلند کر و خاترا خوە ژ مامۆستایێ خوە یێ فەلسەفێ خواست و پاشی بەرەڤ بەلەم و دەریاچێ ڤە چوو.

# ماركس

*... شەبەنگەك دناڤ ئەوروپایێ دا سەرهلدا...*

هێلد ژ سەر تەختێ خوە ڕابووڤە و چوو بەر پەنجەرکێ ڕاوەستیا و تەماشەی کەنداڤی کر. دەمێ وێ ڕۆژا خوە یا شەمبی ب خواندنا چیرۆکا سۆفیایێ دەستپێکری، گەهشتبوو ڕۆژا ئاهەنگا جەژنا بوونا سۆفیایێ یا پازدە سالیێ. هەلبەت بەری هینگێ ب ڕۆژەکێ جەژنا بوونا وێ ژی بوو.

ئەگەر بابێ وێ زانیبا کو ئەو هەتا دوهی یا گەهشتە وی جهی یێ بەحسێ جەژنا بوونا سۆفیایێ دکەت، ڕەنگە وێ ب دروستاهی باوەر نەکربایە. دوهی هەموویێ وێ چ کار نەکربوون ب تنێ خواندنا پەرتووکێ نەبیت و دوماهیك جهێ لێ ڕاوەستیای ئەو بوو دەمێ ئەلبێرتۆ و سۆفیایێ پێکڤە سترانا کلاسیکی یا جەژنا بوونا تە پیرۆزHappy Birthday گوتی بێ ئەڤ تشتە سەرنجا وێ ڕاکێشیت.

و نوکە، سۆفیایێ بڕیاردا بوو هەموو کەسان داخوازا بکەتە ئاهەنگەکا فەلسەفی دناڤ باخچەی مالا خوە دا یا کو تێدا بابێ هێلدێ ژی ژ لوبنانێ دزڤڕیت. هێلد گەهشتە وێ باوەریێ کو تشتەکێ نەچاڤەڕێکری دێ هێتە ڕێکا وێ یا بابێ وێ ژی.

هەرچەوا بیت، نوکە ئەو ژ تشتەکی پشتڕاستە. ئەو ژی بابێ وێ بەری بزڤڕیتە مالا خوە ل بجێرکلی، پێدڤیە، سۆپرایزەکا نەخوش و ب ترس وەربگریت، هەلبەت ئەڤە

کێمترین خزمەتە ئەو پێشکێشی سۆفیایێ و ئەلبێرتۆی دکەت، نەخاسم پشتی وان داخوازا هاریکارییێ کری.

دایکا وێ هێشتا ل دەڤ بەندەرێ بەلەمان بوو. هێلد چوو ڤاتێ خوارێ داکو تێلەفۆنەکێ بۆ ئان و پیتەری ل کوپنهاگنێ بکەت.

- "ئەلو، کی دگەل منە؟"

- "سپێدە باش، ئەڤە ئەزم، هێلد."

- "جهێ خوشحالییێ یە تە هزرا مە کری، ئەرێ هەموو تشت ل دەڤ هەوە ب سەلامەتن؟"

- "بەلێ. ها ئەڤە دێ بێهنڤەدان دەستپێکەت و حەفتیەك یا مایی دێ بابێ من ژ لوبنانێ زڤریت."

- "چ پێنەڤێت ئەڤ چەندە دێ تە گەلەك کەیفخوش کەت، هێلد."

- "چ پێنەڤێت، من ژی هەر ژبەر هندێ پەیوەندی یا ب هەوە کری."

- "ئاها؟"

- "ئەز دبێژم فرۆکەیا بابێ من ل ڕۆژا شەمبی ڕێکەفتی 23 هەیڤێ ل دەمژمێر پێنجی ئێڤاری ل کوپنهاگنێ دێ‌دادەت، ئەرێ ل وێ ڕۆژێ هوون دێ ل مال بن."

- "ئەز دبێژم دێ ل مال بین، بۆچی؟"

- "من دڤیا پرسیارا هندێ بکەم کا هوون دێ شێن خزمەتەکا بچووك بۆ من کەن؟"

- "چ پێنەڤێت، فەرمووو."

- "یا ڕاستی بیت خزمەتەکا بچووکە، نزانم کا دێ هوون شێن کەن یان نە."

- "دێ کا بێژە تە بۆ من کرە مەرەق."

ل دوو ڤ دا هێلد دەست ب چیرۆکا خوە دگەل فائیلا بابێ وێ بۆ کریە دیاری و چیرۆکا سۆفیایێ و ئەلبێرتۆی کر. ئەو نەچاربوو چەندین جاران ئاخفتنا خوە دووبارە بکەت چونکی بەردەوام وێ و مەتا خوە دکرە کەنی، لێ وێ تێلەفۆن نەدانا هەتا ب دروستاهی بەحسێ پلانا خوە نەکری و کا دێ چەوا ئەنجام دەن.

**ئێدی هەموو تشت د ئامادەبوون و چ تشت نەمان ب تنێ ئەو نەبیت کو پێدڤی بوو هندەك پێرابوونێن تایبەت ل مال ئەنجام بدەت. هەلبەت هێشتا چەندین ڕۆژ ژی یێ ل بەر سینگێ وێ ماین.**

**هێلدێ دەمێ خوە یێ مایی دگەل دایکا خوە بوراند. پشتی نیڤرۆ هەردوو پێکڤە ب ترۆمبێلێ چوونە سینەمایێ ل کریستیانستاند. دەمێ ئەو ب ڕەخ فرۆکخانا کجیفیك ڕا بورین، بیرۆکەیەك هاتە سەر هزرا وێ کو پێنگاڤەکێ ل سەر پلانا خوە زێدە بکەت. دەمێ دنیا بوویە شەڤ ژی، هێلد چوو سەر جهێن خوە و دەست ب تەمامکرنا چیرۆکا سۆفیایێ کر.**

دەمێ سۆفیا زڤڕیە د کۆلکێ خوە ڤە، دەمژمێر نێزیکی هەشتی شەڤێ بوو. دایکا وێ ژی مژوولی لادانا هندەك داڤێن گژوگیایێ دناڤ باخچەی و نێزیکی دەرگەهێ کۆلکێ بوو.

- "کچێ ئەڤە تو ژ کیڤە دەرکەفتی؟"
- "ژ کۆلکی؟"
- "کۆلکێ چ؟"
- "ئەرێ ما تو نزانی ل پشت پەرژانێ باخچەی، داروبار و گژوگیایی وەکو کۆلکەکێ بچووك یێ دروستکری؟"
- "بەلێ پا تو کیڤە چووبووی سۆفیا؟ ئەڤە نە جارا یەکێ یە تو خوە ژ پشتی نیڤرو وەرە بەرزە دکەی بێ کو بەری هینگێ من ئاگەهدار بکەی."
- "ببورە دادێ، سەقایێ دنیایێ ژ دەرڤە گەلەك یێ خوش بوو، لەوڕا من دڤیا ب پیان بچمە دەرکەفتنەکا درێژ."

دایکا وێ ب ناڤچاڤ گرێ ڤە تەماشەی وێ کر.

- "ئەز یا پشتڕاستم تو یا چوویە دەڤ وی فەیلەسۆفی."
- "من بەری نوکە گوتبوو تە ئەو ژی حەز ژ دەرکەفتنان دکەت."
- "باشە ئەو دێ هێتە ئاهەنگا جەژنا بوونا تە؟"
- "چ پێنەڤێت، ئەڤ چەندە دێ بیتە جهێ خوشحالیا وی."

- "هەروەسا یا من ژی، ئەز یا ڕۆژان دهەژمێرم هەتا وی ژڤانی، سۆفیا!"

دەنگێ دایکا وێ نەیێ سروشتی بوو دەمێ ئەڤ ئاخفتنە گوتی، ژبەر هندێ سۆفیایێ ل سەر ئاخفتنا وێ زێدەکر و گوتێ: "ئەز یا کەیفخوشم چونکی من دایك و بابێن جوانایێ ژی یێن داخواز کرین، چونکی من نەدڤیا ڕەوشا ئاهەنگێ یا نەخوش و جهێ شەرمێ بیت."

- "ئەز دێ دوو ئاخفتنان بێژمە ڤی ئەلبێرتۆی، دوو ئاخفتنێن تایبەت."

- "هوون دشێن بچنە د ژوورا من ڤە، ئەگەر تە بڤێت. ئەز یا پشتڕاستم ئەڤ چەندە دێ یا ب دلێ تەبیت."

- "دا چ بێژمە تە، نامەیەك یا بۆ تە هاتی."

- "ئاها، باشە."

- "مورا پۆستەی دبێژیت ئەو یا ژ دەڤ هێزا یەکەیێن نەتەوەییێن یەکگرتی ل لوبنانێ هاتی."

- "هۆسا دیارە ئەو یا ژ دەڤ برایێ ئەلبێرتۆی هاتی."

- "گوهێ خوە بدە من... بەس ڤان ئاخفتنان بێژە."

سۆفیایێ هەست ب ترسێ کر، لێ بەرسڤەکا بەرئاقل هاتە د مەژیێ وێ دا، پشتی چرکەیەکێ، ڕۆحەکا قورتالکەر هات داکو هاریکاریا وێ بکەت.

- "من گوتبوو ئەلبێرتۆی ئەز حەز ژ کومکرنا پۆلێن دەگمەن دکەم، ژبەر هندێ ڕەنگە هەبوونا برایەکی گەلەك جاران یا ب مفا بیت."

ل دوماهیێ دایکا وێ باوەر ژ ئاخفتنێن وێ کر، پاشی ب دەنگەکێ نزم گوت: "من خوارنا تە یا کریە د بەفرگرێ دا."

- "و تە نامە دانایە کیڤە؟"

- "ل سەر بانێ بەفرگرێ."

سۆفیا بلەز بەرەڤ لێنانگەهێ ڤە چوو و داکو نامەیا وی خوە وەربگریت ئەوا کو ڕێکەفتا 15 خزیرانا 1990 ل سەر پشتا وێ. سۆفیایێ زەرڤ ڤەکر و کاغەزەکا بچووك تێدا بوو و ئەڤ پرسیارە ل سەر هاتبوونە نڤیسین:

**"مادەم ل دوماهییێ چارەنڤیسێ هەمی تشتان هەر ژناڤچوونە، ئەرێ پا رامان ژ ئافراندنێ چیە؟"**

نەخێر، سۆفیایێ چ بەرسف بۆ ڤێ پرسیارێ نەبوون. وێ کاغەز کرە د زەرفی دا و دانا دگەل وان تشتان یێن ڤان حەفتییێن دوماهییێ دیتین و د دلێ خوە دا گوت کو ئەو دێ ڕۆژەکێ گەهیتە وێ چەندێ بزانیت ئەگەرێ کرنا ڤان پرسیاران چ بوویە؟"

رۆژا دی سپێدێ جوانا هاتە سەرەدانا وێ، پشتی بێهنەکێ یاری کری، دەست ب ئامادەکرنا ڕێوڕەسمێن ئاهەنگێ کر. یا ل سەر وان پێدڤی بوو هندەك ڕێکێن دی یێن پێگوهۆڕك و یەدەگ ببینین ئەگەر هات و مێهڤانێن وێ بێزار بوون. دەمێ دایکا وێ ژ سەر کاری زڤڕی، ئەو ژی هاتە دناڤ دانوستاندنا وان دا و چەندین جاران بۆ دووبارە کر و گوتێ هوون ڤەت خەما پارەی نەخون و چ تشتێ هەوە دڤێت پێشنیار بکەن. هەلبەت وێ مەرەم ب ڤێ چەندێ هەبوو، چونکی ئەڤ ئاهەنگە ڕێکا وێ یا یەکانە بوو جارەکا دی سۆفیایێ بزڤڕینە سەر ئەردی، ب تایبەت پشتی بۆ ماوەیێ چەند حەفتییێن بوری دناڤ جیهانا فەلسەفێ دا فڕی.

ل دوماهییێ ئەو ل سەر هەمی تشتان ڕازیبوون. کێکا جەژنێ، فانوسکێن ڕۆناهیێ دناڤ داران دا و ڕێکخستنا بەریکانەکێ کو دیاریا وێ ژی دێ پەڕتووکەك بیت ل سەر پێشیەکێ دور زانستێ فەلسەفێ، ب مەرجەکی هەکە پەڕتووکەکا هۆسا ل بازاڕی هەبیت.

ل ڕۆژا پێنج شەمبێ ڕێکەفتی 21 خزیرانێ، ئانکو ب دوو ڕوژان بەری جەژنا ڤەشە یوحەنای، ئەلبێرتۆی تێلەفۆنا سۆفیایێ کر.

- "ئەلۆ، سۆفیا."
- "تو یێ چەوانی؟"

- "سوپاس ئەز يێ باشم، ئەز دبێژم من ڕێكەك ديت كا دێ چەوا ژێ دەركەڤين."

- "ژ چ دەركەڤين؟"

- "ژ وێ بەنداتيا هزرى يا ئەم بۆ هەيامەكا درێژ تێدا ژيايِن."

- "ئاها."

- "بەلێ پا هەتا ئەز دەست ب ئەنجامدانا وێ نەكەم، ئەز نەشێم چ تشتان دەربارەى پلانا خوە بۆ تە بێژم."

- "ما نە ئەم پيچەكێ گيرو بووين؟ لێ دگەل هندێ پێدڤيە من پێزانين ل دور هەموو تشتان هەبن."

- "نەخێر. تو چەند يا سادەى، ما تو نزانى سانسور يا ل سەر تێلەفۆنان، ژبەر هندێ يا باشتر ئەم خوە بێدەنگ بكەين."

- "ئەرێ بابەت تا ڤى ڕادەى يێ ب مەترسى يە."

- "چ پێنەڤێت، كچا من. تێبگەهە كا چ چێدبيت، ب تايبەت ئەو تشتێ ل وى دەمى ڕووددەت دەمێ ئەم بێدەنگ دبين."

- ئاها."

- "ژيانا مە وەكو وێ ژيانێ يە يا دناڤ پەيڤێن ڕۆمانەكا درێژ دا، ئەوا مايجەر هەموو بەشێن وێ ب ڕێكا ئاميرێ خوە يێ چاپكرنێ چاپ دكەت و سێ جاران پێداچوونێ ل سەر دكەت، ژبەر هندێ ناهێليت خو پەيڤەكا چاپكرى ژبەر دەستێن وى بچيت يان بەرزەبيت."

- "ئەز باش تێدگەهم، بەلێ ل سەر ڤى دەستودارى، ئەم دێ چەوا شێين خوە ژبەر چاڤێن وى ڤەشێرين."

- "هش.."

- "چيە؟"

- "ژ بلى پەيڤان، تشتەك يێ دناڤ دێرێن ڕۆمانا وى ژى دا ڕووددەت، ئەز ژى هندى بشێم دێ دەستكاريێ د وان جهان دا كەم يێن پتر ژ ڕامانەكێ هەين."

- "باشە ئەم پێكهاتين."

- "بەلێ پا پێدڤينە ئەم مفاى ژ ئەڤرۆ و سوباهى وەربگرين، چونكى دۆزبە جەژنا ڤەشە يوحەنايە. ئەرێ تو دێ شێى نوكە هێيە دەڤ من؟"

- "بەلی، ئەڤە ئەز هاتم."

سۆفیایێ خوارن دا باڵندە و ماسیان و بەلگەکێ کەلەمیێ هاڤێتە بەر جوفیندایێ و دەرێ ڤالکەکا خوارنا تایبەت بۆ شیریکانێ ژی ڤەکر.

پشتی هینگێ خوە ل سەر پەڕژانێ باخچەی ڕا هاڤێت و بەرەڤ وێ ڕێکێ چوو یا دچوویە سەر ڕێکا سەرەکی یا پشت مالا وان. پشتی بۆ هەیامەکا کورت ب ڕێڤە چووی، دناڤ مژێ دا، نڤیسینگەهەکا مەزن کەفتە بەر سینگێ وێ و زەلامەکێ دانعەمر یێ ل بەر ڕوونشتی بوو و هۆسا دیارە یێ تشتەکی دهەژمێریت. سۆفیا بەرەڤ وی ڤە چوو و پرسیارا ناڤێ وی ژێ کر. وی ژی ب خورتی سەرێ خوە بلند و تەماشەی سۆفیایێ کر.

- "سکرووج..."

پاشی سەرێ خوە نزم کر و تەماشەی کاغەزێ، خوە کرەڤە.

- "ناڤێ من سۆفیایە، ئەرێ تو بازرگانی؟"

وی زەلامی ب بەلێ سەرێ خوە هەژاند. و گوت: "ئەز وەکو ڤارونی یێ زەنگیم ژی، ئەز خو کرونەکی ب هەروە نامەزێخم، ژبەر هندێ یا پێدڤیە ئەز باش هزرا خوە د هژمارتنێن خوە دا بکەم."

- "باشە."

سۆفیایێ دەستێ خوە بۆ بلند کر و خاترا خوە ژێ خواست، لێ هێشتا چەند میترەکان ژێ دوورنەکەفتی، چاڤێن وێ ب کچەکا بچووك و دێم پێتی و پێخاس کەفت کو دەرسوکەك ل سەری بوو و ل سەر ڤورمێ دارەکا هشك ڕوونشتبوو خوارێ. دەمێ سۆفیا نێزیکی وێ بووی، ڤالکەکا زلکێن شخارتان دناڤ زەڕفەکی دا ئینانە دەرێ و پرسیار ژێ کر: "ئەرێ تە نەڤێت شخارتەکێ ژ من بکری؟"

سوفیایێ دەستێ خوە کرە دناڤ بەریکا خوە دا و ل پارەیەکی گەریا، خوشبەختانە کورونەك د بەریکا وێ دا بوو.

- "بهایێ ڤێ شخارتێ چەندە؟"

- "کورونەك."

کچێ شخارتەك داڤ سۆفیایێ و گوت: "بۆ ماوەیێ پتر ژ سەد سالانە، تو یەکەم کەسی شخارتەیەکێ ژ من دکری. گەلەك جاران ئەز ژ برسان دا دمرم یان ژبەر سەرمایێ دبمە بەستی."

سۆفیایێ هزرا خوە کر، ل دەڤ وێ نە یا سەیر بوو ئەگەر دناڤ دلێ دارستانێ دا کەس نەبیت شخارتەیان ژ ڤێ کچکا بەلەنگاز بکریت، لێ هەر زوو هزرا وێ چوو سەر وی زەلامێ دانعەمر، وێ هەستپێکر تشتەکێ نەیێ سروشتی و بەرئاقلە ئەڤ زەلامە هند یێ زەنگین بیت و ئەڤ کچا چەند میترەکان ژ وی دوور ژ برسان دا بمریت.

- "کا دگەل من وەرە."

سۆفیایێ دەستێ کچکێ گرت و بەرەڤ وی زەلامێ بازرگان ڤە چوون.

سۆفیایێ گوتە وی زەلامی: "پێدڤیە تو پیچەکێ هاریکاریا ڤێ کچکا هەژار بکەی و بارگرانیا ژیانێ ل سەر ملێن وێ سڤك بکەی."

زەلامی سەرێ خوە ژ سەر کاغەزان ڕاکر و گوت: "ئەڤ چەندە دێ پێدڤی ب مەزاختنا پارەی بیت و بەری نوکە من گوتە تە ئەز خوە کورونەکی نامەزێخم."

- "بەلێ یا ئەڤ چەندە نەدادپەروەری یە کو تو هندە یێ زەنگین بی و ئەڤ کچکە هندە یا هەژار بیت."

- "ڤێجا ئەڤە چ ئاخفتنێن بێ ڕامانن. دادپەروەری ب تنێ دناڤبەرا وان کەسان دا هەیە یێن سەر ب یەك جیهان ڤە."

- "مەرەما تە چیە؟"

- "من ب خوە، خوە یا ئاڤاکری، هەموو کاران کریا خوە هەیە، مانە هۆسایە؟ دبێژنە ڤێ چەندێ "پێشکەفتن."

- "ئەڤە کارەساتەکا مەزنە."

وێ کچکا بچووك گوت: "ئەگەر تو هاریکاریا من نەکەی، ئەز دێ ژ برسان دا مرم."

جارەکا دی زەلامی سەرێ خوە بلند کر و پێنوسێ خوە ل مێزێ دا و ب دەنگەکێ بلند گوت: "ناڤێ وێ دناڤ چ بەندێن دەفتەرێن من دا نینە. هەرە دوزەخێ."

"ئەگەر تو هاریکاریا من نەکەی دێ ئاگری بەردەمە دارستانێ."

زەلام ژ سەر جهێ خوە ڕابووڤە، لێ وێ کچکا بچووك زلکەکێ شخارتێ بەردایێ و هاڤێتە سەر ئەردی. هەر زوو ئاگری خوە ل گیایێ هشك دا و دارستان تژی ئاگربوو.

زەلامی پێکۆل کر ب دەستی ئاگری بڤەمرینیت و ب دەنگەکێ بلند کرە قێژی: "هەوارە! هەوارە! ڕەنگ سۆر هاتن."

کچکێ ژی ب تۆڕەی ڤە گوتێ: "ما تو نزانی ئەز کۆمونیستم*."

دناڤبەرا ئاورینەکا کورت دا، ئەو کچك و زەلام بەرزەبوون، سۆفیا ب تنێ ما دناڤ دارستانێ دا و تەماشەی وی ئاگری دکر. ب هەموو ڕەنگان پێکۆل دکر وی ئاگری بڤەمرینیت هەتا دوماهیێ شیای وی کاری ب سەرکەفتیانە بکەت.

- "سۆپاس بۆ خودای."

دگەل گوتنا ڤێ ئاخفتنێ، وێ پێ خوە دانا سەر بەرمایکێن ڕەش یێن گیایەکێ هشك و سووتی و ب دەستەکی ژی ڤالکا شخارتان هەلگرت."

هەرچەوا بیت، سۆفیایێ ئەو ئاگر نەبەردابوویێ؟!...

دەمێ ئەلبێرتۆ گەهشتیە دەڤ وێ، سۆفیایێ چیرۆك هەموو بۆ ڤەگێڕا.

ئەلبێرتۆی گوت: "سکرووج" یەك ژ سەرمایەدارێن خراب و تەماع بوو دناڤ پەرتووکا "چیرۆکا ژ دایکبوونا مەسیحی" یا نڤیسەر چارلز دیکنزی، کچکا شخارتەفروش ژی کەسایەتیەك بوو دناڤ چیرۆکەکا نڤیسەر هـ. س. ئەندرسونی دا.

- "بەلێ یا نە یا سەیرە من ئەو ل ناڤ ڤێ دارستانێ دیتین؟"
- "نەخێر، چونکی ئەڤ دارستانە نەوەکو چ دارستانێن دی یە."

---

* شیوعی

- "یەلا، دا نوکە بەحسێ کارل مارکسی بکەین. نە یا سەیرە ئەگەر نوکە ئەم دوو نموونەیێن هەڕە بەرچاڤ ل دور هەژارترین کەس و زەنگینترین کەسێن چەرخێ بوری ل ناڤ ڤێ دارستانێ دا ببینین."

ئەو هەردوو ل سەر وێ مێزا ل بەر پەنجەرکێ یا هەمبەری دەریاچێ ڕوونشت. سۆفیایێ هێشتا هەست ب لەشێ خوە دکر دەمێ ژ شووشەیا شین ڤەخواری. هێشتا ئەو هەردوو شووشە ل سەر سۆپا ئاگری بوون و پەیکەرەکێ بەرجەستە یێ گریگی ل سەر مێزێ بوو."

سۆفیایێ پرسیار کر: "ئەرێ ئەڤە چیە؟"

- "هەر تشتەك وەختێ خوە، کچا من."

پاشی وی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "دەمێ کیرکیگارد ل سالا 1841ێ چوویە بەرلینیێ، داکو بەشداریێ د وانەیێن شلینگی دا بکەت، دبیت کارل مارکس ژی ل هەمان جهـ بیت و بەشداری وان وانەیان بیت. هەردیسان دەمێ کیرکیگاردی نامەیا خوە یا ماستەرێ د ئادابێ دا ل دور سۆکراتی دنڤیسای، مارکسی نامەیا خوە یا دکتورایێ ل دور دیمۆکریتس و ئەپیکوری دنڤیسا، ئانکو ل دور فەلسەفێا مەتریالی ل چەرخێن کەڤن. ل ڤێرێ، هەر یەك ژ وان ڕێکا خوە یا فەلسەفی پێشئێخست."

- "کیرکیگارد بۆ فەیلەسۆفەکێ هەبوونخوازی و مارکس ژی بۆ فەیلەسۆفەکێ مەتریالی، مانە هۆسایە."

- "هەروەکو ڕێکەفتن ل سەر ناڤکرنا وی هاتیەکرن، مارکس بۆ فەیلەسۆفەکێ مەتریالی یێ دیرۆکی، نوکە ئەم دێ ڤێ چەندێ دەینە ڕەخەکی."

- "باشە بەردەوام بە."

- "ڤان هەردوو فەیلەسۆفان ژ فەلسەفەیا هیگلی دەستپێکر، لێ هەر یەك ژ وان ب ڕێکا خوە یا تایبەت. هەرچەندە ئەو هەردوو گەلەك ب هزرا هیگلی د داخباربوون، لێ هەردووکان ژی بیرۆکەیا هیگلی ل دور "ڕۆحا جیهانێ" یان ئایدیالیزمی ڕەتدکر."

- "چ پێنەڤێت چونکی ئەڤ بیرۆکەیە بۆ وان یا شێلی و نەدیار بوو."

- "هەلبەت، ب شێوەیەکێ گشتی، ئەم دشێین بێژین سەردەمێ سیستەمێن فەلسەفی دگەل مرنا هیگلی بەرەڤ نەمانێ چوو، پشتی هینگێ فەلسەفێ ئاراستەکێ نوو و جودا گرت و ل جهی فەلسەفا وی، "فەلسەفا هەبوونخوازیێ" یان ژی "فەلسەفا پراکتیکی" جهێ وێ گرت."

- "ئاها ئەڤ چەندە بنەمایێ فەلسەفەیا مارکسی بوو کو دبێژیت "هەتا نوکە ب تنێ فەیلەسۆفان جیهان یا شرۆڤە کری، لێ نوکە یا پێدڤیە ئەم ڤێ جیهانێ بگوهۆڕین."

- "ڤێ ڕستێ لادانەکا سەرەکی و بنەڕەت د دیرۆکا فەلسەفێ دا پەیداکر."

- "نوکە، پشتی من سکرووج و کچکا بچووك دیتین، ئەز باشتر د مەرەما ئاخفتنا مارکسی گەهشتم."

- "بیرۆکەیا مارکسی، ئارمانجەکا پراکتیکی و سیاسی هەبوو. نابیت ئەم ژبیر بکەین کو نە تنێ فەیلەسۆف بوو، بەلکو ئابورناس و جڤاکناس و دیرۆکنڤیس ژی بوو."

- "ئەرێ د ڤان هەموو بوران دا ئەو کەسەکێ ڕێبەر و پێشەنگ بوو؟"

- "هەرچەوا بیت، چ کەسان هندی مارکسی ڕۆلەکێ کاریگەر ل سەر بجهئینانا پراکتیکی یا سیاسی بۆ فەلسەفێ نەبوو. بەلێ یا... پێدڤیە ئەم د هشیار بین هەر تشتێ دبێژنێ "مارکسی" و بیرۆکەیا مارکسی ب خوە تێکەل نەکەین. هەرچەندە ل سالا 1840ێ وی دیاکر کو ئەو کەسەکێ مارکسی یە، لێ پشتی هینگێ پێداچوونەك د هزروبیرێن خوە دا کر و بێگونەهیا خوە ژ هندەك وان شرۆڤەکرنان دا یێن وی داینە بیرۆکەیا خوە."

- "ب ڤی ڕەنگی، ئەم پرسیار بکەین ئەرێ ما مەسیح ژی مەسیحی بوو؟"

- "ئەڤ چەندە ژی پێدڤی گەنگەشەکرنەکا دی یە."

- "باشە بەردەوام بە."

- "ل دەستپێکێ، هەڤال و برادەرێ وی یێ نێزیك "ئەنجلز" ی پشکداری د تیورا وی یا ب ناڤێ "مارکسیەت" دا کربوو، د چەرخێ مە یێ نوکە ژی دا*، هەر یەك ژ لینین و

* ل ڤێرێ، مەرەما نڤیسەری چەرخێ بیستێ یە، ژبەرکو وی ئەڤ ڕۆمانە ل سالا 1991 نڤیسایە و ئەو کەسێن وی ئاماژە ب ناڤێن وان ژی کری هەموو د چەرخێ بیستێ دا ژیاینە. لێ نوکە ئەم یێ ل سالا 2017ێ دا، ئانکو چەرخێ بیست و یەکێ.

ستالین و ماوتسی تونگ و چەندین کەسێن دی، گەلەك تشت ل سەر تیورا مارکسی یان "مارکسیا لینینی" زێدە کرینە."

- "ئەز دبێژم بەحسێ مارکسی ب تنێ بکە بەسە. مانە تە بەری نوکە گوت ئەو فەیلەسۆفەکێ مەتریالی یێ دیرۆکی بوو."

- "دەمێ دبێژین فەیلەسۆفێ مەتریالی، ل ڤێرێ مەرەما مە ژ تێگەهێ " مەتریالی" نە ئەو تێگەهە یێ مە دگوتیە فەیلەسۆفێن چەرخێن کەڤن دەمێ بەحسێ گەردیلەیان دکری، یان ژی " مەتریالیا خودای" یا مە ل چەرخێن هەڤدە و هەژدەی زاینی گوهلێبووی. ئەو د وێ باوەرێ دا بوو کو مەرج و پەیوەندیێن مەتریالی دناڤ جڤاکی دا، ب شێوەیەکێ بنەڕەتی شێوازێ هزرکرنا مە دەستنیشان دکەن، هەر ئەڤ پەیوەندیە بنەمایێ پێشکەفتنا دیرۆکا مرۆڤایەتیێ نە."

- "ئەڤ چەندە گەلەك یا جودایە ژ "بیرۆکەیا جیهانێ" یا هیگلی."

- "هیگلی بۆ مە ڕۆهن کر کو پێشکەفتنا دیرۆکا مرۆڤایەتیێ ژ ئەنجامێ گرژیا دناڤبەرا توخمێن هەڤدژ دا پەیدادبیت، ژ نیشکەکێ ڤە دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا گوهۆڕینان. مارکس ژی یێ هەڤڕابوو دگەل ڤێ بۆچوونا وی، لێ ئەو د وێ باوەرێ دا بوو کو هیگلی هندەك تشت ب شێوەیەکێ شاش شرۆڤە کرینە."

- "بەلێ پا نە هەموو گاڤان."

- "هیگلی دگوتە ڤێ هێزا دیرۆکێ ب ڕێڤە دبەت، ڕۆحا جیهانێ، یان ژی ئەقلێ جیهانێ. لێ مارکس د وێ باوەرێ دا بوو کو دیتنا تشتان ب ڤێ ڕێکێ، بەرێ وی دایە هندێ تیورا خوە ب شێوەیەکێ شاش شرۆڤە بکەت. ژبەر هندێ مارکسی پێکۆل دکر بسەلمینیت کو دینەمویێ ڕاستەقینە یێ گوهۆڕینا دیرۆکێ، گوهۆڕینا کاودانێن ژیانا مەتریالی یە. ئانکو کاودانێن ڕۆحی نابنە ئەگەرێ ڤێ گوهۆڕینێ، بەلکو بەروڤاژی، گوهۆڕینێن مەتریالی هندەك کاودانێن ڕۆحی یێن نوو دەستنیشان دکەت. ژبەر هندێ مارکسی داکوکی دکرە سەر هێزا ئابوری دناڤ جڤاکی دا، چونکی ئەڤ ئەڤ هێزە دشێت هەموو جۆرێن گوهۆڕینان پەیدابکەت و ب ڤی ڕەنگی دێ دیرۆکا مرۆڤایەتیێ پێشکەڤیت."

- "ئەرێ تە چ نموونە ل سەر ڤێ چەندێ نینن؟"

- "ل چەرخێن کەڤن، هەر یەك ژ زانست و فەلسەفێ، دیتنەکا پەتی و ڕۆهن هەبوو، لێ کەسێ گرنگی نەددا بوارێن پڕاتیکی یێن ڤان زانینان ل دەمەکی کو ئەڤ بوارە ژ هەژی گەلەك گوهۆڕینێن مەزن بوون."

- "ئاها؟"

- "هەر یەك ژ ڤان ژی پەیوەندی ب ڕێکخستنا ژیانا ڕۆژانە ل سەر ئاستێ جڤاکی ڤە هەبوو. ب ڕەنگەکی هەموو بەرهەمێ ژیانێ مابوو ل سەر ملێن پاڵە و بەندەیان. ژبەر هندێ، ل وی دەمی، هاولاتیێن ئاسایی گرنگی نەددا باشترلێکرنا شێوازێن ئەنجامدانا کاری ب ڕێکا داهێنانێن زانستی. ئەڤ چەندە نموویەك بوو ل سەر چەوانیا دەستنیشانکرنا کاودانێن مەتریالی ل سەر هزرکرنا فەلسەفی دناڤ جڤاکی دا."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "مارکسی ناڤێ ڤان کاودانێن مەتریالی و ئابوری و جڤاکی کرە "ژێرخانە". هەدیسان ناڤێ شێوازێ هزرکرنا جڤاکی و دەزگەهێن وی یێن سیاسی و یاسا و ئاین و هونەر و ڕەوشت و فەلسەفە و زانستێ وی ژی کرە "سەرخانە."

- "ژێرخانە و سەرخانە."

- "نوکە، کا وی پەیکەری گریکی بدەف من!."

- "فەرمووو."

- "ئەڤە بەرجەستەیەکێ بچووککری یێ پەڕستگەها پارتیونوێ یە ل ئەکرۆپۆلا ئەسینایێ. تە دیمەنێ وی یێ ڕاستەڤینە ژی یێ دیتی."

- "مەرەما تە د ڤیدیویێ دا."

- "هەروەکو تو دبینی، ڤی پەیکەری بانەکێ زێدە جوان یێ هەی، دبیت دیمەنێ وی یێ پێشیێ بۆ جارا یەکێ سەرنجا مرۆڤی براکێشیت، ئاها دبێژنە وێ "سەرخانە"، بەلێ پا ئەڤ بانە نەشێت دناڤ بای دا بمینیت."

- "هندەك ستوونان ئەڤ بانە یێ هەلگرتی."

- "ڤی ئاڤاهی بنیاتەکێ ب هێز و ڕەق هەیە کو ئەو ژی "ژێرخانە"یا وی یە. ئاها ب ڤی ڕەنگی مارکسی دگوت ژێرخانە یان ژی کاودانێن مەتریالی، هەموو بەرهەمێ هزری یێ

دناڤ جڤاکی دا دهەلگریت. ژبەر ڤێ چەندێ، ئەم دشێین بێژین سەرخانە ب تنێ ڕەنگڤەدانا ژێرخانێ یە."

- "ئەرێ تە دڤێت بێژی تیورا بیرۆکەیان یا ئەفلاتۆنی ژی، ڕەنگڤەدانا بەرهەمێ دروستکرنا زەخرەفە و مەیێ بوو ل ئەسینایێ د وێ قۆناغێ دا."

- "نەخێر. بابەت هۆسا یێ ب سانەهی نینە. مارکس ب خوە ژی هوشداریێ ل دور ڤی جۆرێ شرۆڤەکرنێ ددەتە مە. ب شێوەیەکێ گشتی، کارلێك و کاریگەریەکا هەڤپشك دناڤبەرا سەرخانە و ژێرخانەیا دناڤ جڤاکی دا هەیە. هەرچەندە مارکسی ب خوە ئەڤ کارلێکە ڕەتدکر ژبەرکو ئەو فەیلەسۆفەکێ مەتریالی یێ میکانیکی بوو، لێ وی هەبوونا پەیوەندیا دیالێکتیکی یا دناڤبەرا سەرخانە و ژێرخانەیێ دا ل بەرچاڤ وەردگرت. ژبەر هندێ ئەم دشێین بێژین وی بانگەوازی بۆ فەلسەفەیا مەتریالی یا دیالێکتیکی دکر. دا بزڤرینە ئەفلاتۆنی، ئەو نە جوتیار و نەژی دروستکەرێ مەیێ بوو."

- "ئەز تێگەهشتم. ئەرێ تشتەك مایە تە ل دور ڤی پەیکەری نەگوتی؟"

- "بەلێ، پیچەك. باش تەماشەی بنیاتێ پەیکەری بکە و پاشی بێژە من کا تو چ دبینی؟"

- "ستوونێن وێ ل سەر بنکەیەکی هاتینە دانان کو ژ سێ ئاستان پێکدهێت."

- "ئەڤ هەرسێ ئاستە یان تەخە وەکو وان تەخانە یێن ژێرخانەیا هەر جڤاکەکی ل سەر دهێتە دانان. د تەخا یەکێ دا، ئەم کاودانێن بەرهەم ئینانێ یان ژی ژێدەرێن سروشتی دبینین. ب دەربڕینەکا دی، د ڤێ تەخێ دا هەموو تشتێن پەیوەندی ب سەڤا و کەرەستەیێن خاڤ یێن دەستپێکی ڤە یێن بەرێ بنیاتێ جڤاکی ددانن لێ هەنە، زێدەباری وان تشتێن شێوازێ بەرهەم ئینانەکا باش و گونجای یا ڤی جڤاکی دەستنیشان دکەت، ئەڤ چەندە ژی ب ڕۆهنی و ئاشکەرایی جۆرێ وی جڤاکی و کەلتورێ وی دیار دکەت."

- "بەلێ، ژبەر هندێ ئەم نەشێین ماسیان ل بیابانێ نێچیر بکەین و دار قەسپان ل جەمسەرێ باشورێ تەپا ئەردی بچینین."

- "بەلێ تو باش تێگەهشتی. ئاها ب ڤی ڕەنگی شێوازێ هزرکرنێ ژی یێ جوایە، بۆ نموونە شێوازێ هزرکرنێ ل دەڤ جوتیارەکێ بیابانێ نە وەکو یێ نێچیرڤانەکی یە ل لابونیا، هەروەکو کا چەوا ئەو نەشێت ماسیان ل بیابانێ نێچیر بکەت یان ژی دار قەسپان ل باکورێ

نەرویج بچینیت. قۆناغا دووێ یان تەخا دووێ یا ژێرخانێ پەیوەندی ب ئالاڤێن بەرهەم ئینانێ ڤە هەیە. مەرەما مارکسی ل ڤێرێ ئەو ئامیر و کەرەستەنە یێن خەلك د جڤاکێن خوە دا بکاردئینیت."

"د کەڤن دا، خەلکی بەلەمێن بچووك بۆ نێچیرکرنا ماسیان بکاردئینان، لێ ل سەردەمێ ئەڤرۆکە پاپۆرێن گەلەك مەزن ئەڤێن ب شێوەیەکێ ئوتوماتیکی کار دکەن، دهێنە بکارئینان."

- "ئاها ب ڤی ڕەنگی تە تبلا خوە دانا سەر تەخا سیێ یا ژێرخانەیێن ڤێ تەخێ کو پەیوەندی ب وێ چەندێ ڤە هەیە کا کێ ئەڤ ئالاڤێن بەرهەم ئینانێ یێن پێشکەفتی هەنە. ڕێکخستنا کاری، ئانکو دابەشکرنا کاری ل سەر کرێکاران و بڕێڤەبرنا کاری ئەو تشت بوون یێن مارکسی دگوتیێ پەیوەندییێن بەرهەم ئینانێ."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "ب ڤی ڕەنگی ئەم دشێین بگەهینە وی دەرئەنجامی کو شێوازێ بەرهەم ئینانێ دناڤ جڤاکەکێ دەستنیشانکری دا، دیمەنێ ئایدولوژی و سیاسی یێ وی جڤاکی دەستنیشان دکەت، ژبەر هندێ نە تشتەکێ سەیرە ئەگەر شێوازێ هزرکرنا مە یێ ئەڤرۆکە و پیڤەرێن مە یێن ئەتیکی د جودابن ژ پیڤەرێن جڤاکێن چەرخێن ناڤەڕاست."

- "ئانکو مارکسی باوەری ب مافەکێ سروشتی نەبوو کو بۆ هەموو سەردەمان یێ گونجای بیت؟"

- "نەخێر. ب دیتنا مارکسی، مژارا زانینا هەر تشتێ نوو ژ لایێ ئەتیکی ڤە ل سەر سروشتێ ژێرخانەیا وی جڤاکی دمینیت. بۆ نموونە، تشتەکێ سەیر نینە ئەگەر د جڤاکەکێ کشتوکالی یێ کەڤن دا کەسوکارێن کچکێ بڕیار ل سەر هەڤژینیا وێ دابایە کا دێ شوو ب کێ کەت یان دێ کێ بۆ کورێ خوە خوازن، یان ژی کا دێ ئەرد و چاندن بۆ کێ وەکو میرات مینیت. لێ د بازێرێن مودرێن و مەزن دا، پەیوەندییێن جڤاکی گەلەك د جودانە، بۆ نموونە دبیت دوو کەس ل یانەیەکێ یان ل ئاهەنگەکێ هەڤدوو بینن و پەیوەندیەکا حەژێکرنێ دناڤبەرا وان دا پەیدابیت و ل دوماهیێ بڕیارێ بدەن پێکڤە بژین یان ژیانا هەڤژینیێ پێکبینن."

- "ئەز ڕازی نابم کەسوکارێن من بڕیارێ بدەن کا شوو ب کێ بکەم."

- "نەخێر، تو ڕازی نابی، چونکی تو کچکەکا سەردەمێ خوەی. مارکس دبێژیت تەخا دەستهەلاتدار ئەوە یا باشی و خراپییێ دەستنیشان دکەت. ژبەر هندێ ئەگەر تەماشەی دیرۆکێ بکەین، دێ بینین هەمموو گاڤان شەڕ و هەڤڕکی دناڤبەرا تەخێن دەستهەلاتدار دا پەیدابوویە، ئانکو دیرۆك ژی وێ هەڤڕکییێ بۆ مە وێنە دکەت کا دێ کی ئالاڤێن بەرهەم ئینانێ بدەستخوە ڤە ئینیت."

- "بەلێ ما هزروبیرێن خەلکێ ئاسایی ژی نابنە ئەگەرێ گوهۆڕینا دیرۆکێ؟"

- "بەلێ و نەخێر. مارکسی ئاماژە ب هندێ دکر کو سەرخانە دشێت کارتێکرنێ ل ژێرخانێ بکەت لێ وی دانپێدان ب هندێ نەدکر کو سەرخانێ دیرۆکەکا سەربەخو هەبیت. هەمموو ئەو گوهۆڕینێن دیرۆکی یێن د جڤاکێن بەندایەتییێ دا ل سەردەمێن کەڤن هەتا جڤاکێ پیشەسازی یێ سەردەمێ ئەڤرۆکە دا ڕوودایین، بۆ وان گوهۆڕینێن د ژێرخانەیا جڤاکی پەیدابووین دزڤڕن."

- "بەری نوکە ژی تە ئەڤ چەندە گوتبوو..."

- "ب دیتنا مارکسی، هەر قۆناغەکا دیرۆکی ب هەڤڕکیا دناڤبەرا دوو تەخێن جڤاکی دا دهێتە نیاسین. بۆ نموونە د چەرخێن کەڤن دا، بەردەوام هەڤڕکی دناڤبەرا بەند و هاولاتییێن ئازاد دا هەبوو، د جڤاکێن دەرەبەگایەتی یێن چەرخێن ناڤەڕاست ژی دا، هەڤڕکی دناڤبەرا دەرەبەگ و جوتیاران دا هەبوو. ل سەر دەمێ مارکسی ژی کو جڤاکەکێ بورجوازی یان سەرمایەداری بوو، بەردەوام هەڤڕکی و شەڕ دناڤبەرا سەرمایەدار و کرێکاران "برولیتاریا" دا هەبوو. ئانکو بەردەوام هەڤڕکی دناڤبەرا تەخەکێ یاکو ئالاڤێن بەرهەم ئینانێ هەین و تەخەکا دی یا ئەڤ ئالاڤە نەی پەیدابوویە. هەردیسان ژبەرکو تەخا دەستهەلاتدار ب سانەهی دەستان ژ دەستهەلات و کورسیکا خوە نابەردەت، ل ڤێرێ شۆڕەش و ڕاپەڕین ب تنێ دشێت وان نەچار بکەن ڤی کاری بکەن."

- "باشە پا جڤاکێ کۆمونیزمی؟"

- "ب شێوەیەکێ تایبەت، مارکسی گرنگی دایە گوهۆڕینا جڤاکی ژ ڕەوشەکا سەرمایەداری بۆ جڤاکەکێ کۆمونیزمی. وی ب ڕێکەکا تێروتەسەل بەحسێ شێوازێ بەرهەم ئینانێ د جڤاکێ سەرمایەری دا کریە، لێ بەری ئەم بەحسێ ڤێ خالێ بکەین، دێ پیچەکێ ل دور تێگەهێ وی ل دور کارێ مرۆڤان ئاخڤین."

- "باشە گوهێ من یێ ل تە."

- "بەری مارکس ببیتە کەسەکێ کۆمونیزم، پرسیارا هندێ دکر ئەرێ چ ل مرۆڤی دهێت دەمێ کار دکەت. هیگلی ژی گرنگی ددا ڤێ ئاریشێ و گەهشتبوو وێ چەندێ کو پەیوەندیەکا ئالۆگور یان دیالێکتیکی دناڤبەرا مرۆڤ و سروشتی دا هەیە. دەمێ مرۆڤ ل سەر سروشتی کار دکەت، ئەڤ کارکرنە کارتێکرنێ ل سەر مرۆڤی ب خو ژی دکەت و پێشدئێخیت. ب دەربڕینەکا دی، دەمێ مرۆڤ ل سەر سروشتی کار دکەت، د ماوەیێ ڤێ کارکرنێ مرۆڤ ل سەر خوە ژی کار دکەت و کارتێکرنا کاری ل سەر هزر و ئاگەهیا وی دمینیت."

- "بێژە من تو چ کار دکەی، ئەز دێ بێژمە تە تو کی."

- "دەستخوش، تە ب شێوەیەکێ جوان ئەو تشت کورتکر یێ مارکسی دڤیا بێژیتە مە کا چ ل مرۆڤی دهێت دەمێ کار دکەت. پەیوەندیەکا دیالێکتیکی دناڤبەرا دەست و هزرا مرۆڤی دا هەیە، ژبەر هندێ زانینا مرۆڤی پەیوەندیەکا ب هێز دگەل کارێ وی هەیە."

- "کەواتە بێکاری ژی تشتەکێ مەترسیدارە."

- "ئەو کەسێ بێکار دژیت دێ دناڤ ڤالاهیەکێ دا بەرزە بیت. هیگلی ژی هەست ب ڤێ چەندێ کربوو، وی و مارکسی هەردووکان دگوت کارکرن تشتەکێ ئەرێنی یە و پەیوەندیەکا ب هێز و ڕاستەخو ب هندێ ڤە هەیە مرۆڤ ب کارکرنێ ژ ڕاستا دبیتە مرۆڤ."

- "ئانکو ل ڤێرێ تشتەکێ باشە هەکە کەسەك کرێکار بیت."

- "د بنیات دا، بەلێ. ل ڤێرێ مارکس ڕەخنێ ل شێوازێ سەرمایەداریێ دگریت."

- "بۆ من پتر ڕۆهن بکە."

- "د سیستەمێ سەرمایەداریێ دا، کرێکار بۆ کەسەکێ دی کار دکەت و کارێ وی دبیتە تشتەکێ دەرەکی د ژیانا وی دا ئانکو تشتەکە نەیێ وی یە. ب ڤی ڕەنگی ئەو دێ بیتە کەسەکێ بیانی هەمبەر کارێ خوە، ل دووڤ دا دێ بۆ خوە ب خوە ژی بیتە کەسەکێ بیانی و دێ ڕاستی و دروستیا خوە وەك مرۆڤ ژ دەستدەت. ل ڤێرێ مارکس دەربڕینەکا هیگلی دئینیت و دبێژیت: ئەڤ کرێکارە هێدی هێدی دێ بیتە کەسەکێ بیانی."

- "مەتا من ئەڤە بۆ ماوەییێ پتر ژ بیست سالانە ل کارگەهەکا شیریناهیان کار دکەت. ژبەر هندێ ئەز باش د تە دگەهم، چونکی مەتا من گەلەگ جاران دبێژیت سپێدی دەمێ ژ خەو ڕادبم دا بچمە سەر کاری، گەلەك کەربێن من ژ کاری ڤەدبن."

- "لێ ل دوماهیێ دێ کەربێن وێ ژ وێ ب خوە ژی ڤەبن ئەگەر هات و ئەڤ کەربا وێ بۆ کارێ وێ یا بەردەوام بیت."

- "هەرچەوا بیت، کەربێن وێ ژ شیریناهیان ڤەدبن."

- "د جڤاکێن سەرمایەداری دا، سیستەمێ کارکرنێ هۆسا هاتیە ڕێکخستن کو ل دوماهیێ کارێکار هەروەکو بەندەیان بهێتە هژمارتن، ژبەرکو ئەو هەمووو هێزا خوە یا کاری و هەبوونا خوە یا مرۆڤایەتی د خزمەتا تەخا بورجوازی دا تەرخان دکەت."

- "ئەرێ ژ ڕاستا بابەت تا ڤی ڕادەی یێ ب مەترسیە؟"

- " ئەم یێ بەحسێ دیتنا مارکسی ل دوور ڤێ ڕەوشێ دکەین، ژبەر هندێ یا پێدڤیە ئاورینەکێ ل پەیوەندییێن جڤاکی یێن چەرخێ نوزدێ بدەین، ل وی دەمی دێ ب دەنگەکێ بلند بێژین بەلێ ئەڤ چەندە یا ب مەترسی بوو.

کرێکاران بۆ ماوەییێ دوازدە دەمژمێران د کارگەهێن گەلەك سار و تەزی ڤە کاردکر و کرییێن وان ژی گەلەك د کێم بوون، ژبەر هندێ زارۆك و ژنێن ب دووگیان ژی نەچار دبوون کار بکەن. هەژاری و بێزاریا خەلکی ب چ ڕەنگان نەدهاتە شرۆڤەکرن. ل گەلەك جهان، خوەدانێن کاری ل شوونا بەشەکێ کرییێ، ڤەخوارنەکا کحولی یا ئەرزان و خراب ددا کرێکاران، ل هندەك جهان کرێکارێن ژن ژی نەچاردکرن کارێ لەشفروشییێ دگەل زەلامێن دەولەمەند بکەن. ب کورتی: پێدڤی بوو تشتەکێ هۆسا بهێتە کرن بهاییێ مرۆڤی بهێتە بلند کرن، ژبەرکو کارکرنێ مرۆڤ وەکو گیانەوەران لێکربوون."

- "و هۆسا ئەڤ ڕەوشە بۆ ئەگەرێ پەیدابوونا شۆرەشێ..."

- "ئەڤ چەندە ڕەنگڤەدانا مارکسی ژی بوو. دەمێ کرێکار د ڤێ ڕەوشا گران و نەخوش دا دژیاین، زارۆکێن دەولەمەندێن بورجوازی ژی، پشتی کو سەرێ خوە د سەرشووییێن گەرم و ئارام ڤە دشووشتن، دچوونە د ژوورێن تایبەت و گەرم ڤە و ئامیرێن پیانو و کەمانێ دژەنین. پشتی هینگێ دچوونە سەر سفرەیێن ژ چوار جۆرێن خوارنێن جودا جودا پێکهاتی و دەمێ خوە یێ مایی ژ ب گەڕیانێن سەر پشتا هەسپان ڤە دبوراند."

- "ڕەوشەکا کاریگەر و نەدادپەروەر بوو!"

- "ئەڤە بۆچوونا مارکسی ژی بوو. ل سالا 1848ێ، دگەل هەڤالێ خوە "فریدریك ئەنجلز"ی بەیاننامەیا حزبا کۆمونیست یا ناڤدار "مانیفستو" بەلاڤکر. دێرا یەکێ یا ڤێ بەیاننامێ دبێژیت: "شەبەنگەك دێ ئەوروۆپا هەژینیت، شەبەنگا کۆمونیزمێ."

- "کا ڕاوەستێ، ئەڤە یا ب مەترسی یە."

- "هەردیسان بورجوازی ژی ترسیان. ژبەرکو تەخا کرێکاران دەست ب شۆرەشێ کر. ئەرێ تە دڤێت گوهێ خوە بدەیە دوماهیك بەیاننامەیا وان؟"

- "ب خوشحالی ڤە."

- "ئێدی کۆمونیست ڕازی نابن تێگەهـ و پلانێن خوە بڤەشێرن، ئەو ب دەنگەکێ بلند دکەنە هەوار و دبێژن کو ئەو نەشێن چ خەونێن خوە بجهـ بینن ئەگەر هەموو سیستەمێ جڤاکی یێ بەرێ ب هێزێ و توندوتیژیێ ژناڤ نەبەن. بلا تەخا دەستهەلاتدار ل هەمبەری شۆرەشا کۆمونیستان بلەرزیت. کرێکاران چ تشت نینە ژ دەست بدەن ب تنێ قەید و زنجیر نەبن، ئەو دێ جیهانێ ب سەر ئێخن، گەلی کرێکارێن جیهانێ هەڤدوو بگرن."

- "ئەگەر کاودانێن ژیانا وان هندە د خراب و نەخوش بان هەروەکو تە دیارکری، ئەز ژی دا بەیاننامەیا وان ئیمزا کەم. بەلێ پا ئەز دبێژم پشتی هینگێ کاودان بەرەڤ باشتر ڤە چوون، مانە هۆسایە؟"

- "ل نەرویج، بەلێ. بەلێ پا ل جیهانێ هەموویێ نە. چونکی هێشتا ل گەلەك دەڤەران کرێکار د ڕەوشێن نەمرۆڤایەتی یێن گەلەك دژوار دا دژین و د هەمان دەم دا کارکرنا وان دبیتە ئەگەر سەرمایەدار زەنگینتر لێ بهێن. مارکسی دگوتە ڤێ چەندێ "دەلیڤەدیتن*."

- "دێ شێی پتر ڕامانا ڤێ پەیڤێ ڕۆهن کەی؟"

- "دەمێ کرێکار متایەکێ دەستنیشانکری بەرهەم دئینیت، وی متای بهایەکێ فرۆتنێ یێ دەستنیشانکری هەیە."

- "باشە."

---

* استغلال

- "ئەگەر مە کرێیا کرێکاری و خەرجیێن بەرهەم ئینانا وی متای ژێ ڕاکرن، پارەیەکێ باش دێ مینیت کو مارکسی دگوتێ "بهایێ زێدە"، ئەڤ چەندە ژی هندێ دگەهینیت کو کەسێ سەرمایەدار دێ پارەیەکی بدەستڤەئینیت کو د بنیات دا کرێکار یێ بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا وی پارەی. ئاها مارکسی دگوتە ڤێ چەندێ دەلیڤەدیتن."

- "ئەز تێگەهشتم؟"

- "هەردیسان ئەو سەرمایەدار دشێت وی پارێ بدەستڤە ئینای د کارەکێ دی دا بمەزێخیت، بۆ نموونە د گوهۆڕینا ئالاڤێن خوە یێن بەرهەم ئینانێ ب هندەکێن نوو و سەردەم، لێ ل ڤێرێ مەرەما وی نە ئەوە دا کرێکار کێمتر بواستییێن یان کێمتر کاربکەن، بەلکو دا خەرجییێن تێچوونا بەرهەم ئینانێ کێمتر لێبکەت و پارەیەکێ مەزنتر بۆ وی ژبەرڤە بمینیت."

- "ئەڤ چەندە یا بەرئاقلە."

- "دبیت. لێ چ جاران هەموو تشت وەکو خوە نامینن و بۆ ماوەیەکێ ناڤەکێشن هەروەکو سەرمایەداری بڤێت، ڤێجا چ د ڤی بواری دا بیت یان بوارەکێ دی."

- "ئانکو چەوا؟"

- "مارکس د وێ باوەرێ دابوو کو شێوازێ بەرهەم ئینانا سەرمایەداری، هەڤدژیێن خوە یێن ناڤخۆیی ژی هەنە. سەرمایەداری سیستەمەکێ ئابوری یە و ئەو ب خوە، خوە ژناڤ دبەت، ژبەرکو ل دووڤ ئەقلی ب ڕێڤە ناچیت."

- "بەلێ ئەڤ چەندە بۆ کەسێن ستەملێکری باشە."

- "بەلێ. دوماهیا سیستەمێ سەرمایەداریێ یێ دناڤ وێ ب خوە دا هەلگرتیە. ب ڤی ڕەنگی، سەرمایەداری دبیتە توخمەك بۆ پێشکەفتنێ، ئانکو قۆناغەکا گرنگ ل سەر ڕێکا سوشیالیستێ."

- "ئەرێ دێ شێی نموونەیەکێ ل سەر چەوانیا ژناڤچوونا خویی یا سیستەمێ سەرمایەداریێ بۆ من بێژی؟"

- "مە گوتی کەسێ سەرمایەدار دێ پارەیەکێ مەزن بدەستخوە ڤە ئینیت، بەشەکێ کێم ژ ڤی پارەی بۆ کرینا ئالاڤێن بەرهەم ئینانێ یێن نوو و پێشخستنا کارگەها خوە

بکارئینیت، بەشەکێ دی ژی بۆ خوشیا زارۆکێن خوە و جلوبەرگ و کەلوپەلێن گرانبها یێن هەڤژینا خوە دمەزێخیت."

- "و پاشی."

- "دێ هندەك ئامیرێن نوو کریت و هژمارا کرێکاران کێم کەت، هەلبەت ئەڤ چەندە ژی ژبەر هندێ یە داکو جهێ خوە دناڤ بازارِی دا و ل هەمبەر هەڤرکێن خوە یێن کاری باشتر لێ بکەت."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "لێ ژبیرنەکە ئەو ب تنێ هزرا ڤێ چەندێ ناکەت، هەموو زنجیرەیێن بەرهەم ئینانێ پێدڤیە ب شێوەیەکێ باشتر کارێ خوە بکەن و د نوو بن. هۆسا دێ کارگەهـ مەزنتر لێهێن و کەڤنە د دەستێ هژمارەکا کێم یا زەلامان دا. باشە تو بێژی پشتی هینگێ چ چێبیت، سۆفیا؟"

- "بەلێ..."

- "هێدی هێدی پێدڤیا وان ب کرێکاران دێ کێم بیت، ژبەر هندێ دێ هژمارەکا کرێکارێن خوە فرێکەنە مال و هۆسا دێ بێکاری زێدەبیت و پشتی هینگێ چەندین ئاریشەیێن جڤاکی دێ پەیدابن. ئەڤ قەیرانە وەکو نیشانەکێ یە کو دوماهیا سەرمایەداریێ یا نێزیك بووی. لێ هندەك ئەگەرێن دی ژی هەنە کو سیستەمێ سەرمایەداری ب خوە، خوە ژناڤ دبەت. تو بێژی چ چێبیت ئەگەر ئەو پارێ سەرمایەدار بدەستڤە دئینیت هەموویێ ل کرینا ئالاڤ و کەلوپەلێن نوو بکریت و د هەمان دەم دا بهایێ متایێ کارگەها وی نەشێت هەڤرکیا بهایێ بازارِی بکەت؟ تو بێژی سەرمایەدار دێ چ کەت؟ تو دشێی بەرسڤا من بدەی؟"

- "نەخێر، ئەز نزانم دێ چ کەت؟"

- "هزر بکە تو خوەدانا کارگەهەکێی و تو نەشیای هەڤسەنگیەکێ دناڤبەرا مەزاختنا بەرهەمێن کارگەها خوە و بهایێ بازارِی دا بکەی و د هەمان دەم دا مەترسیا خوسارەتبوونێ ژی یا ل سەر تە هەی. ل وی دەمی دێ پرسیارێ ژ خوە کەی: "ئەرێ ئەز چ بکەم داکو هندەك پارەی پاشەکەفت بکەم؟"

- "دبیت ئەز مووچەیێ کرێکاران ب نیڤی بکەم یان کێم بکەم."

- "ئەڤە تشتێ یەکانەیە یێ تو دشێی ئەنجام بدەی."

- "باشە هەکە هەموو سەرمایەدار وەکو تە د فێلباز بن کو د ڕاستی ژی دا د هۆسانە، کرێکار دێ هند هەژار بن تا وی ڕادەی ئێدی نەشێن پێدڤیێن ژیانا خوە بکڕن. دێ بێژین: شیانێن کرینێ دێ کێم بن و بازنەیا ڤالاهیێ ژی دێ هەر یا بەردەوام بیت. ب بۆچوونا مارکسی، ئەڤ چەندە ئاماژەیەکە کو دەمژمێرا ملکداریا تاکەکەسی یا سەرمایەداران یا بەرەڤ ب دوماهی دچیت و هۆسا دێ کەڤینە د ڕەوشەکا بەری سەرهلدانا شۆرەشێ دا."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "ب کورتی، ل دوماهیێ کرێکار دێ شۆرەشێ کەن و دەستێ خوە دانە سەر ئالاڤێن بەرهەم ئینانێ."

- "باشە پاشی دێ چ چێبیت؟"

- "د وێ هەیامێ دا، تەخەکا نوو ژ کرێکارێن بەری هینگێ دێ پەیدابیت و دێ گەهنە دەستهەلاتێ و کونترۆلێ ل سەر تەخا بورجوازی کەن. مارکسی دگوتە ڤێ چەندێ "دیکتاتوریا کرێکاران". لێ پشتی قۆناغا ڤەگوهاستنا دەستهەلاتێ، جڤاکەکێ بێ تەخ و چین دێ پەیدابیت و دیکتاتوریا کرێکاران ژی نامینیت. ئەڤ جڤاکە ژی جڤاکێ سوشیالیستی یە کو تێدا هەموو ئالاڤێن بەرهەم ئینانێ ملکێ هەموو کەسانە، یان ملکێ مللەتی هەموویێ یە. د جڤاکەکێ هۆسا دا، هەر کەسەك دێ ل دووڤ هێز و شیانێن خوە کار کەت و ل دووڤ پێدڤیێن خوە پارەی وەرگریت، ژبەرکو ئێدی کارکرن دێ بیتە ملکێ مللەتی و هاڤیبوون نازڤرِیتەڤە."

- "خوشە مرۆڤ هۆسا گوهێ خوە بدەتە تە! بەلێ ژ ڕاستا ئەڤ چەندە پەیدابوو؟"

- "بەلێ و نەخێر. ئابورناسێن سەردەم د وێ باوەرێ دانە کو پێشبینیێن مارکسی د هندەك خالێن هەرە گرنگ دا شاش دەرکەفتبن یان بەروڤاژی وان بۆ ڕاستی. بۆ نموونە شرۆڤەکرنا قەیرانێن سیستەمێ سەرمایەداریێ و پشتگوهـ هاڤێتنا دیاردەیا دەلیڤەدیتنا سروشتی کو ئەڤرۆکە ئەم ل بەرچاڤ وەردگرین. بەلێ پا سەرەڕای ڤێ چەندێ هەموویێ..."

- "ێ؟"

- "مارکسیەت بۆ ئەگەرێ پەیدابوونا چەندین وەرچەرخانێن مەزن. ئەم نکولێ ناکەین کو مارکسیەت بوو ئەگەر جڤاك پتر ببیتە جڤاکەکێ مرۆڤایەتی، نەخاسم ل

ئەوروۆپا، ژبەركو ئێدی خەلك ب شێوەیەكێ دادپەروەرتر و هەڤدەنگتر ژیا. ژبەر هندێ ئەم قەردارێن ماركسی و تەڤگەرا سوشیالیستێ نە."

- "باشە پشتی هینگێ چ ڕوودا؟"

- "پشتی ماركسی، تەڤگەرا سوشیالیستێ ل سەر دوو لایەنان دابەش بوو: سوشیالیستیا دیموكراتی و لینینیزم. سوشیالیستیا دیموكراتی یاكو پێكۆلێ بۆ پەیداكرنا جڤاكەكێ سوشیالیستی دكەت، ب شێوەیەكێ ئارام و هێدی ل ئەوروۆپا ڕۆژئاڤای بەلاڤ بوو، ژبەركو ئەو وەكو شۆرەشەكا هێدی بوو. لێ لینینزم كو هێشتا ئەو باوەریا ماركسی پاراست بوو یا دگوتی ب تنێ شۆرەش دشێت جڤاكێ تەخێن كەڤن ژناڤ ببەت، هەر زوو ل ئەوروۆپا ڕۆژهەلات و ئاسیا و ئەفریقیا بەلاڤ بوو. لێ هەر یەك ژ ڤان تەڤگەرێن نوو و هەر یەكێ ل دووڤ شێوازێ خوە یێ تایبەت دژی هەژاری و زۆلم و زۆرداریێ خەبات دكر."

- "بەلێ ما ڤان تەڤگەران ژی ڕێك ل هەمبەر جۆرەكێ نوو یێ سەركوتكرنێ خوش نەكر؟ ئەز ڤێ چەندێ دبێژم چونكی یەكێتیا سوڤیەت و ئەوروۆپا ڕۆژهەلاتی دهێنە پێشچاڤێن من؟"

- "بێگومان ڕاستە. پێدڤیە تیبینیا هندێ بكەین كو هەردەمێ تشتەك كەفتە د دەستێ مرۆڤان دا، ئەڤ تشتە بۆ باشی و خرابیێ دهێتە بكارئینان. ئانكو پشتی بورینا پێنجی یان سەد سالان ل سەر مرنا ماركسی، ئەم نەشێین بەرپرسیاریا هەموو كارێن خراب بۆ ناڤێ وی بزڤرینین، نەخاسم ل وان وەلاتێن سیستەمێ سوشیالیست دهێتە بجهـ ئینان. ڕەنگە ماركسی هزرا هندێ نەكربیت كو ئەو كەسێن دێ جڤاكێ كۆمونیستی ژی برێڤە بەن هەر مرۆڤن و مرۆڤ ژی هەموو وەكو یەكن، هەردیسان ڕەنگە وی نەزانی بیت كو چ جاران بەهەشت ل سەر ئەردی پەیدانابیت، چونكی مرۆڤ باش دزانن دێ چەوا هندەك ئاریشەیێن نوو ئافرینن."

- "ڕاستە!"

- "ئەز دبێژم دێ ماركسی ب دوماهی ئینین."

- "كا ڕاوەستێ، ل دەستپێكێ تە گوتبوو دادپەروەری ب تنێ دناڤبەرا وان كەسان هەیە یێن سەر ب یەك جیهان ڤە."

- "سكرووجی وەگوتبوو نەك من."

- "و تە چەوا زانی وی یا وەگوتی؟"

- "باشە. چیرۆکا من و تە ژ لایێ یەك نڤیسەر ڤە دهێتە نڤیسان، ژبەر هندێ ئەم هەردوو گەلەك یێن پێکڤە هاتینە گرێدان، پتر ژ وێ یا تو هزر دکەی."

- " وهوو ڤێجا بۆ ترانێن تە...!"

- "ڤێ ترانێ دوو ڕامان هەنە: ڕامانا سەرڤە و یا ژناڤ دا."

- "دا بزڤرینە ڤێ چیرۆکا دادپەروەریێ. تە گوتی مارکس دبێژیت سیستەمێ سەرمایەداری جڤاکەکێ نەدادپەروەر دئافرینیت، باشە دێ چەوا جڤاکەکێ دادپەروەر دەستنیشان کەین؟"

- " یەك ژ فەیلەسۆفێن ئەتیکی یێن داخبار ب مارکسی دبێژنێ "جون ڕولس" نموویەکێ دئینیت و دبێژیت: "هزر بکە تو ئەندامەکی د کومەلەکا گشتی یا بلند دا و دێ هەموو یاسایێن دەستهەلاتێ ل جڤاکی دکەن، دانن."

- "ئەز دبێژم ئەڤ چەندە گەلەك یا ب دلێ منە."

- "پێدڤیە ئەڤ ئەندامە جارەکا ب تنێ دا هزرا خوە د هەموو تشتان دا بکەن، ئانکو دەمێ ل دوماهیێ دگەهنە ڕێکەفتنێ و دەنگدانێ ل سەر یاسایان دکەن، دێ کەڤن و مرن."

- "ئەڤە چ تشتەکێ ب ترسە."

- "بەلێ پا جارەکا دی دێ زڤرن و دناڤ وی جڤاکی دا هشیاربن یێ بەری هینگێ وان یاسایێن وی دارێژتین، لێ تشتێ بۆ وان جهێ حێبەتیێ ئەوە نزانن کا جهێ وان دناڤ ڤی جڤاکی دا ل کیڤەیە."

- "ئەز تێدگەهم."

- "ئەڤ جڤاکە دێ جڤاکەکێ دادپەروەر بیت، چونکی یاسایێن وی ل سەر دەستێ هندەك زەلامێن وەکهەڤ هاتیە دانان؟"

- " و ژنك؟"

- "ئەڤ خالە بەشەکێ یاریێ پێکدئینیت. ژبەرکو ئەو کەس نزانیت کا دێ دناڤ لەشێ زەلامەکی یان ژنەکێ دا هشیاربیت. لێ ژبەرکو ئەڤ هەردوو مگرتیە هەنە، ل ڤێرێ دەلیڤە هەیە ئەم باوەر ژ هندێ بکەین کو ئەڤ جڤاکە دێ جڤاکەکێ دادپەروەر بیت بۆ ژن و مێران و ب شێوەیەکێ وەکهەڤ."

- "ئەڤە بیرۆکەیەکا بالکێشە."

- "نوکە بەرسڤا من بدە: ئەرێ ل سەردەمێ مارکسی، جڤاکی ئەورۆپی یێ ب ڤی ڕەنگی بوو؟"

- "نەخێر."

- "ئەرێ تە جڤاکەکێ ب ڤی ڕەنگی ل جیهانێ دیتیە؟"

- "من نە باوەرە هەبیت."

- "دێ دەلیڤێ دەمە تە پتر هزرا خوە بکەی، نوکە دێ بابەتێ مارکسی گرین."

- "تە چ گوت؟"

- "چ نە! دێ نوکە ڕاوەستین."

# داروین

*... پاپۆرەکا پڕ ژ جینان دناڤ گەمیا ژیانێ دا ب ڕێکەفت...*

سپێدەهیا ڕۆژا یەکشەمبی هێلد ل دووڤ دەنگێ ڤێکەفتنەکا بلند هشیاربوو، ئەو ژی دەنگێ فائیلا کاغەزان بوو دەمێ ب هێز ب ئەردی کەفتی. دوهی ب شەڤ، دانوستاندنا دناڤبەرا سۆفیا و ئەلبێرتۆی ل دور مارکسی دخواند هەتا خەو کەفتیە چاڤێن وێ، گلۆپا ڕۆناهیا خواندنێ هەتا سپێدێ ب ڕەخ تەختێ وێ ڤە یا مابوو هەلکری.

ژمارەیێن ڕەنگ کەسك و تەیسوك دناڤ دەمژمێرا وێ یا ل سەر مێزێ دیاردکر کو دنیا یا بوویە سپێدە و دەمژێر 8:59 خولەکەك بوو.

هێلدێ خەون ب کارگەهێن مەزن و باژێرێن پیسبووی ڤە ددیتن، کچەکا بچووك ل کوژیەکا جادەی ڤالکێن شخارتەیان دفروتن و چەندین کەسێن زەنگین و ب جلوبەرگێن ماڤیل و چاکیتێن درێژ د بەر وێ ڕا دبورین بێ کو ئاگەهـ ژ وێ هەبیت.

دەمێ هێلد ژ خەو هشیاربووی، بیرا خوە ل وان یاسادانەران ئینا یێن دناڤ جڤاکێن خوە دا یاسا ددانایین. هەرچەوا بیت، ئەو یا بەختەوەرە کو ل بجێرکلی هشیاربووی. ئەگەر وێ نەزانیبایە دێ ل کیڤ جهێ نەوریجێ ژ خەو هشیار بیت، تو بێژی ل وی دەمی ئەو وێریابایە ژ خەو هشیار بیت. لێ پرسیار ب تنێ نە ئەوە کا دێ ل "کیرێ" هشیار بیت،

**بەلکو یا بسانەهیتر نەبوو ئەگەر ئەو ل سەردەمەکێ دی هشیار بیت؟ بۆ نموونە ل چەرخێن ناڤەڕاست یان چەرخێ بەرین یێ بەری دەهـ هزار سالان؟ وێ دئینا پێشچاڤێن خوە یا ل بەر دەرێ شکەفتەکێ ڕوونشتیە.**

**ئەرێ ڕەوشا کچەکا پازدە سالی بەری نەبوونا تشتەکی ب ناڤێ شارستانیەت دا یا چەوا بیت؟ ئەرێ ئەو دا چەوا هزرا خوە کەت؟ ئەرێ ما کی دبێژیت دا وێ هزر و خەون هەبن؟ هێلدێ چاکیتەك کرە بەر خوە و فائیلا وەرەڤان ئینا دەرێ داکو بەشێ ل دووڤ دا تەمام بکەت.**

هێشتا ئەلبێرتۆی نە گوتی "ڕاوەستێ"، کەسەکی دەرگەهێ کۆلکی قوتا.

سۆفیایێ گوت: "مە چ هەلبژارتنێن دی نینن، مانە هۆسایە؟"

ئەلبێرتۆی گوت: "ئەز باوەرناکەم مە هەبن."

ل بەر دەرگەهێ ژ دەرڤە، زەلامەکێ دانعەمر و خوەدان پرچەکا سپی و درێژ ڕاوەستیابوو، دارەك د دەستێ وی دا بوو و ب دەستێ دی ژی کەڤالەك هەلگرتبوو کو وێنەیێ پاپۆرەکا تژی ژ هەموو جۆرێن گیانەوەران ل سەر هاتبوو نەخشاندن.

ئەلبێرتۆی پرسیار ژێ کر: "ئەرێ ئەڤ زەلامێ دانعەمر کیە؟"

- "ناڤێ من نوحە."

- "من ژی هۆسا هزر دکر."

- "ئەز باپیرێ تە یێ مەزنم، کورێ من. لێ هۆسا دیارە ئێدی کەس باب و باپیرێن خوە نانیاسیت."

سۆفیایێ پرسیار ژێ کر: "ئەرێ ئەڤە چیە د دەستێ تەدا؟"

- "باشە. ئەو وێنەیێ وان هەموو گیانەوەرانە یێن ژ تۆفانێ ڕزگاربووین. ها بگرە، ئەو بۆ تەیە."

سۆفیایێ ئەو کەڤالێ مەزن ژێ وەرگرت.

- "باشه. یا باشتره ئەز بزڤرمه مال داکو چاڤدێریا دار مێوێن خوه بکەم."

پشتی گوتنا ڤان ئاخڤتنان، وی زەلامی دانعەمر ب پێنگاڤەکا مەزن خوه بلند کره ئەسمانی و هەر زوو دناڤ دارستانێ دا بەرزه بوو.

ئەلبێرتۆ و سۆفیا هاتنه د ژوور ڤه و ڕوونشتنه خوارێ، سۆفیایێ دڤیا هزرێن خوه د وێنەی دا بکەت لێ هەر زوو ئەلبێرتۆی کەڤالێ ژ دەستێن وێ ئینا دەرێ و گوت: "نوکه ئەم دێ پتر ل سەر خالێن سەرەکی ڕاوەستین."

- "باشه، باشه."

- "من ژبیر کر بێژم کو مارکسی 35 سالێن دوماهیا ژیانا خوه ل لەندەن بوراندن. ل سالا 1849ێ مالا خوه ڤەگوهاسته وێرێ و ژیانا خوه یا مایی ل وێرێ بوراند هەتا ل سالا 1883ێ وەغەر کری. ب درێژاهیا وی ماوەی، چارلز داروین ل دەرڤەی لەندەن دژیا هەتا ل سالا 1882ێ وەغەرکری و د ڕێوڕەسمەکێ مەزن و ژ هەژی دا ل دەڤەرا "وێست مینستەر ئابی" وەك کەسەکێ ئینگلتەرا یێ ناڤدار هاته ڤەشارتن. ب ڤی ڕەنگی، ڕێکا مارکسی و داروینی دگەهشته یەك. ئەڤ چەندە ژی نه ژبەر هندێ بوو کو ئەو هەردوو ل یەك جهـ و یەك سەردەم دژیان. مارکسی دڤیا چاپا ئینگلیزی یا مەزنترین کارێ خوه کو پەڕتووکا "سەرمایه" بوو پێشکێشی داروینی بکەت، لێ داروینی ئەڤ دیاریا مەزن ڕەتدکر: دەمێ پشتی بورینا سالەکێ ل سەر مرنا داروینی، مارکس ژی مری، هەڤالێ وێ یێ نێزیك "فریدیریك ئەنجلز"ی گوت "کا چەوا داروینی تیورا چەوانیا وەڕارکرنا زیندەوەران دانا، ئاها هۆسا مارکسی ژی تیورا وەڕارکرنا دیرۆکا مرۆڤان دانا."

- "ێ، ئەز تێگەهشتم."

- "یەك ژ هزرمەندێن دی یێن ناڤدار یێ کارێ خوه ب کارێن داروینی ڤه گرێدای، زانایێ دەروونی "سیگموند فرۆید" بوو، وی ژی دوماهیك سالێن ژیانا خوه ل لەندەن بوراند بوون. فرۆید دبێژیت ئەڤ هەردوو تیوره: تیورا وەڕارکرنێ یا داروینی و تیورا وی ل دور شرۆڤەکرنا دەروونی، هەڤڕکیا سەر ڕەقی و سەرداچوونا مرۆڤی کریه.

- "د یەك دەم دا تە بەحسێ گەلەك ناڤان کر. ئەرێ دێ نوکه ل سەر کێ ئاخڤین: مارکس، داروین یان فرۆیدی؟"

- "ب تێگەهەکێ بەرفرەهتر، ئەم دشێین بەحسێ تەڤگەرەکا "سروشتی" هەر ژ ناڤەڕاستا چەرخێ نوزدێ زاینی هەتا ڤی چەرخی بکەین. ل ڤێرێ مەرەم ژ "سروشتی" ئەوە ئەو هەستە یا دانپێدانێ ب چ تشتان نەکەت ژ بلی ڕاستیا سروشتی و جیهانا مە یا هەستپێکەر، ئەڤ جیهانا هەستپێکەر ژی پشت بەشتنێ دکەتە سەر دیاردەیێن سروشتی نەك ل سەر مگرتی یێن کەتواری و یان وەحییێن خودای."

- "ئەڤ چەندە ل سەر مارکس، داروین یان فرۆیدی ژی دهێتە پڕاکتیزە کرن؟"

- "هەلبەت، ئەو پەیڤێن ل ناڤەڕاستا چەرخێ بوری بووینە زاراڤ ئەڤەبوون: ژینگەهـ، دیرۆك، وەراڕکرن، گەشەکرن. مارکسی ئاماژە ب هندێ کر بوو کو ئایدولوژییێن مرۆڤایەتی ژ ئەنجامێ کاودانێن مەتریالی یێن جڤاکی پەیدادبن. داروینی ژی دیارکر کو ڕەگەزێ مرۆڤی ژ ئەنجامێ وەراڕکرنەکا هێدی پەیدابوویە و ڤەکۆلینێن فرۆیدی ل دور بێئاگەهیا* مرۆڤی ژی ئاشکەرا کر کو پتریا لڤین و ڕەفتارین مرۆڤی ژ ئەنجامێ هندەك پالدەر و غەریزەیێن گیانەوەری پەیدادبن."

- "ئەز دبێژم تا ڕادەیەکی ئەز تێگەهشتم کا مەرەم ژ سروشتی چیە. بەلێ ما نە یا باشترە ئەم یەك یەکە بەحسێ وان بکەین؟"

- "ئەم دێ نوکە بەحسێ داروینی کەین. ئەگەر بیرا تە بهێت ئەو فەیلەسۆفێن بەری سۆکراتی ل دووڤ هندەك شرۆڤەکرنێن سروشتی بۆ ڕوودان و دیاردەیێن سروشتی دگەریان. ب هەمان ڕێك کا چەوا وان خوە ژ شرۆڤەکرنێن ئاشوپی و ئەفسانەیی یێن ڤان دیاردەیان دوور دکر، ئاها هۆسا داروینی ژی خوە ژ شرۆڤەکرن و دیتنا دێرێ ل دور ئافراندنا مرۆڤ و گیانەوەران دوور دکر."

- ئەرێ ژ ڕاستا ئەو ژی فەیلەسۆف بوو؟"

- "داروین زانایەکێ بایولوژی و ڤەکولەرەکێ سروشتی بوو. د هەمان دەم دا، ئەو زانایێ سەردەم بوو یێ هەڤڕکیا دیتنا کتێبا پیرۆز ل دور چەوانیا ئافراندنا مرۆڤی ژ لایێ خودای ڤە کری."

- "پا ل دەستپێکێ پێدڤیە تو بۆ من بەحسێ تیورا وەراڕکرنێ یا داروینی بکەی."

---

* بێئاگەهی Subconscious یان Unconscious و ب عەرەبی ژی دبێژنێ "اللاوعی"

- "باشه. دا ژ داروینی وەك مرۆڤ دەست پێبکەین. ئەو ل سالا 1809ێ ل دەڤەرا "شرۆزبیری" ل ئینگلتەرا هاتیە سەر دنیایێ. بابێ وی د. ڕوبەرت داروین، نوشدارەکێ میللی یێ ناڤدار بوو و گەلەك یێ دژوار بوو د پەروەردەکرنا کورێ خوە دا. دەمێ چارلز قوتابی ل قۆناغا ناڤنجی، ڕێڤەبەرێ قوتابخانێ دگوت ئەو کورەکێ گەلەك لڤلڤوکە و چ کارێن ب مفا و باش ناکەت. ب دیتنا ڕێڤەبەری، کارێن باش ئەون دەمێ مەژیێ قۆتابیان ژ ڕەفتار و گوتنێن یونانی و لاتینی پڕ دکەن. مەرەما وی ژ لڤوکیا چارلزی ئەو بوو کو بەردەم یێ ب دووڤ کێز و مێریان ڤە و بۆ خوە کوم دکەت."

- "ئەز یا پشتڕاستم نوکە پشتی هینگێ ڕێڤەبەرێ وی ل سەر گوتنا ڤان ئاخفتنان پەشیمان بوویە."

- "دەمێ دەست ب خواندنا لاهوتی ژی، چارلزی بەردەوام زێرەڤانیا باڵندەیان دکر و کێز و مێشومور ل خوە کوم دکرن، ژبەر هندێ چ پلەیێن باش وەرنەدگرتن، لێ هێشتا ئەو قوتابی ل کولیژی، ناڤودەنگیەکا باش وەك زانایەکێ سروشتی پەیداکر، زێدەباری گرنگیدانا وی ب جیولوجیایێ کو بەربەلاڤترین زانست بوو ل سەردەمێ وی. دەمێ ژ قوتابخانەیا لاهوتی ل کامبریدج ل سالا 1831ێ دەرچووی، چوو باکورێ "وێلز" داکو ڤەکۆلینان ل سەر چەوانیا پەیدابوونا بەران و زیندەوەرێن بەردبووی* بکەت. ل هەیڤا تەباخا هەمان سال کو ژیێ وێ ب تنێ 22 سال بوون نامەیەك بۆ وی هات و ڕێبازا ژیانا وی هەموو گوهارت.

- "ئەو نامە ژ دەڤ کێ هاتبوو؟"

- "ژ دەڤ مامۆستا و هەڤالێ وی "جون ستیڤن هینسلو"ی. د نامێ دا نڤیسابوو "داخواز ژ من هاتیە کرن زانایەکێ سروشتی براسپێرم داکو وەك هاریکارێ کاپتن "فیتزوری" دەست ب وێ گەشتێ بکەن یا ژ لایێ حکومەتێ ڤە هاتیە پێشنیار کرن ژ بۆ ڤەکۆلینا کنارێن باشوری یێن کێشوەرێ ئەمریکا باشوری. من ژی بەرسڤا وان دایە کو تو باشترین و بکێرهاتیترین کەسی بۆ وەرگرتنا ڤی ئەرکی. دەربارەی موچەی ژی، من چ پێزانین ل سەر نینن، لێ یا ئەز دزانم ئەڤ گەشتە بۆ ماوەیێ دوو سالان دێ ڤەکێشیت."

- "تو چەوا ڤان پێزانینان هەموویان ژبەر دکەی؟"

* زیندەوەرێن بەردبووی Fossils ب عەرەبی ژی دبێژنێ "الحفریات": بەرمایکێن زیندەوەرێن بەری دیرۆکێ نە کو ل سەر ڕەنگێ بەران یان دناڤ ڤالبێن بەران دا هاتیە پاراستن.

- "تشتەکێ ب سانەهیە، سۆفیا."

- "باشە وی چ بەرسڤ دا؟"

- "ئەو گەلەك یێ خوینگەرم و ب پەرۆش بوو ڤی دەلیڤێ ژ دەستێن خوە نەکەت. لێ ل وی سەردەمی، گەنجان چ کار بێ شیرەتێن مالا خوە نەدکرن. پشتی زەحمەتەکا مەزن ل دوماهیێ شیا بابێ خوە ڕازی بکەت کو دەلیڤێ بدەتێ ڤێ گەشتێ بێ بەرامبەر ئەنجام بدەت، ئانکو چ پارە بەرامبەر وەرنەگرتن."

- "ئاها."

- "بەلێ. ئەو پاپۆرا دا پێ گەشتا خوە ئەنجام دەن، پاپۆرەکا دەریایی بوو ب ناڤێ "H. M. S. BEAGLE" و گەشتا خوە ل ڕێکەفتی 27 کانونا یەکێ یا سالا 1831ێ ژ بلایموت دەستپێکر و بەرەڤ کێشوەرێ ئەمریکا باشوری ڤە چوو، لێ ل سالا 1836ێ ژ نوو ئەڤ پاپۆرە گەهشتە وی جهی، ئانکو ل شوونا دوو سالان پێنج سال بورین و گەشتا وان یا بۆ ئەمریکا باشوری بۆ گەشتەکا ل دور جیهانێ و یەك ژ گرنگترین گەشتێن ئاشکەراکرنێ ل چەرخێن سەردەم."

- "ئەرێ ئەو ل دور دنیایێ هەموویێ زڤڕین؟"

- "بەلێ. ژ ئەمریکا باشوری بەرەڤ زەریا ئارام و نیوزلەندا و ئوسترالیا و باشورێ ئەفریقیا، پاشی دووبارە زڤڕینە ئەمریکا باشوری ڤە بەری کو ل دوماهیێ بڤەگەڕنە ئینگلتەرا. داروین د پەڕتووکا خوە دا دبێژیت: "گەشتگرن ل سەر پاپۆرا بیگلێ، گرنگترین ڕوودان بوو د ژیانا من دا."

- "چ پێنەڤێت بۆ زانایەکێ وەکو وی، ژیانا ل سەر پشتا پاپۆرەکا د نیڤا دەریایێ دا یا سروشتی نابیت."

- "ل سالێن دەستپێکێ، پاپۆرا بێگل بەردەوام ل سەر کنارێ کێشوەرێ ئەمریکا باشوری دهات و چوو، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر داروین شارەزایەکا باش ل دور ڤی کێشوەری پەیدابکەت. هەردیسان هێرشێن وان بۆ سەر کنارێن گزیرتەیێن "گالاپاکوس" یێن دناڤ زەریا ئارام دا ل ڕۆژئاڤایێ کێشوەری ئەمریکا باشوری ڕۆلەکێ گرنگ هەبوو، چونکی ئەو شیان برەکا باش یا کەرەستەیێن خاڤ و دەستپێکی کوم بکەن و بۆ ئینگلتەرا فرێکەن. دگەل ڤێ چەندێ ژی، داروینی بەردەوام تیبینی یێن خوە ل دور سروشت و وەرارکرنا ژیانێ

دنڤیسین. دەمێ ل ژیێ 27 سالیێ زڤڕیە وەلاتی، وەکو ڤەکولەرەکێ سروشتی ناڤدار ببوو. هەر ژ وی دەمی بیرۆکەیا تیورا وەرارکرنێ د مەژییێ وی دا پەیدابوو. بەلێ پا وی ئەڤ کارێ خوە یێ سەرەکی هەر یەکسەر بەلاڤ نەکر بەلکو چەندین سالان پشتی هینگێ بەلاڤ کر، ژبەرکو ئەو زەلامەکێ گەلەك هشیار بوو و لەزێ ل کارێن خوە نەدکر، هەلبەت یا پێدڤیە زانا هەموو د هۆسا بن."

- "باشە کارێ وی یێ سەرەکی چ بوو؟"

- "د ڕاستی دا هژمارەکا کاران بوون، لێ ئەو پەڕتووکا وی یا بوویە جهێ دانوستاندن و گەنگەشەییێن مەزن ل ئینگلتەرا، پەڕتووکا وی ل دور "بنیاتێ ڕەگەزان" بوو ئەوا ل سالا 1859ێ بەلاڤکری. ناڤونیشانێن وێ یێن تەمام ئەڤە بوون: "ڕەگەزێ بنیاتان ب ڕێکا هەلبژارتنا سروشتی"، یان ژی "پاراستنا ڕەگەزێن پتر گونجای د هەڤڕکیا مان و نەمانێ دا". ئەڤ ناڤونیشانێ درێژ د ڕاستی دا کورتیا تیورا داروینی بۆ مە ڕۆهن دکەت."

- "ڕاستە وی گەلەك تشت د ڤی ناڤونیشانی دا دیارکرینە."

- "ئەم دێ بەش بەش وەرگرین. د پەڕتووکا بنیاتێ ڕەگەزان دا، داروینی دوو بیرۆکە یان تیورێن سەرەکی پێش ئێخستینە. د تیورا یەکێ دا، داروینی پێشنیار کربوو هەموو شێوەییێن گیانەوەر و ڕووەکێن نوکە هەین، بەری هینگێ ژ هندەك شێوەییێن دەستپێکی هاتینە وەرگرتن، ئەو ژی ب ڕێکا وەرارکرن و پێشکەفتنا بایولوژی. د تیورا دووێ ژی پێشنیار دکەت ئەڤ وەرارکرنە ژ ئەنجامێ هەلبژارتنەکا سروشتی پەیدادبیت."

- "ئانکو مان بۆ یێ گونجایتر و ژ هەژیتر، مانە هۆسایە؟"

- "بەلێ ڕاستە. بەلێ ل دەستپێکێ دا بەحسێ بیرۆکەیا وەرارکرنێ بکەین. ئەڤ بیرۆکە ب خوە نە یا نوو بوو، بەلکو بیرۆکەیا وەرارکرنا بایولوژی بەری هینگێ ژ لایێ زانایێ گیانەوەرناسێ فرەنسی "لامارك"ی ڤە هاتبوو پێشنیار کرن و پێشوازیەکا باش لێ هاتبوو کرن. هەتا بەری چارلزی ب خوە ژی، باپیری وی ئیراموس داروینی ئەو بیرۆکەیە پێشنیار کر بوو یا دگوتی هەموو ڕووەك و گیانەوەر ژ هژمارەکا کێم یا ڕەگەزێن دەستپێکی پەیدابووینە. لێ کەسێ ژ وان چ شرۆڤەکرنێن هۆسا پێشکێش نەکربوون کا چەوا ئەڤ وەرارکرنە پەیدادبیت، ژبەر هندێ ژی زەلامێن دێرێ ئەو وەکو گەفێن مەترسیدار نەهەژمارت بوون."

- "ئەرێ وان داروین وەکو گەفەکا مەترسیدار ددیت؟"

- "بەلێ. لێ ئەڤ چەندە یا بێ ئەگەر نەبوو، چونکی بازنەیێن ئەکلیریکی* و زانستی باوەری ب وێ بۆچوونا تەوراتی هەبوو یا دگوتی ڕەگەزێ گشت ڕووەك و گیانەوەرێن ل سەر ڕوویێ ئەردی ب چ ڕەنگان ناهێتە گوهۆڕین و هەر جۆرەکێ ڕووەك یان گیانەوەری ب شێوەیەکێ سەربەخو هاتیە ئافراندن و هەتا هەتایێ ناهێتە گوهۆڕین. ئەڤ بۆچوونە پتر دگەل ڕێنماییێن ئەفلاتۆن و ئەرستۆی ژی دگونجیا."

- "ئانکو چەوا؟"

- "تیورا ئەفلاتۆنی ل دور بیرۆکەیان، پێشنیار دکر کو ڕەگەزێن هەموو گیانەوەران ناهێنە گوهۆڕین چونکی ئەو ژبەر قالبێ هندەك بیرۆکە و شێوەیێن نەمر و هەتا هەتایی هاتینە دروستکرن. هەردیسان نەگوهۆڕینا ڕەگەزی یەك ژ سیماییێن فەلسەفا ئەرستۆی ژی بوو، لێ ل سەردەمێ داروینی هندەك شوونوار و بەرمایکێن دەستپێکی هۆسا پەیدابوون کو هەموو بیروباوەرێن کلاسیکی ددانانە بەر تاقیکرنێ."

- "ئەو چ جۆرە شوونوار و بەرمایکێن دەستپێکی بوون؟"

- "باشە. دا دێ ژ هژمارەکا مەزن یا وان بەرمایکێن بەردبووی دەستپێکەین یێن ژ هەستیکێن گیانەوەرێن مەزن و ژناڤچووی هاتینە وەرگرتن. داروینی ب خوە ژی چەندین شوونوارێن بونەوەرێن دەریایی ب دووراتیا چەندین میلان ل سەر هشکاتی دیتن، زێدەباری وان شوونوارێن وی ل چیاییێن ئەندیر ل سەرێ کێشوەرێ ئەمریکا باشوری دیتین."

- "سۆفیا، بونەوەرەکێ دەریایی ل سەرێ چیایێ ئەندیر دێ چ کەت، تو دشێی بۆ من ڤێ چەندێ ڕۆهن بکەی؟

- "نەخێر."

- "هندەك کەس د وێ باوەرێ دا بوون کو ئەڤ بونەوەرە ژ لایێ مرۆڤان ڤە هاتبنە نێچیرکرن و بربنە وێرێ، هندەکێن دی ژی هزردکر خودای ئەڤ بونەوەرێن بەردبووی و شوونوارێن بونەوەرێن دەریای ل ڤی جهی ئافراندینە داکو مرۆڤێن بێباوەر ڕاستەرێ بکەت."

- "باشە زانایان چ دگوت؟"

---

*شێوازێ فێرکرنا ئاینی ل سەر شێوەیێ پرسیار و بەرسڤان

- "پترِیا زانایێن جیولوجی "تیورا کارەستان" پشتڕاست دکر کو دبێژیت دەمێ ئەرد تووشی لافاوێن مەزن و بیڤەلەرز و کارەساتێن مەزن بووی، هەموو جۆرێن ژیانێ ل سەر ڕوویێ ئەردی ژناڤچوون. د پەرتووکا پیرۆز دا بەحسێ یەك ژ ڤان لافاوێن مەزن هاتیە کرن کو ئەو ژی تۆفانا پاپۆرا نوحی بوو. پشتی هەر کارەساتەکێ، خودا دووبارە ژیانێ ل سەر ڕوویێ ئەردی ب زیندەوەر و گیانەوەرێن نوو و گونجایتر ڤە نوو دکەت."

- "ئانکو ئەڤ بەردبووینە، شوونتبلێن شێوەیێن وێ ژیانێ بوون یێن ژ ئەگەرێ ڤان کارەساتێن مەزن ژناڤچووین."

- "هەلبەت. بۆ نموونە، وان دگوت ئەڤ بەردبوویە شوونوارێن وان گیانەوەرانە یێن نەشیاین سوواری پاپورا نوحی ببن. لێ دەمێ داروین چوویە سەرێ چیایێ بیگل، دانەیەك ژ پەرتووکا زانایێ بایولوژی یێ ئینگلیز "چارلز لیل" ب ناڤێ "بنەمایێن جیولوجیایێ" دگەل خوە بربوو. چارلز لیلی دووپات کربوو کو جیولوجیا ئەردی یا نوکە، ب هەموو چیا و گەلی و نهالێن خوە ڤە، ژ ئەنجامێ وەرارکرنەکا دوور و درێژ پەیدابوویە. ئەو د وێ باوەرێ دا بوو کو گوهۆڕینێن بچووك ژی دشێن هندەك بلنداهیێن جیولوجی یێن مەزن پەیدابکەن."

- "وی هزرا کیژ گوهۆڕینان دکر؟"

- "هزرا وان هێزان دکر یێن ئەڤرۆکە ژی هەین: سەقا و با، حەلیانا بەفرێ، بیڤەلەرز و بلنداهیێن سەر ئاستێ ڕوویێ دەریای. تە گوهـ ل وێ گوتنێ بوویە یا دبێژیت چپکەکا ئاڤێ دشێت بەرەکی کون بکەت، ڕاستە ئەڤ چپکە ب هێزا ئەلماسی وی بەری کون ناکەت لێ ب هێزا بەریەکەفتنا بەردەوام دشێت ڤی کاری بکەت. چارلز لیل د وێ باوەرێ دابوو کو ئەڤ گوهۆڕینێن بچووك و پلە پلە دشێن دیمەنێ سروشتی هەموویێ بگوهۆڕن. لێ دگەل ڤێ چەندێ ژی، تیورا وی ب تنێ نەشیا وێ ڕاستیێ شرۆڤە بکەت کا بۆچی داروینی بەرمایکێن بونەوەرێن دەریایی ل سەرێ چیایێ ئاندیز دیتن. لێ داروینی ژی بەردەوام دووپات دکر کو "گوهۆڕینێن بچووك یێن پلە پلە" دشێن ببنە ئەگەرێ پەیدابوونا گوهۆڕینێن مەزن ئەگەر دەلیڤەیەکا پێدڤی پێ بهێتە دان."

- "ئەز دبێژم ئەڤ شرۆڤەکرنا دگەل وەرارکرنا گیانەوەران ژی دگونجیت."

- "بەلێ، ئەڤە بۆچوونا داروینی ژی بوو. هەروەکو بەری نوکە من گوتی، داروین کەسەکێ گەلەك هشیار بوو، دەمێ وی پرسیارەك کربایە، دەمەکێ درێژ پێڤە دچوو هەتا باش هزرێن خوە کربانە و ژ نوو بەرسڤ ددا. ب ڤی ڕەنگی، وی شێوازێن هەموو فەیلەسۆفان بکارئینان: گەلەك یا پێدڤیە ئەم پرسیاران بکەین، لێ پێدڤی ناکەت ئەم لەزێ د بەرسڤدانێ دا بکەین."

- "بەلێ، ئەز تێگەهشتم."

- "یەك ژ فاکتەرێن هەستیار د تیورا چارلز لیلی دا، ژیێ ئەردی بوو. ل سەردەمێ داروینی، ئەو بیروباوەر یا بەربەلاڤ بوو کو ژیێ ئەردی نێزیکی شەش هزار سالانە، هەلبەت برا ڤێ ژمارێ ژی هەر ژ ڕۆژ پەیدابوونا ئادەم و حەوایێ هەتا ئەڤرۆکە بوویە."

- "چەند بیروباوەرەکا سادەیە!"

- "باشە، تشتەکێ ئاسایی یە ئەم ڕەخنێ ل هندەك تشتان بگرین نەخاسم پشتی ڕووددەن یان پەیدادبن. ب هاریکاریا ڤەکۆلینێن خوە، داروین گەهشتە وی ئەنجامی کو ژیێ ئەردی نێزیکی 300 ملیون سالایە. هەلبەت ئەڤ ژیێ داروینی دەستنیشانکری تشتەکێ ڕۆهن و ئاشکەرا بوو، ژبەرکو ئەگەر وی ئەڤ تشتە ئاشکەرا نەکربایە، ئێدی نە تیورا پێشکەفتنا جیولوجی یا پلە پلە و تیورا داروینی یا وەراڕکرنێ چ شەرعیەت نەدما، چونکی هەر یەك ژ ڤان تیوران پێدڤی ب ماوەیەکێ گەلەك درێژ بوو.

- "باشە پا ژیێ ئەردی چەند سالە؟"

- "ل سەردەمێ ئەڤرۆکە زانست گەهشتیە وێ باوەرێ کو ژیێ ئەردی نێزیکی 4.6 بلیون سالایە."

- "واو، چەند گەلەکە."

- "هەتا نوکە ب تنێ ئەم ل سەر یەك گرۆڤەیێن داروینی ل دور تیورا وەراڕکرنا بایولوژی ڕاوەستیاین کو ئەو ژی بەرمایکێن بونەوەرێن بەردبووی بوو دناڤ تەختێن جۆراوجۆر یێن بەران دا. لێ داروینی گرۆڤەیەکێ دی ژی ل سەر ڕاستیا تیورا خوە پێشکێشکر، ئەو ژی دابەشبوونا جوگرافی یا ڕەگەزێن زیندی بوو. ل ڤێرێ داروینی چەندین پێزانینێن نوو و گرنگ بەلاڤکرن. داروینی ب چاڤێن خوە دیتبوو کو تاکێن هەر جۆرەکێ زیندەوەری ل دەڤەرەکا دەستنیشانکری، ب تنێ د هندەك ساخلەتێن بچووك دا

ژێکدهێنە جوداکرن. بۆ نموونە، وی چ جوداهێن مەزن ل دەڤ تاکێن هەمان جۆرێ زیندەوەری ل سەر گزیرتا جالاباگوس ل ڕۆژئاڤایێ ئەکودار نەدیتبوون."

- "بۆ من پتر بەحسێ ڤێ گزیرتێ بکە."

- "گزیرتا جالاباگوس ژ هژمارەکا گزیرتەیێن بورکانی پێکدهێت، ژبەر هندێ جوداهیێن مەزن ل دەڤ ژیانا گیانەوەر و ڕووەکێن وێ نەدهاتنە دیتن. لێ ژبەرکو داروینی گەلەك گرنگی ب جوداهیێن هەرە بچووك ژی ددا، وی چەندین کیسەلەیێن مەزن ل سەر هەموو گزیرتەیان دیتن ب ڕەنگەکی کیسەلەیێن هەر گزیرتەکێ ب هندەك ساخلەتێن گەلەك کێم و بچووك ژ کیسەلەیێن گزیرتەیێن دی دهاتە جوداکرن. ئەرێ ژ ڕاستا خودای ڕەگەزەکێ تایبەت یێ کیسەلەیان بۆ هەر یەك ژ ڤان گزیرتەیان جودا ئافراندیە؟"

- "من گومان ل سەر ڤێ چەندێ هەیە."

- "تیبینیێن داروینی ل سەر ژیانا باڵندەیێن گزیرتا جالاباگوس پتر جهێ حیبەتیێ بوون، ژبەرکو جوداهیەکا مەزن دناڤبەرا چووچکێن گزیرەتەکێ بۆ گزیرتەکا دی هەبوو، ب تایبەت شێوێ دمێ وان. داروینی ئەگەرێ ڤان جوداهیان بۆ ڕێکا پەیداکرنا خوارنێ ژ لایێ ڤان چووچکان ڤە ل سەر ڤان گزیرتان زڤڕاند. چووچکێن ژ جۆرێ "دوری" یێن دم تیژ و ژ هەردوو لایان ڤە خوار ل سەر توڤێ دارێن کاژان دژیان، باڵندەیێن دەنگبێژ یێن بچووك ل سەر مێشوموران دژیان، چووچکێن "حەسون" ژی ل سەر مێرییێن سپی یێن ل سەر چەق و بەلگێن داران دژیان.

هەر یەك ژ ڤان جۆرێن بالندان، دمەکێ هۆسا هەبوو کو دگەل شێوازێ خوارنا وان یێ گونجای بوو، ئەرێ تو بێژی ئەڤ باڵندەیە هەموو ژ یەك جۆرێ باڵندەی پەیدابووینە؟ ئەرێ ڤی جۆری خوە دگەل کاودانێن وان گزیرتەیان گونجاندینە، هەتا ب بورینا چەندین چەرخان بووینە ئەگەرێ پەیدابوون و وەرارکرنا جۆرێن نوو یێ چووچکان؟"

- "ئەڤە ئەو دەرئەنجام بوو یێ داروین گەهشتییێ. مانە؟"

- "بەلێ. دبیت داروین ل سەر گزیرتەیا جالاباگوس بوویە کەسەکێ "دارویني"، ژبەرکو وی تیبینیا هندێ کربوو کو گیانەوەرێن ڤێ گزیرتێ تا ڕادەیەکێ مەزن وەکو هژمارەکا جۆرێن وان گیانەوەرانە یێن وی ل کێشوەرێ ئەمریکا باشور دیتین. ئەرێ خودای جارەکا ب تنێ ئەڤ گیانەوەرە هەموو پێکڤە و ب ڤان جوداهیێن بچووك و سادەڤە

ئافراندینه، یان ژی ل دەستپێکێ ب تنێ جۆرەك ئافراندیه و هێدی هێدی ڤی جۆری وەراڕکریه بۆ گەلەك جۆرێن دی.

- هێدی هێدی گومانا وی ل دور هژمارا جۆرێن زیندەوەران یێن نەهێنە گوهۆڕین بەرەڤ زێدەبوونێ دچوو. لێ هەتا نوکه ژی زانا نەشیاینه شرۆڤەکرنەکا پڕاکتیکی دەربارەی چەوانیا ڤێ وەراڕکرنێ پێشکێش بکەن. سەرەڕای هندێ کو فاکتەرەکێ دی ژی هەیه ئاماژێ ب هندێ ددەت هەموو جۆرێن زیندەوەرێن سەر ڕوویێ ئەردی ب ڕەنگەکی ژ ڕەنگان پێکڤه د گرێداینه."

- "ئەو چ فاکتەره؟"

- "گەشەکرنا سوریلانکی "کورپەلەی" ل دەڤ گیانەوەرێن شیردەر. ئەگەر ئەم سوریلانکێن هەر یەك ژ سه و چەکچەکیله و کێڤریشك و مرۆڤان د ڤۆناغا دەستپێکێ یا گەشەکرنێ دا هەڤبەر بکەین، دێ بینین ئەڤ سوریلانکه تا ڕادەیەکی هۆسا د وەکهەڤن کو گەلەك یا ب زەحمەته ژێکجودا بکەین. ئەم نەشێین سوریلانکێ مرۆڤی ژ یێ کێڤریشکێ جودا بکەین هەتا هەردوو نەگەهنه ڤۆناغەکا گەشەکرنێ یا هەڕە پێشکەفتی و دوماهییێ. ئەرێ ما ئەڤ چەنده نه بەلگەیه ل سەر هندێ و ئەم مرۆڤێن هەڤدوو یێن ژێکدوورین؟"

- "بەلێ پا هەتا نوکه وی چ شرۆڤەکرنێن تەمام ژ بۆ چەوانیا وەراڕکرنێ پێشکێش نەکربوون؟"

- "داروینی هزرا خوه د تیورا چارلز لیلی دا دکر دەمێ دگوتی گوهۆڕینێن بچووك پشتی ماوەیەکێ درێژ دشێن ببنه ئەگەرێ پەیدابوونا گوهۆڕین و کاریگەرییێن مەزن، لێ داروین نەدشیا ڤێ شرۆڤەکرنێ وەکو ڕێسایەکا گشتی بکاربینیت. هەردیسان وی ئاگەهداریەکا باش ل دور تیورا گیانەوەرناسێ فڕەنسی لامارکی هەبوو یا کو دگوتی ڕەگەزێن جودا جودا یێن زیندەوەران ئەو ساخلەت ل دەڤ خوه پێشئێخستینه یێن پێدڤی دبنێ، بۆ نموونه، زەڕافەی ساخلەتا ستودرێژییێ ل دەڤ خوه وەراڕکریه، ژبەرکو ب بورینا چەرخ و دەمێن درێژ و نەمانا خوارنێ ئەو نەچاربوویه خوه بگەهینته بەلگێن داران یێن بلند. لامارك د وێ باوەرێ دا بوو ئەڤ ساخلەتا ڤی زیندەوەری ب خوه ل دەڤ خوه پەیداکری، دشێت بۆ بەرەبابکێن ل دووڤ خوه ژی دا بڤەگوهێزیت. لێ داروینی ئەڤ تیورا دەربارەی ڤەگوهاستنا "ساخلەتێن پەیداکری یان بدەستڤەئینای" ڕەتدکر، نەخاسم کو

لامارکی ب خوە ژی چ بەلگەیێن زانستی ل سەر ڤان گوتنێن خوە یێن وێرەك نەبوون. ژلایەکێ دی ڤە، داروینی دوڤچوونا شێوازەکێ دی یێ هزرکرنێ دکر کو هند یێ ئاشکەرا و ڕۆهن بوو، ئەم دشێین بێژین تا ڕادەیەکی میکانیزما ڕاستەقینە یا وەراڕکرنا زیندەوەران کەفتە بەر چاڤێن وی."

- "باشە، ئەو چ تیور بوو؟"

- "ئەز دبێژم یا باشتر ئەوە تو ب خوە هزر تێدا بکەی. ژبەر هندێ ئەز دێ پرسیارەکێ ژ تە کەم: "ئەگەر تە سێ چێل هەبن و تە ب تنێ ئالفێ دوو چێلان هەبیت، دێ چ کەی؟"

- "ئەز دبێژم دێ چێلەکێ سەرژێکەم؟"

- "باشە، دێ کیژ چێلێ سەرژێکەی؟"

- "یا ژ من ڤە ئەو چێلا ژ هەموویان کێمتر شیری بەرهەم دئینیت."

- "ژ ڕاستا دێ وەکەی؟"

- "بەلێ، چونکی ئەڤ چەندە بەرئاقلترە، مانە هۆسایە؟"

- "هەلبەت ئاها ڕەگەزێ مرۆڤان ژی ب درێژاهیا هزاران سالان ئەڤ چەندە کریە، لێ هێشتا ئەم ژ سحبەتا چێلان ب دوماهی نەهاتینە. باشە دێ بێژین تە دڤێت یەك ژ وان گولکەکی بینیت، دێ کیژ ژ وان هەلبژێری؟"

- "ئەو چێلا پتر شیری بەرهەم دئینیت، ژبەرکو گولکێ وێ ژی دێ وەکو وێ یێ ب بەرهەم بیت."

- "ئانکو تو چێلێن شیردەر ژ چێلێن دی باشتر دبینی. باشە ل ڤێرێ ژی پرسیارا دوماهیێ دێ ژ تە کەم: باشە ئەگەر تو نێچیرڤان بی و تە دوو سەیێن نێچیری هەین، لێ تو نەچاری سەیەکی ژ وان بەردەی، ئەرێ دێ کیژ سەی بۆ خوە هێلی؟"

- "ئەو سەیێ باشتر دشێت نێچیران بکەت."

- "هەلبەت. ئانکو ب ڤی ڕەنگی ژی تو دێ سەیێ باشتر هەلبژێری. ئاها ب ڤی ڕەنگی، بۆ هەیاما پتر ژ دەهـ هزار سالان مرۆڤان گیانەوەرێن کەهی ب خوەدان کرینە. ل دەستپێکێ وەکو نوکە مریشکان حەفتیێ پێنج هێك نەدکرن و پەزی هریەکا باش بەرهەم نەدئینا و هەسپ هۆسا ب هێز و بلەز نەبوون، ژبەر هندێ مرۆڤان جۆرەکێ هەلبژارتنا

سروشتی بکارئینا. ئەڤ گوتنە ل سەر جیهانا ڕووەکان ژی دهێتە بجهـ ئینان. بۆ نموونە، ئەم پتاتێن نەباش ناچینین ئەگەر مە پتاتێن باش و ب توڤ هەبن. هەردیسان ئەم وەختێ خوە ب چاندنا وی گەنمی ڤە نابورینین یێ چ توڤ پێڤە نەهێت. داروینی دیارکر کو چ چێل و گولیێن گەنمی و سە و چووچکێن وەکهەڤ نینن. سروشت گرنگیەکا مەزن ب هەمەجۆریا زیندەوەران دەت، هەتا دناڤ ڕەگەزەکێ تایبەت ژی دا، گەلەك جۆر هەنە. بۆ نموونە ڕەگەزێ سێڤان گەلەك جۆرێن سێڤان هەنە، هەردیسان د ژیانێ دا دوو زیندەوەرێن تەمام وەکهەڤ نینن. ئەز دبێژم تە ب خوە ئەڤ چەندە یا جەڕباندی ئەو ژی دەمێ تە شەربەتا شین ڤەخواری."

- "ئەز ژی وەدبێژم."

- "ل ڤێرێ داروین یێ نەچار بوو پرسیارێ ژ خوە بکەت: ئەرێ چەوا میکانیزمەکا هۆسا ل سەر سروشتی دهێتە پڕاکتیزەکرن؟ ئەرێ سروشت ب خوە "هەلبژارتنا سروشتی" بۆ زیندەوەران ئەنجام ددەت؟ ئەرێ ئەڤ هەلبژارتنە دشێت ببیتە ئەگەرێ ئافراندنا جۆرێن نوو یێن ڕووەك و گیانەوەران؟"

- "ئەز دبێژم بەرسڤ بەلێ یە."

- "بەلێ پا هەتا وی دەمی ژی، داروینی نەدزانی کا چەوا ئەڤ هەلبژارتنا سروشتی ڕوودەدت، بەلکو هەتا پشتی هینگێ ژ نیشکەکێ ڤە ل سالا 1838ێ، ئانکو دوو سالان پشتی ڤەگەڕیانا وی ژ گەشتا پاپۆرا بیگلی، پەڕتووکەکا تایبەتمەند د بوارێ ڤەکۆلینێن ئاکنجیبوونا مرۆڤان دا یا زانا "تۆماس مالتوس"ی ب ناڤێ "گوتارەك دەربارەی بنەمایێن ئاکنجیبوونێ" کەفتیە بەر دەستێن وی. تۆماسی ژی بیرۆکەیا نڤیسینا ڤێ پەڕتووکێ ژ زانا و سیاسەتمەدارێ ئەمریکی و داهێنەرێ ئامیرێ خوپاراستنێ ژ بریسیان، "بنجامین فرانکلین"ی وەرگرتبوو. فرانکلینی دیارکربوو ئەگەر چ فاکتەرێن دەستنیشانکەر د سروشتی دا نەبن، ڕەگەزەکێ تایبەت یێ گیانەوەران یان ڕووەکان دێ جیهانێ هەموویێ داگیر کەت، لێ ژبەرکو گەلەك ڕەگەزێن زیندەوەران ل سەر ڕوویێ ئەردی هەنە، پێدڤیە ئەو هەڤسەنگیا دناڤبەرا خوە دا بپارێزن."

- ئەز ژی هۆسا دبینم."

- "مالتوسی ئەو بیرۆکەیە پێشئێخست و ل سەر ئاکنجیێن سەر ڕوویێ ئەردی بجهـ ئینا. ئەو د وێ باوەرێ دا بوو کو شیانێن مرۆڤی بۆ زانێ گەلەك د مەزنن ب ڕەنگەکی هژمارا وان زارۆکێن ڕۆژانە ژ دایکدبن گەلەك پترە ژ وێ هژمارێ یێن دشێن خوە بپارێزن و بمینە ساخ. ژبەرکو بەرهەم ئینانا خوارنێ نەشێت پێدڤیێن هەموو مرۆڤان دابین بکەت و هەڤسەنگیا زێدەبوونا مرۆڤان بپارێزیت، هژمارەکا مەزن یا زارۆکان د شەڕێ مان و نەمانێ دا دمرن."

- "ئەرێ ئەڤ چەندە تشتەکێ بەرئاقلە؟"

- "بەلێ، ئاها ژ ڕاستا ئەڤە ئەو میکانیزما گەردوونی بوو یا داروین لێدگەریا ژ بۆ شرۆڤەکرنا چەوانیا کریارا وەراڕکرنا زیندەوەران. ژ ئەنجامێ ڕوودانا ڤێ هەلبژارتنا سروشتی د هەڤڕکیا مان و نەمانێ دا، ئەو زیندەوەرێن ب شێوەیەکێ باشتر خوە دگەل ژینگەها خوە گونجاندی، دێ ڕەگەزێ خوە پارێزن و یێن لاواز ژی دێ بەرەڤ نەمانێ چن. ئەڤە دووەم تیور بوو یا داروینی ل دور "بنیاتێ ڕەگەزان" نڤیسای. ئەو د پەڕتووکا خوە دبێژیت: "فیل یێ کو دهێتە هەژمارتن هێدیترین گیانەوەر بۆ زانێ. هەکە فیلەکی شەش تێشك هەبن و هەر تێشکەك بۆ سەد سالان بژیت، پشتی هەیامەکێ "دناڤبەرا 740 هەتا 750" سالان، نێزیکی نوزدە ملیون فیلان دێ ل سەر ڕوویێ ئەردی ژین ئەڤێن کو ژ باپیرێ خوە یێ یەکێ پەیدابووین."

- "ئەرێ پا ئەو چ بۆ وی جۆرێ ماسیان دبێژیت یێن هەر جارەکێ زانێ، ب هزاران هێکان دکەت؟"

- "داروین پتر دناڤ بابەتی دا چوو خوارێ و دگوت هەڤڕکیا دناڤبەرا ڕەگەزێن وەکهەڤ گەلەك ب زەحمەترە، ژبەرکو ل سەر وان یا پێدڤیە ل سەر یەك جۆرێ خوارنێ شەڕی بکەن. ژ لایەکێ دی ڤە، چەند ئەڤ هەڤڕکیە ب هێزتر بیت، وەراڕکرنا ڕەگەزێن نوو ژی دێ بلەز ڕوودەت، ئانکو ب تنێ ئەوێن ب باشترین شێوە خوە دگەل ژینگەهێ گونجاندی دێ مینە ساخ و یێن لاواز ژی دێ مرن."

- "ئانکو چەند خوارن کێمتر لێ بهێت و کریارا هێکدانانێ زێدەتر لێ بهێت، کریارا وەراڕکرنێ ژی دێ بلەزتر ڕوودەت؟"

- "بەلێ، لێ ڤێ مژارێ پەیوەندی ب خوارنێ ب تنێ ڤە نینە، ژبەرکو نابیت ئەم ڕۆلێ کریارا نێچیکرنێ ژی ژ بیربکەین، ئانکو کا هەتا چ ڕادە ئەڤ زیندەوەرە دێ خوە پارێزیت داکو نەبیتە نێچیرا گیانەوەرەکێ دی. ل ڤێرێ ژی هندەك ساخلەت هەنە هاریکاریا زیندەوەران دکەن خوە ژ ڤان مەترسیان بپارێزن: بۆ نموونە، شیانێن گوهۆڕینا ڕەنگی ل دووڤ ڕەنگێ وێ ژینگەها تێدا دژیت، شیانێن کەشەفریتیێ* ب شێوەیەکێ بلەز، شیانێن ژێکجوداکرنا گیانەوەرێن دوژمن و یێن هەڤال، یان ژی د دژوارترین کاودان دا شیانێن بەرهەم ئینانا ژەهرەکا تەعل و دژوار هەبیت کو بشێت پێ گیانەوەرێ نێچیرڤان بکوژیت. ژبەر هندێ، پتریا جۆرێن ڕووەکێ کاکتوس د ژەهراوینە. ژ لایێ پراکتیکی ڤە، چ تشتێن دی ژ بلی ڤی ڕووەکی نەشێن ل بیابانێ شین ببن، ژبەر هندێ ئەڤ ڕووەکە یێ لاوازە ل هەمبەر گیانەوەرێن گوشتخور و پێدڤیە ڕێکەك هەبیت پێ بەرەڤانییێ ژ خوە بکەت."

- "پتریا جۆرێن کاکتوسی ستری ژی هەنە."

- "یا ئاشکەرایە شیانێن زانێ گرنگیەکا تایبەت و سەرەکی هەیە. داروینی ب هووری ڤەکۆلین ل سەر کریارا پیتاندنا ڕووەکان دکر. ڕووەك ب ڕەنگێن جودا جودا گولان بەرهەم دئینن و بێهنێن خوش بەلاڤ دکەن داکو سەرنجا مێشوموران بۆ خوە براکێشن کو ڕۆلەکێ کارا هەیە د کریارا پیتاندنێ دا. هەر ژ بۆ پاراستنا جۆرێ خوە باڵندەیێن مێ ئاوازان دخوینن داکو سەرنجا باڵندەیێن نێر بۆ خوە براکێشن و کریارا زانێ ئەنجام بدەن. ئەو گایێ بێ خیرەت و ئارام یێ چ گرنگییێ ب چێلان نەدەت، چ گرنگییێ نادەتە دیرۆکان جۆرێن ڕەگەزێ خوە ژی، ژبەرکو ڕەگەزێ وی ژبەر ڤێ ساخلەتا گرنگینەدانێ دێ ژناڤ چیت، ژبەر هندێ ئارمانجا سەرەکی یا گایان د ژیانێ ئەوە هەتا ژیێ گەشەکرنا ئەندامێن زانێ بمینتە ساخ داکو ڕەگەزێ خوە ژناڤچوونێ بپارێزیت.

ئەڤ چەندە وەکو بەریکانا غاردانا ب کومەلە "غاردانا بەریدێ". ئەو زیندەوەرێن ژبەر هەر ئەگەرەکێ هەبیت نەشێت بوهێلێن "جین" خوە بۆ بەرەبابکێن ل دووڤ خوە دا بڤەگوهێزیت، هەر زوو دێ ژناڤچیت. ب ڤی ڕەنگی ژی بەردەوام جۆرەك دێ پێشکەڤیت و

* کەشەفریت Mutation ب عەرەبی ژی دبێژنێ "الطفرة".

یێن دی ژناڤچن. بەرخوەدان و خو ل بەرگرتنا نەخوشیان یەکە ژ گرنگترین وان ساخلەتێن زیندەوەر ل دەڤ خوە پەیدادکەن و بۆ بەرەبابکێن ل دووڤ خوە دا دڤەگوهێزن."

- "ئانکو هەموو تشت بەردەوام خوە باشتر و چاکتر لێ دکەن؟"

- "بەلێ، ژ ئەنجامێ ڤێ هەلبژارتنا سروشتی یا بەردەوام، ئەو زیندەوەرێن خوە دگەل ژینگەهەکا تایبەت کو یا گونجای بۆ ژیانا وان دگونجینن، دێ شێن بۆ ماوەیەکێ درێژ رەگەزێ خوە پارێزین. لێ دەمێ ساخلەتەك بۆ ژینگەهەکێ یا باش بیت، رامانا وێ ئەو نینە هەمان ساخلەت دێ بکێر ژینگەهەکا دی ژی هێت، بۆ نموونە دبیت شیانێن فرینێ بۆ هندەك باڵندەیێن گزیرتا جالاباگوس یا گرنگ بیت، لێ ئەڤ فرینە بۆ وان باڵندەیان نەهند یا گرنگ بوو یێن خوارنا خوە ژ ئەردی رادکری و چ گیانەوەرێن درندە ژی ل دورماندورێن وان نە دژیان. هەلبەت ئەگەرێ وەراڕکرنا هژمارەکا مەزن یا جۆرێن زیندەوەران ب درێژاهیا دیرۆکێ بۆ هندێ دزڤریت کو ل سەر رووییێ ئەردی ژینگەهێن جودا جودا و گونجای بۆ گشت زیندەوەران هەنە."

- "سەرەرای ڤێ وەراڕکرنێ، لێ پا جۆرەکێ مرۆڤان ب تنێ هەیە."

- "ژبەرکو مرۆڤ بونەوەرێ یەکانەیە یێ شیانێن خوە گونجاندنێ دگەل ژینگەهێن جودا جودا هەین. یەك ژ وان تشتێن داروین حێبەتی کری، شیانێن هندوکێن سۆر یێن دەڤەرا تییرا دیل فیوگو "وەلاتێ ئاگری" بوون کا چەوا دشیان دناڤ هندەك کاودانێن سەقای یێن دژوار دا بژین، لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت هەموو مرۆڤ د وەکهەڤن و هەمان شیان هەنە. بۆ نموونە، ئەو کەسێن ل وەلاتێن ناڤەراستا تەپا ئەردی و نێزیکی هێلا کەمەریی دژین، پیستەکێ ستوور و تاریتر هەیە ژ وان کەسێن ل دەڤەرێن نێزیکی باکورێ تەپا ئەردی دژین، ژبەرکو ئەڤ پیستێ ستوور و تاری وان ژ تیشکا رۆژێ یا دژوار دپارێزیت، ژبەر هندێ ئەگەر کەسەکێ پیستێ وی تەنك و سپی بۆ ماوەیەکێ درێژ خوە بدەتە بەر تیشکا رۆژێ یا دژوار، رەنگە تووشی نەخوشیا پەنجەشێرا پیستی ببیت."

- "ئانکو ساخلەتەکا باشە بۆ وان کەسێن ل وەلاتێن نێزیکی باکوری تەپا ئەردی دژین پیستەکێ سپی هەبیت؟

- "بەلێ، هەکە هۆسا نەبا دا هەموو خەلکێ سەر رووییێ ئەردی پیستەکێ تاری هەبیت. لێ پیستێ سپی ب شێوەیەکێ ب سانەهیتر دشێت ڤیتامین D بۆ خوە دروست دکەت

ل دەمەکی مرۆڤێن پیستێ وان تارى ب شێوەیەکێ سروشتی ئەڤی ڤیتامینی ژ تیشکا ڕۆژێ دا وەردگرن. ل سەردەمێ ئەڤرۆکە، ئەڤ چەندە نە یا گرنگە ژبەرکو ئەم دشێین وان خوارنان بخوین یێن زەنگین ب ڤیتامینان. لێ ژبیرنەکە کو چ تشت هەما ژ دەڤ خوە دناڤ سروشتی دا پەیدانابن، هەر گوهورینەك ژ ئەنجامێ هندەك گوهۆڕینێن گەلەك بچووك و هوور پەیدادبیت یێن کو کارتێکرنێ دکەنە سەر بەرەبابکێن ل دووڤ خوە دا.

- "ب ڕاستی ژی تشتەکێ بالکێشە."

- "ژ ڕاستا، باشە نوکە ئەم دشێین تیورا داروینی ل دور وەراڕکرنێ ب ڕستەیەکێ تەمام بکەین."

- "فەرموو."

- "ئەم دشێین بێژین "ماددەیێ خاڤ" بۆ کریارا وەراڕکرنا زیندەوەران ل سەر ڕوویێ ئەردی، هەمەجۆریا بەردەوام یا دناڤبەرا تاکێن هەمان ڕەگەز ب خوە دایە، زێدەباری بەرهەم ئینانا زڕیەتەکا مەزن کو ب تنێ هژمارەکا کێم ژێ دشێن بمینە ساخ، هەلبەت هەلبژارتنا سروشتی ل ڤێرێ ڕۆلێ خوە دبینیت کا کی بمینتە ساخ و کی ژناڤ بچیت، ژبەرکو هێزا پاڵدەر یا ل پشت ڤێ کریارا وەراڕکرن و گەشەکرنێ، بڕیارێ ددەت یێ بهێزتر و باشتر بمینتە ساخ."

- "ئەڤ تیورە ژی وەکو مژارەکا بیرکاریێ تشتەکێ لوژیکی یە و دکەڤیتە ئاقلێ مرۆڤی، ئەرێ چەوا خەلکی پێشوازی ل پەڕتووکا "بنیاتێ ڕەگەزان" کر؟"

- "پەڕتووکا وی بۆ ئەگەرێ گەنگەشەیێن مەزن و توند، دێرێ ژی ب دژواری نەڕازیوونا خوە دیارکر. جیهانا زانستی ژی ل سەر دوو بەشان هاتە دابەشکرن، بەشەکی باوەری ب تیورا داروینی ئینا و بەشەکێ دی ژی دژی وی ڕاوەستیان. د ڕاستی دا ئەڤ دژایەتیە ژی تشتەکێ سەیر نەبوو، ژبەرکو داروینی ب شێوەیەکێ مەزن و هەستپێکەر خودا ژ کریارا ئافراندنا زیندەوەران دوور ئێخست. هندەکێن دی ژی دگوت ئافراندنا زیندەوەرەکی کو ئەو ب خوە بشێت خوە وەراڕ بکەت، گەلەك مەزنترە ژ هندێ کو بونەوەرەکێ جێگیر ب ئافرینی."

ژ نیشکەکێ ڤە سۆفیایێ خوە ژ سەر کورسیکێ هاڤێت و ب دەنگەکێ بلند کرە قێژی: "سەحکێ وێراهە، ژ دەرڤە."

سۆفیایێ ئاماژە کرە پەنجەرکێ. ل سەر دەریاچەیا ل هەمبەری وان، ژن و مێرەکان دەستێن هەڤدوو گرتبوون و د ڕیس و چیلاق بوون؟"

ئەلبێرتۆی گوت: "ئەو ئادەم و حەوانە. ئەو ژی ل دوماهیێ نەچاربوون چیرۆکا خوە هێدی هێدی بکەنە دگەل چیرۆکا "خوەدانا سەکوییێ سۆر" و "ئەلیس ل وەلاتێ سەیروسەمەران"، ژبەر هندێ ئەو یێن هاتینە ڤێرێ."

سۆفیا چوو بەر پەنجەرکێ داکو تەماشەی وان وان بکەت، لێ هەر زوو وان خوە دناڤ داروباری دا ڤەشارت.

- "باشە نوکە داروینی گوتیە ڕەگەزێ مرۆڤان ژ گیانەوەران پەیدابوویە؟"

- "ل سالا 1871، داروینی پەڕتووکا "بنیاتێ مرۆڤی" بەلاڤکر کو پەڕتووکە بەحسێ زانستێ جینان دکەت و تێدا ڕوناهی ئێخستبوو سەر هژمارەکا مەزن یا وەکهەڤیێن دناڤبەرا مرۆڤ و گیانەوەران دا. هەردیسان داروینی ئەو تیور پێشئێخست یا دگوتی ل سەردەمەکێ بەری نوکە، مرۆڤ و مەیمینکێن وەکو مرۆڤان هەردوو ژ باپیرکەکێ کەڤن و دەتپێکی پەیدابووینە. ل وی دەمی بۆ یەکەمجار ڤەرقودێ بەردبوویی یێ مرۆڤەکێ ژناڤچووی ل چیایێ "تارق" ل ئیسپانیا هاتە دیتن و پشتی هینگێ ب چەند سالان هندەك ڤەرقودێن دی یێن هەمان شێوە ل دەڤەرا "نیاندەرتال" ل ئەڵمانیا هاتنە دیتن. هەژی ئاماژەپێکرنێ یە ئەو نەڕازیبوونێن ل سالا 1871ێ دژی تیورا داروینی هاتینە کرن گەلەك کێمتربوون ژ یێن سالا 1859ێ، ئانکو ل وێ سالا داروینی پەڕتووکا بنیاتێ ڕەگەزان بەلاڤکری، ژبەرکو هەر د وێ پەڕتووکێ ژی دا وی بەحسێ وەراڕکرنا مرۆڤی ژ نفشەکێ گیانەوەران کر بوو."

- "هەروەکو من ل دەستپێکێ ژی گوتیە تە، دەمێ داروین ل سالا 1882ێ مری، ب ڕێوڕەسمەکێ مەزن و ژ هەژی و وەك یەك ژ ڕێبەرێن زانستی هاتە ڤەشارتن."

- "ئانکو ل دوماهیێ شیا ڕێزگرتنا خەلکی بدەست خوە ڤە بینیت."

- "ڕاستە، لێ هێدی هێدی، ژبەرکو بەری هینگێ وەکو مەترسیدارترین زەلام ل ئینگلترا دهاتە هەژمارتن."

- "ئانکو هۆسا!"

- "هیڤیا مە ئەوە ئەڤ چەندا داروینی گوتی هۆسا نەبیت، ئەگەر هۆسا ژی بیت هیڤیا مە ئەوە خەلك هەموو پێنەحەسن و نەزانن"، ب ڤی ڕەنگی ژنەکا دەولەمەند و ژ تەخێن بلند بەحسێ تیورا وی دکر. هەردیسان زانایەکێ دی یێ ناڤدار ژی بیرۆکەیەکا نێزیکی وێ نڤیسابوو: "ئاشکەراکرنەکا جهێ شەرمزارییێ یە، لەوڕا هندی کێمتر ل سەر باخڤین باشترە."

- "تو بێژی ئەڤ تیورا وی بەلگەیە بیت ل سەر لێکنێزیکبوونا مرۆڤی و نەعامێ؟"

- "خالەکا باشە، ژبەرکو بۆ مە یا ب سانەهیە ئەم نوکە وەبێژین. لێ ل وی دەمی، خەلکێ پێگیر ب بیروباوەرێن ئاینی نەچاربوون پێداچوونەکێ د "سەفەرا ئافراندنێ" یا پەڕتووکا پیرۆز دا بکەن. نڤیسەرەکێ گەنج ژی ب ناڤێ "جون ڕوسکن" گوت: "ئەگەر زانایێن جیولوجی دەلیڤێ بدەنە من، پشتی هەر ئایەتەکا پەڕتووکا پیرۆز، دێ گوهێ خوە دەمە دەنگێ چەکوچێن وان ژی."

- "مەرەما وی دەنگێ چەکوچێن ڤان زانایان، گومان بوو ل سەر پەیڤێن خودای؟"

- "ئەڤ چەندە ب تنێ مگرتیە، چونکی ب تنێ ئایەتێن تەوراتێ نەبوون یێن .....

- ناڤەرۆکا تیورا داروینی دگوت، هەمەجۆری و جوداهیێن هەرەمەکی ل دوماهیێ بووینە ئەگەرێ وەراڕکرنا مرۆڤی، یا ژ ڤێ سەیرتر ژی، داروینی بنیاتێ پەیدابوونا مرۆڤی بۆ تشتەکێ وژدانی یان عاتیفی د ڤەگەڕاند."

- "ئەرێ بۆچوونا داروینی ل چەوانیا پەیدابوونا ڤان جوداهیان چ بوو؟"

- "تە دەستێ خوە دانا سەر لاوازترین خالا تیورا وی. ڤەشارتیترین و نەدیارترین بیرۆکەیا داروینی، بیرۆکەیا وی ل دور بابەتێ بۆماوەزانییێ بوو. دەمێ دوو زیندەوەرێن نێر و مێ کریارا زانێ ئەنجام ددەن، ب چ ڕەنگان ئەو دوو زارۆکێن وەکهەڤ بەرهەم نائینن، خو هەکە ئەڤ هەردوو زارۆکە جێمك ژی و گەلەك سیماییێن وان د وەکهەڤ ژی بن لێ هەر هندەك جوداهی دناڤبەرا وان دا دێ هەبن. لێ ژلایەکێ دی ڤە، تشتەکێ دەگمەنە زیندەوەرەك ژ ڕەگەزەکێ دی پەیدابیت، ئانکو ب چ ڕەنگان چێنابیت دەمێ دوو مەیمینکێن نێر و مێ کریارا زانێ ئەنجام بدەن، مریشکەکێ یان هەر گیانەوەرەکێ دی بەرهەم بینن، بەلکو تێشکێن وان ژی دێ هەر مەیمینك بن و ب تنێ هندەك جوداهیێن بچوك دناڤبەرا تێشکێن وان دا هەنە. هەرچەندە هندەك ڕووەك یان زیندەوەرێن تاکخانە،

ب ڕێکا دەستکرد وەك قەلەمکرن و گوپکرنێ، یان ژی دووکەربوونا ئاسایی زێدە دبن، سەبارەت چەوانیا پەیدابوونا جوداهیان ل دەڤ ڤان زیندەوەرێن نوو پەیدابووی، تیورا داروینی یا ناڤێ "دارووینیا نوو" پشتەڤانیا ڤێ چەندێ دکەت."

- "ئەڤ تیورە چ دبێژیت؟"

- "ژیانا هەموو زیندەوەران و زێدبوونا وان، د بنەڕەت دا کریارا دابەشبوونا خانەنێن لەشێ وانە. دەمێ خانەیەکا لەشی یا ئاسایی دابەش دبیت، دوو خانەیێن وەکهەڤ ژ لایێ پێکهاتنا بۆماوەیی ڤە بەرهەم دئینیت، د ڤی جۆرێ دابەشبوونێ دا، ئەم دبێژین خانێ یا خوە کوپیکری، ئانکو کوپیەکا وەکو خوە یا بەرهەم ئینای*."

- "ێ و پاشی؟"

- "لێ هندەك جاران ل دەمێ کریارا دابەشبوونا خانێ و کوپیکرنا کەرەستەیێ بۆماوەی DNA، هندەك شاشی یێن بچووك پەیدادبن، ژبەر هندێ ئەو خانەیێن نوو پەیدادبن ژ لایێ بۆماوەیی ڤە پیچەکێ ژ خانەیا سەرەکی د جودانە. د زانستێ بایولوژی دا دبێژنە ڤێ گوهۆڕینێ، کەشەفریت. هندەك ژ ڤان کەشەفریتان دبیت هند د سادە و بچووك بن، چ کارتێکرنێ ل زیندەوەرێ نوو پەیدابووی ناکەن، لێ گەلەك جاران ژی ئەڤ کەشەفریتە د مەزن و ئالۆزن و دبنە ئەگەرێ پەیدابوونا هندەك ڕەفتار و ساخلەتێن نوو ل دەڤ زیندەوەرێ نوو پەیدابووی. پتریا جاران ئەڤ ساخلەتێن نوو د زیانبەخش یان کوژەکن و نەخوشیێن بۆماوەیی پەیدادکەن. هندەك جاران ئەڤ کەشەفریتە ساخلەتەکا ئەرێنی و باش ل دەڤ وی زیندەوەری پەیدادکەت کو هاریکاریا وی دکەت ب شێوەیەکێ باشتر د هەڤڕکیا مان و نەمانێ دا خوە بپارێزیت.

- "بۆ نموونە وەکو ساخلەتا ستۆیێ درێژ ل دەڤ زەڕافەی؟"

---

* رۆهنکرنەکا فەر:

دناڤ لەشێ مە دا دوو جۆرێن خانەیان هەنە: خانەیێن لەشی Body cellو خانەیێن سیکسی Germ cell. هەموو ئەندامێن لەشێ مە ژ خانەیێن جۆرێ یەکێ پێکدهێن، لێ ب تنێ توڤێ زەلامی و هێکێن ژنکێ ژ خانەیێن سیکسی پێکدهێن. گشت خانەیێن لەشی ب ڕێکا دابەشبوونا ئاسایی زێدەدبن و ئەو خانەیێن نوو پەیدابووی 100٪ ژلایێ بۆماوەیی ڤە وەکو خانەیا دەستپێکێ یە ئەوا ژێ دابەشبووی، لێ خانەیێن سیکسی ب ڕێکا کێمەدابەشبوونێ زێدەدبن و ژلایێ بۆماوەیی ڤە نە وەکو خانەیا دەستپێکێ یە، ژبەرهندێ چ زارۆك وەکو دایکوبابێن خوە نینن.

- "شرۆڤەكرنا لاماركی بۆ ستودرێژیا زەرافەی ئەو بوو داكو ئەڤ زەرافە بشێت خوە بگەهینتە بەلگێن دارا یێن درێژ. لێ ل دووڤ تیورا داروینی یا نوو، نابیت ئەڤ ساخلەتە ب شێوەیەكێ بۆماوەیی بهێتە ڤەگوهاستن. داروینی دگوت ئەگەرێ ستودرێژیا زەرافەی بۆ كریارا هەمەجۆریا سروشتی دزڤریت، تیورا داروینیا یا نوو ژی پشتەڤانیا ڤێ ئاخفتنا داروینی دكر.

- "ئانكو ئەگەرێ ستودرێژیا زەرافەی بۆ پەیدابوونا كەشەفریتەكێ دزڤریت؟"

- "بەلێ، پەیدابوونا گوهۆڕینەكێ د كەرەستەیێ بۆماوەیی یێ زەرافەكی دا بوویە ئەگەر زەرافەیێن تێشكێن وی ستۆیەكێ درێژ هەبیت، ڕەنگە ل وی دەمی خوارن ژی یا كێم بیت، لەوڕا ڤێ ساخلەتا نوو مفایەكێ مەزن گەهاندیە زەرافەیان. ئەو زەرافەیێن دشیان خوە بگەهینە لقێن بلند یێن داران، دشیان خوارنێ بۆ خوە پەیدابكەن و ژ مەترسیا ژناڤچوونێ قورتال ببن. ئەم دشێین بینە پێشچاڤێن خوە كا چەوا زەرافەیێن دەستپێكێ یێن مل كورت خوارنا خوە ل سەر ئەردێن نزم پەیدادكر، لێ پشتی بورینا ماوەیەكێ درێژ و كێمبوونا خوارنێ ل جهێن نزم، ئەڤ زەرافە ژ برسان دا مرینە و ڕەگەزێ وان ب یەكجاری ژناڤچوویە. ئەم دشێین نموونەیەكا سەردەم ل دور چەوانیا هەلبژارتنا سروشتی بەحس بكەین."

- "بەلێ، فەرمووو."

- "ل وەلاتێ بریتانیا، جۆرەكێ تایبەت یێ پەلاتینكان هەیە دبێژنێ "پەلاتینكێن خاڵدار" كو ل سەر چەقێن دار سپینداران یێن زیڤی دژین. ل چەرخێ هەژدێ زاینی، پتریا ڤان پەلاتینیكێن خاڵدار ڕەنگەكێ گەور هەبوو، تو دزانی بۆچی، سوفیا؟"

- "داكو چووچكێن برسی ب سانەهی وان نەبینن."

- "لێ پشتی بورینا دەمەكی و ژ نیشكەكێ ڤە كەشەفریتەك ل دەڤ پەیدابوو و بۆ ئەگەر پەلاتینكێن نوو ڕەنگەكێ تاریتر هەبیت. تو بێژی هینگێ ڕەوشا وان یا چەوا بیت؟"

- "دیتنا وان ب چووچكان یا ب سانەهی بوو، ژبەر هندێ وان دەست ب نێچیركرنا وان كر."

- "بەلێ. دناڤ وێ ژینگەهێ دا، ئانكو ل سەر چەقێن داران یێن ڕەنگ زیڤی، ڕەنگێ وان یێ تاری ب باشی خویا دكر و هەلبەت ئەڤ چەندە ژی ساخلەتەكا باش نەبوو. ب ڤی

ڕەنگی، پەلاتینکێن ڕەنگ تاڕی هێدی هێدی کێم بوون و یێن ڕەنگ ڤەبی زێدەتر لێهاتن. لێ پشتی هینگێ ژبەر پەیدابوونا هژمارەکا مەزن یا کارگەهـ و ترۆمبێلان، دوکێلا وان بوو ئەگەرێ پیسبوونا ژینگەهێ و تاڕیبوونا ڕەنگێ چەقێن دار سپینداران ژی. باشە تو بێژی د ڤی کاودانی دا چ ل پەلاتینکان هات بیت؟"

- "ل ڤی دەمی پەلاتینکێن ڕەنگ تاڕی پتر دشیان خوە بڤەشێرن و بپارێزن."

- "بەلێ. پشتی بورینەکا دەمەکێ کێم، ئێدی هژمارا پەلاتینکێن ڕەنگ تاڕی زێدە بوو. ژ سالا 1848 هەتا 1948ێ، ل هندەك جهێن دەستنیشانکری، ڕێژەیا زێدەبوونا وان ژ پەلاتینکەکێ بۆ 99٪ زێدەبوو، ژبەرکو ژینگەها وان هاتە گوهۆڕین و ئێدی ڕەنگێ ڤەبی نەما ساخلەتەکا باش. ژبەر هندێ باڵندەیان دەست ب نێچیرکرنا وان ژی کر. لێ دووبارە گوهۆڕینەکا مەزن د ژینگەهێ دا پەیدابوو، ئەو ژی کێم بکارئینانا ڕەژیێ بوو ل کارگەهان و ل شوونا وان هندەك ئامیرێن پێشکەفتی و سەردەم هاتنە بکارئینان، ژبەر هندێ ئێدی دووکێل ژ ڤان کارگەهان نەدەرکەفت و ژینگەهـ پاقژ بوو."

- "ئانکو جارەکا دی پەلاتینکێن ڕەنگ گەور ژی زێدەبوونە ڤە."

- "بەلێ، ئاها ب ڤی ڕەنگی جارەکا دی پەلاتینکێن ڕەنگێ خوە یێ گەور زڤڕاندە ڤە. دبێژنە ڤێ کریارێ خوە گونجاندن Adaptation، ئەڤ چەندە ژی یەکە ژ یاساییێن سروشتی یە."

- بەلێ ئەز تێگەهشتم."

- "بەلێ چەندین نموونەییێن دی هەنە کو مرۆڤی دەستکاری د سروشتی دا کربیت."

- "وەکو چ تشت؟"

- "ل دەستپێکێ، مرۆڤان پێکۆل کر مێشومورێن زیانبەخش ب ڕێکا کەرەستەیێن مێشومورکوژ ژناڤ ببەن. ڤێ چەندێ ژی ئەنجامێن باش تومارکرن. لێ ژبیرنەکە دەمێ تو بیستانەکی یان زەڤیەکێ ب کەرەستەیێن میشومورکوژ دڕەشینی، تو ل وی دەمی تو یێ کارەستەکا ژینگەهێ یا مەزن ئەنجام ددەی و دبیە ئەگەرێ ژناڤبرن و ڤڕکرنا مێشوموان، لێ ب هاریکاریا کەشەفریتان، هندەك مێشومور دێ شێن ساخلەتەکا نوو ل دەڤ خوە پەیداکەن و بەرگریا ڤان کەرەستەیان کەن، ژبەر هندێ ئێدی ژناڤبرنا ڤی جۆرێ نوو یێ کەشەفریتان دێ گەلەك یا ب زەحمەت بیت و مێشومورێن شیانێن بەرگریێ هەین دێ مینە ساخ."

- "ئەڤ چەندە جهێ مەترسییێ یە."

- "بەلێ، پێدڤیە دووبارە هزرێن خوە تێدا بکەین. ب هەمان رێك ئەم پێکۆلێ دکەین زیندەوەرێن مشەخۆر* و زیانبەخش یێن دناڤ لەشێ خوە دا ژناڤببەین، بۆ نموونە بەکتریایێ."

- "بەلێ، دێ حەبکێن پەنسلین یان جۆرێن دی یێن ئەنتیبایوتیکان "دژەزیندەگ" خوین."

- "بەلێ، پەنسلین ژی دێ کارەساتەکێ بۆ ڤان ئەهریمەنێن بچووك پەیداکەت، لێ ئەگەر بەردەوام حەبکێن پەنسیلین بخوین، جۆرەکێ نوو یێ بەکتریان دێ وەراركەت و بەرگرییێ دژی پەنسلینی ژ خوە کەت، ژبەرهندێ دێ نەچاربین جۆرەکێ دی یێ ئەنتیبایوتیکان بکارئینین داکو..."

- "...داکو وان هەموویان ژناڤ ببەت، دبیت ل سەر مە یا پێدڤی بیت جارەکا دی ئاگری د وان وەرکەین."

- "تو ژی هۆسا زێدەهییێ تێدا نەکە. لێ یا ئاشکەرایە زانستێ نوشداری یێ سەردەم ئاریشەیەکا مەترسیدار یا پەیداکری. ئاریشە ل ڤێرێ ئەو نینە کو جۆرەکێ بەکتریایێ یا زیانبەخش بووی و بەرگرییێ ژ خوە دکەت و ژناڤ ناچیت. ل سەردەمێ بەرێ، هژمارەکا مەزن یا زارۆکان ژبەر نەخوشییێن جۆراوجۆر گیانێن خوە ژدەستددان، ب تنێ هژمارەکا کێم دشیان خوە ل بەر نەخوشیان بگرن و ساخلەم بن، لێ نوشداریا سەردەم بابەتێ هەلبژارتنا سروشتی دا ڕەخەکی و ل بەرچاڤ نەوەرگرت و چەندین دەرمانێن نوو دروستکرن و ئەڤ نەخوشیە ژناڤبرن، لێ هێدی هێدی ئەڤ بەکتریایە دێ شیانێن خوە یێن بەرگرییێ زێدە کەن و ڕەنگە ل دوماهییێ بەرگریا لەشێ مرۆڤی دژی نەخوشیان گەلەك لاواز ببیت. ئەگەر ئەم گرنگییێ ب وی تشتی نەدەین یێ دبێژنێ "ساخلەمیا بۆماوەیی"، ڕەنگە نفشێ مرۆڤی بەرەڤ کێمبوونێ ڤە بچیت، چونکی شیانێن بۆماوەیی یێن مرۆڤی دژی نەخوشییێن گران دێ کێم و لاواز بن."

- "چ پێشبینیەکا تەمسارە."

---

* طفيلي Parasite

- "بەلێ پا فەیلەسۆفێ ڕاستەقینە ئەوە یێ دەستان ژ گوتنا تشتێ مەترسیدار بەرنەدەت ب تایبەت هەکە بزانیت ڕاستیەك بۆ هەیە. نوکە دا پێکۆلێ بکەین تشتەکێ دی ژی کورت بکەین."

- "باشە."

- "تو دشێی بێژی، ژیان وەکو یاریەکا بەخت جەرباندنێ یا مەزنە، ب تنێ ئەم ژمارەیێن سەرکەفتی تێدا دبینین."

- "بەختێ خودای، مەرەما تە چیە؟"

- "هەروەکو تو دبینی، ئەوێن د هەڤڕکیا مان و نەمانێ دا ب سەرنەکەفتین، نوکە یێن ژناڤچووین. ئەڤ چەندە پێدڤی ب ملیونان سالایە هەتاکو ژمارەیا سەرکەفتی دناڤ هەر جۆرەکی ژ جۆرێن جودا جودا یێن ڕووەك و گیانەوەرێن ل سەر ڕوویێ ئەردی دهێتە هەلبژارتن. ژمارەیێن نەسەرکەفتی ب تنێ جارەکێ دیاردبن. هەر جۆرەك ژ جۆرێن ڕووەك و گیانەوەران یێن ئەڤرۆکە ئەم دبینین، دەربڕینێ ژ ژمارەیێن سەرکەفتی د یاریا بەخت جەرباندنا ژیانێ دکەن."

- "ژبەرکو ب تنێ یێن باشتر دشێن بژین."

- "بەلێ، ڕێکەکا دی ژی هەیە بۆ گوتنا ڤێ چەندێ. نوکە ڕابە هەڕە وی وێنە بینە یێ بەری نوکە وی کەسی بۆ مە ئینای "خوەدانێ باخچێ گیانەوەران".

سۆفیایێ ئەو وێنە داڤێ. ل سەر ڕەخەکی وێنەیێ پاپۆرا نوحی هاتبوو کێشان و ل سەر ڕەخێ دی ژی دارا وەراركرنێ یان هەموو گیانەوەران ل سەر هاتبوو کێشان. ئەڤە ئەو ڕەخ بوو یێ ئەلبێرتۆی دڤیای نیشا سۆفیایێ بدەت.

- "نوحی دیسان وینەیەکێ هۆسا بۆ مە ئینایە کو دابەشکرنا گشت جۆرێن جودا یێن ڕووەك و گیانەوەران شرۆڤە دکەت. سەحکێ کا چەوا هەر هژمارەکا جۆرێن جۆراوجۆر سەر ب گروپێن جۆراوجۆر ڤەنە و پاشی لق و چەقێن جودا جودا ژێڤە دبن."

- "بەلێ."

- " مەیمینك و مرۆڤ پێکڤە سەر ب لقێ گیانەوەرێن سەرەکی ڤەیە. ئانکو گیانەوەرێن شیردەر یێن سەرەکی. ئەڤ گیانەوەرێن شیردەر هەموو ژی سەر ب چەقێ گیانەوەرێن بڕبڕدارن و هەموو بڕبڕدار ژی ژ کوما زیندەوەرێن فرەخانە نە."

- ڤێ چەندێ بیرا من ل ئەرستۆی ئینا."

- "بەلێ ئەڤ چەندە راستە. بەلێ پا ئەڤ وێنەیە ب تنێ بەحسێ زیندەوەرێن سەردەمێ ئەڤرۆکە ب تنێ ناکەت، بەلێ بەحسێ دەستپێکا وەرارکرنا زیندەوەران ژی دکەت. بۆ نموونە، ئەگەر باش بەرێ خوە بدەیێ دێ بینی د خالەکا دەستنیشانکری دا لقێ باڵندەیان ژ لقێ گیانەوەرێن خشوک هاتیە جوداکرن و بەری هینگێ لقێ ڤان گیانەوەرێن خشوک ژی ژ لقێ سەرەکی یێ گیانەوەرێن هشکئاڤی هاتیە جوداکرن و هشکئاڤی ژ ماسیان ڤەبووینە*."

- "بەلێ ئەڤ چەندە یا ئاشکەرایە".

- "ئەڤ چەندە یا رۆهن و ئاشکەرایە."

- هەر جارەکێ، چەقێ دارێ ل سەر دوو چەقێن بچووکتر دهێتە دابەشکرن، ژبەرکو کەشەفریت بووینە ئەگەر هندەك جۆرێن نوو پەیدابن. ژبەر هندێ ب درێژاهیا چەرخان چەندین هوز و لق و پولێن ناڤنجی یێن زیندەوەران پەیدابووینە. د راستی دا، ل سەردەمێ ئەڤرۆ پتر ژ ملیون جۆرێن گیانەوەران هەنە، ئەڤ ملیون ژمارە ژی بەشەکێ بچووکن ژ وێ هژمارا مەزن یا گیانەوەران یێن وەختەکی ل سەر روویێ ئەردی دژیاین بەری ژناڤبچن. بۆ نموونە، کومەلا گیانەورێن گەهکدار یێن سێ گەهـ هەین ب یەکجاری یێن ژناڤچووین."

- "ل بنێ دارێ ژی زیندەوەرێن تاکخانە هەنە."

- "هندەك ژ ڤان زیندەوەران ب بورینا ملیاران سالان ژی نەهاتیە گوهۆرین. هەروەکو تو دبینی، چەقەکێ ڤان زیندەوەرێن ب ملیاران سالان نەهاتیە گوهۆرین بەرەڤ جیهانا رووەکان ڤە دچیت، چونکی دبیت رووەك ژی ژ هەمان وان خانەیێن دەستپێکی پەیدابووینە یێن گیانەوەر ژێ پەیدابووین."

- "بەلێ ئەز یا دبینم، لێ تشتەکی ئەز حێبەتی کرم."

- "ئەو چ تشتە؟"

- "ئەرێ ئەڤ خانەیێن دەستپێکی ژ کیڤە هاتینە؟ ئەرێ داروینی بەرسڤا ڤێ پرسیارێ هەبوو؟"

---

*تو دشێی ب رێکا لێگەریانا ناڤێ دارا وەراکرنێ Tree of Evolution، وێنەیێن جودا جودا د مالپەرێ گوگلی دا ببینی

- "من گوتبوو ته ئەو زەلامەکێ گەلەك هشیار بوو، مانە هۆسایە. لێ دەربارەی ڤێ پرسیارێ، داروینی ئەو دەستوری دا خوە ب ڤی ڕەنگی گریمانەکێ بدانیت، گریمانا وی ب ڤی ڕەنگی بوو: ئەگەر هزرا خوە د برکەکا ئاڤێ یا بچووك دا بکەین کو ئامونیا و فسفور و خوێ و گەرماتی و ڕۆناهی و کارەبا تێدابیت، پاشی پێکهاتەیەکێ کیمیایی یێ پرۆتینی تێدا گەشە بکەت کو یێ ئامادە ببیت پتر گەشە بکەت و گوهۆڕینێن ئالۆزتر تێدا پەیدابن."

- "وێ گاڤێ دێ چ چێببیت؟"

- "داروین بەحسا هندێ دکەت کا چەوا دروستبوونا یەکەم خانەیا زیندی ژ کەرەستەیێن نەئەندامی دروستبوویە. ل ڤێرێ ژی بۆچوونا وی یا دروستە، چونکی زانستێ سەردەم ژی تا ڕادەیەکی گەهشتیە وی ئەنجامی کو یەکەم جۆرێ ژیانا دناڤ کاودانەکێ هۆسا پەیدابوویە یێ داروینی بەحس ژێ دکر."

- "ئەز یا مەندەهوشم، ئەرێ ژ ڕاستا کەسەك دزانیت ژیان چەوا پەیدابوویە؟"

- "دبیت نەخێر، لێ ڕۆژ بۆ ڕۆژێ پتر ئەو توخمێن ژیانێ پێکدهێن یێن دهێنە ئاشکەراکرن و بدەستڤە ئینان، ئەڤ چەندە ژی هاریکاریا مە دکەت تا ڕادەیەکی چەوانیا پەیدابوونا ژیانێ شرۆڤە بکەین."

- "باشە."

- "ل دەستپێکێ هۆسا دێ دانین کو هەموو ڕەنگێن ژیانێ، ژیانا گیانەوەر و ڕووەکان، ژ هەمان کەرەستە پێکدهێن. ل ڤێرێ ئەم دشێین باشترین پێناسە بدەینە ژیانێ. ئەو ژی ئەگەر ماددەیەکی بدانینە دناڤ شلەمەنیەکێ زەنگین ب کەرەستەیێن خوراکی، ئەڤ ماددەیە دێ شێت دەست ب دابەشبوونێ کەت و چەندین کوپیێن هەڤشێوە بەرهەم ئینیت. ئەڤ کریارە ژی پشت بەستنێ دکەتە کەرەستەیێ بۆماوەیێ دناڤ خانەیێن لەشێ مرۆڤی دا یێ دبێژنێ DNAێ دناڤ کروموسومان دا. بۆ دەستپێکا پەیدابوونا هەر شێوەیەکێ ژیانێ، ئەم زاراڤێ DNA بکاردئینین، ژبەرکو گەردەکا گەلەك ئالۆز و مەزنە. پرسیار ل ڤێرێ ئەوە، ئەرێ کەنگی یەکەم گەردا DNA پەیدابوویە؟"

- "بەلێ."

- "دگەل پەیدابوونا کوما ڕۆژێ بەری 4.6 ملیار سالان، تەپا ئەردی ژی پەیدابوویە کو ل وی دەمی وەکو تەپەیەکا ئاگری بوو و هێدی هێدی تەزی بوویە. زانستێ سەردەم

گەهشتیە وێ باوەرێ کو یەکەم ڕەنگێ ژیانێ ل سەر ڕوویێ ئەردی بەری سێ یان چوار ملیار سالان پەیدابوویە."

- "دبیت ئەڤە پێشبینیەکا دوور بیت."

- "بەری تشتێ مایی بزانی بلەز بڕیارێ نەدە، ژبەرکو ئەو ئەردێ نوکە ئەم ل سەر دژین هینگێ یێ هۆسا نەبوو. ژبەرکو هینگێ ژیان ل سەر ئەردی نەبوو، گازا ئوکسجین ژی ناڤ بای دا نەبوو. بۆ یەکەم جار ئوکسجینی ئازاد ب ڕێکا کریارا دروستکرنا خوارنێ ل دەڤ ڕووەکان یا دبێژنێ "پێکهاتنا ڕۆناهیێ Photosynthesis پەیدابوو. د ڕاستی دا، ل ڤێرێ هەبوونا ئوکسجینی نە تشتەکێ گرنگ بوو، چونکی نە یا بەرئاڤلە خانەیەکا زیندی کو شیانێن دروستکرنا گەردێن DNA هەبیت، بشێت دناڤ سەقایەکی پڕی ئوکسجین دا بژیت."

- "بۆچی؟"

- "ژبەرکو گازا ئوکسجین گەلەك زوو کارلێکێ دگەل توخمێن دی یێن کیمیایی دکەت، ژبەرکو ئەگەر ئوکسجین هەبیت، بەری ئەڤ DNA یە ب دروستاهی بهێتە چێکرن، دێ کارلێکێ دگەل ئوکسجینی کەت و هێتە ئوکساندن."

- "ژ ڕاستا!"

- "ب ڤی ڕەنگی بۆ مە دووپات دبیت کو ل سەردەمێ ئەڤرۆکە چ جۆرێن دی یێن ژیانێ پەیدانابن، هەتا چ بەکتریا و ڤایروس ژی پەیدانابن. ژبەر هندێ ئەم دشێین بێژین هەموو جۆرێن ژیانێ ل سەر ڕوویێ ئەردی، ژیێ وان هندی یەکە یان نێزیکی هەڤدوویە. بۆ نموونە، ئەم دشێین بێژین مرۆڤەك یان فیلەك ژ هژمارەکا مەزن یا خانەیێن سەریەك خڕڤەبووی یێن زیندەوەرەکێ تاکخانەیی یێ دەستپێکێ پەیدابووینە، ژبەرکو هەموو خانەیێن د لەشێ مە دا، هەمان پێکهاتەیا بۆماوەیی هەیە، ئانکو نەخشەیێ تەمام یێ هەر مرۆڤەکی، دناڤ هەر یەك ژ خانەیێن لەشێ وی دا هاتیە هەلگرتن."

- "ڕاستی بیرۆکەیەکا سەیرە."

- "یەك ژ حێبەتیێن ژیانێ یێن مەزن ئەوە کو خانەیێن زیندەوەرێن مەزن و فرەخانە دشێن ب شێوەیەکێ سەربەرخو کارێ خوە ئەنجام بدەن سەرەڕای کو ساخلەتێن بۆماوەیی یێن جودا جودا یێن نەکارا و چالاك دناڤ هەموو خانەیان دا هەنە، هندەك ژ ڤان ساخلەتان یان جینان دهێنە چالاککرن و هندەکێن دی بێدەنگ دبن. بۆ نموونە، خانەیێن

دەمار و مێلاك و پیستێ لەشی هەمان پێکهاتەیا بۆماوەیی یێ DNA د ناڤخو دا هەلگرتیە، لێ خانەیێن مێلاکێ وی پرۆتینی بەرهەم نائینن یێن خانەیێن دەماران یان خانەیێن پیستی بەرهەم دئنینیت.

ژبەرکو ل دەستپێکێ گازا ئوکسجین دناڤ بای دا نەبوو، تەخا ئوزونێ ژی دورماندوری تەپا ئەردی نەنخافتبوو. ئەڤ چەندە ژی هندێ دگەهینیت کو چ تشت نەبوون ببنە رێگر ل هەمبەر هاتنا تیشکێن گەردوونی یێن زیانبەخش بۆ سەر ئەردی. هەلبەت ئەڤ چەندە ژی خاڵەکا گرنگە، چونکی دبیت ڤان تیشکان رۆلەکێ کاریگەر د دروستبوونا گەردێن DNA یێن ئالۆز دا هەبیت. دناڤ ڤان تیشکێن گەردوونی دا، تێهنەکا مەزن هەیە کو رەنگە ببیتە ئەگەر کەرەستەیێن کیمیایی یێن جودا جودا ل سەر ئەردی هەڤدوو گرتبیت و گەردێن مەزن و ئالۆز پێك ئینابن.

دەستووریێ بدەمە من ئەو تشتێ من بۆ تە گوتی کورت بکەم: بەری ئەڤ گەردێن مەزن ل سەر روویێ ئەردی پەیدابن، پێدڤیە ب کێمی دوو مەرجێن سەرەکی هەبن، ئەو ژی نەبوونا گازا ئوکسجینی دناڤ بای دا و هەبوونا رێکەکێ کو تیشکێن گەردوونی پێ بهێنە سەر ئەردی."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "دناڤ ڤێ برکا بچووك یا گەرم دا، یان هەروەکو زانایێن سەردەم دبێژنێ "ئاڤکا دەستپێکی"، گەردێن گەلەك مەزن و ئالۆز پەیدادبن و شیانێن سەیر هەنە بۆ دابەشبوونێ و پێکئینانا دوو گەردێن وەکهەڤ، ب ڤی رەنگی کریارا وەرارکرنێ یا درێژ دەستپێدکەت، سۆڤیا. ئەگەر ب شێوەیەکێ سادە بێژین، ئەم دشێین بێژین نوکە ئەم یێ بەحسێ یەکەم کەرەستەیێ بۆماوەیی و یەکەم DNA و یەکەم خانەیا زیندی دکەین. پشتی بورینا هەیامەکا درێژ، یەك ژ ڤان زیندەوەرێن تاکخانە، هەڤگرتن دگەل زیندەوەرەکێ دی یێ تاکخانە کریە و زیندەوەرەکێ فرەخانەیی یێ ئالۆزتر پێکئینایە، پشتی کریارا پێکهاتنا ب رۆناهیێ ل دەڤ رووەکان دەستپێکریە و ب ڤی رەنگی گازا ئوکسجین ژی دناڤ بای دا بەربەلاڤبوویە. ڤێ کریارێ دوو ئەنجام هەبوون: ژینگەهێ دەستووری دایە وەرارکرنا وان زیندەوەران یێن ب رێکا سیهان بێهنا خوە دئینن و دبەن، هەردیسان ژیانگەهێ ئەڤ جۆرێ

ژیانێ ژ تیشکێن گەردوونی پاراستینە. یا سەیر ل ڤێرێ ئەوە کو ئەڤ تیشکێن گەردوونی یێن ڕولەکێ گرنگ هەی د دروستبوونا یەکەم خانەیا زیندی دا، د هەمان دەم دا یا ب مەترسی یە بۆ سەر گشت جۆرێن ژیانێ."

- "بەلێ پا بەرگێ بای و تەخا ئوزونێ دناڤبەرا شەڤ و ڕۆژەکان دا پەیدانەبوویە، ئەرێ پا زیندەوەرێن دەستپێکێ چەوا ژیاینە؟"

- "ل دەستپێکێ ژیان دناڤ دەریاییێن دەستپێکی دا پەیدابوو کو ئەم دبێژینێ ئاڤکا دەستپێکێ، ل وی دەمی ڕەنگە برەکا کێم یا تیشکێن گەردوونی یێن زیانبەخش گەهشتبنە دناڤ ئاڤێ دا، ژبەر هندێ ئەڤ زیندەوەرە ب سانەهی شیاینە دناڤ ئاڤێ دا بژین و خوە ژ ڤان تیشکان بپارێزن. لێ ژبیرنەکە دەمەکێ درێژ پێ بوری هەتا زیندەوەرێن هشکئاڤی پەیدابووین، ئانکو ئەو زیندەوەرێن دشێن دناڤ ئاڤێ و سەر هشکاتی دا بژین وەکو کیسەلە و تیمساحان، ب تایبەت پشتی دروستبوونا بەرگێ بای. سەحکێ نوکە ئەم یێ د کۆلکی ڤە ڕوونشتین و تەماشەی داروبارێن دارستانێ دکەین ئەڤێن کو بەری سێ یان چوار ملیار سالان دەست ب وەراڕکرنێ کری.

- "دگەل ڤێ چەندێ هەموویێ، نەکو تو بێژی ئەڤ تشتە هەموو ژ نیشکەکێ ڤە پەیدابن؟"

- "من ئەڤ چەندە نەگوتیە، وێنەیێ ل سەر ڤی کەڤالی دیار دکەت کو وەراڕکرنێ ئاڕاستەیەکێ ڕاستەقینە هەبوویە و پشتی بورینا هەیامێن درێژ، چەندین زیندەوەرێن خوەدان سیستەمێن دەماری یێن ئالۆزتر و پێشکەفتیتر پەیدابووینە و مەژیێن وان مەزنتر لێهاتینە. ب بۆچوونا خوە یا کەسایەتی، ئەز باوەرناکەم ڤێ چەندێ هەموویێ ژ نیشکەکێ ڤە ڕوودابیت، تو چ دبێژی؟"

- "تشتێ بالکێش ئەوە ڤێ وەراڕکرنا تەمسار داروین ب خوە ژی مەندەهوش کربوو. ئەز باوەرناکەم تشتەك ژ نیشکەکێ ڤە بهێت و تشتەکێ هەستیار و ئالۆز، بۆ نموونە چاڤێن مە، دروست بکەت."

سۆفیا ڕوونشت، بەرێ خوە دا ئەلبێرتۆی و هزرێن خوە کرن: چەند یا سەیرە نوکە ئەم د ژیانێ دا بین و ب تنێ جارەکێ بژین و جارەکا دی مە ئەو دەلیڤە نەبیت بزڤرینە د ژیانێ دا ڤە."

ژ نیشکەکێ ڤە، سۆفیا گوت: "باشە بەهایێ ئافراندنا هەتا هەتایی چیە مادەم ژ نیشکەکێ ڤە هەموو مرۆڤ دێ بەرەڤ نەمانێ چن و مرن."

ئەلبێرتۆی ب ئاورینەکا تیژ تەماشەی وێ کر.

- "پێدڤیە تو هۆسا نەئاخڤی، چونکی ئەڤە ئاخفتنێن شەیتانی نە."
- "شەیتان؟"
- "بەلێ، پەیڤێن "مفیستوفیلیس"ێ شەیتانن د شانۆگەریا "فاوست*" یا گوتەی دا."
- "ڕامانا ڤێ چەندێ چیە، بۆ من دیار بکە."
- "دەمێ فاوست دکەفیتە بەر مرنێ، تەماشەی هەموو کارێن ژیانا خوە دکەت و ب شانازی ڤە دبێژیت:

پاشی د ڤی ساتی دا ئەز دشێم بێژم

نوکە بمینە، چونکی تو گەلەکا جوانی

جهێ خوە دناڤ ژیانا من یا سەر ئەردی دا بکە

تو نە دشێی خوە دناڤ هەتا هەتاییەکا بێ ناڤونیشان دا بەرزە بکەی

نوکە ئەز یێ د چاڤەرێیەکا وێ بەختەوەریا مەزن دا

داکو خوشیێ ژ چرکەیێن ژیانا خوە وەربگرم

- "وی ب ڕێکەکا جوان دەربڕین یا ژێ کری."
- "لێ پشتی هینگێ گەرا شەیتانی هات دا باخڤیت، هەردەمێ هەناسەیێن فاوستی ڕاوەستیاین، شەیتانی کرە هەوار و دگوت:

---

* فاوست Faust شانۆگەریەکا تراژیدی یا نڤیسەرێ ئەلمانی "گوتە"یە کو ژ دوو پشکان پێکدهێت، پشکا یەکێ ل سالا 1808ێ و پشکا دووێ ل سالا 1832ێ بەلاڤکرینە. ئەو ب خوە چیرۆکەکا ئەفسانەیی یە بەحسێ گەنجەکی ب ناڤێ فاوست دکەت کو پشتی مالەکێ مەزن وەك میرات ژ مامێ وێ بۆ دمینیت، دەست خواندنا و فێربوونا هەموو تشتێن ل سەردەمێ خوە دکەت لێ پشتی هینگێ دزانیت چ مفا د ڤێ چەندێ دا نەبوو و پەشیمان بوو کو خوشی بۆ خوە ژ دنیایێ چێنەکری، لێ پشتی هینگێ شەیتانێ مفیستوفیلیس دهێت و ڕێکەفتنەکێ دگەل دکەت و ژیێ وێ دکەتە 24 سال..... هتد.

پەیڤەکا تەمسار، ڕابردوو

باشە بۆچی ئەو ب دوماهی هات؟

ب دوماهی هات، رابردوو و نەبوون وەکو یەکن

بەهایێ ژیانا هەتا هەتایی چیە

ئەگەر ل دوماهیێ هەر د ئافرێندی بەرەڤ نەمانێ بچن

ئەڤە ڕابردوویە. چەوا دێ د ڤێ مامکێ گەهین؟

هەروەکو چ تشتان قەت دەستپێنەکری

جارەکا دی یێ دناڤ بازنەیەکێ دا دزڤڕیت، هەروەکو ئەو بەری نوکە هەبوویە

ئەز ڤالاهیا هەتا هەتا باشتر دبینم

- "ئەڤە چ ڕەشبینی یە، من پتر حەز ژ تێکستێ یەکێ کر، هەتا دەمێ فاست مری ژی، لێ وی ڕامانا وان شوونوار دزانی یێن ل پاش خوە هێلاین."

- "مانە هۆسایە. د ڕاستی دا ما ئەڤە ژی یەك ژ ئەنجامێن تیورا داروینی یا ل دور وەڕاڕکرنێ نینە. ب تایبەت ئەگەر ئەم بێژین هەر شێوەیەك ژ شێوەیێن ژیانێ خو هەکە چەند یێ بچووك ژی بیت، دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا تشتەکێ مەزنتر؟ ئەختەرا زیندی ئەمین، سۆفیا! ئەم هەموو پێکڤە کەشتیەکا زیندی یا مەزنین ل دور هەتاڤا سەربەخو دناڤ گەردوونی دا دزڤڕین. لێ هەر یەك ژ مە ب خوە ژی کەشتیەکە و بارەکێ جینان دگەل خوە هەلگرتیە، ئەگەر ئەم شیاین ڤی باری بگەهینە بەندەرەکێ گونجای، وی دەمێ ژیانا مە یا بێ مفا نابیت.

# فرۆید

... ئەڤ حەزا خوەپەرێس و نەئاشکەراکری یاکو د ناخێ وێ دا پەیدابووی...

**هێلد موللەر کناگێ خوە ژ سەر تەختی هاڤێت و ئەو فائیلە یا د دەستێن وێ دا. ئەو فائیلە دانا سەر مێزێ و جلکێن خوە برن و بەرەڤ سەرشوویێ ڤە چوو، کو ب تنێ د دەمێ دوو خولەکان دا سەرێ خوە شووشت و ب هەمان لەزاتی جلکێن خوە کرنە بەر خوە. پاشی هاتە خوار.**

- **"تێشت یا حازرە هێلد!"**
- **"من دڤێت ل دەستپێکێ ب بەلەمێ بچمە گەشتەکا کورت."**
- **"بەلێ پا ... هێلد ...!"**

**ئەو ژ مال دەرکەڤت و دناڤ باخچەی ڕا دەرباز بوو و بەرەڤ بەلەمێ ڤە چوو، وەریسێ بەلەمێ ڤەکر و چوو تێدا. پاشی دناڤ دەریاچێ دا دهات و دچوو و وێ ب جۆش و خرۆشەکا مەزن ڤە ب هەردوو دەستان دارێن بەلەمێ دناڤ پێلێن ئاڤێ دا دئینان و دبرن، تاکو هەست ب ئارامییێ کری.**

**"هەسارەیا زیندی ئەمین، سۆڤیا. ئەم ئەو پێکهاتەیا مەزنین یاکو ل دور ڕۆژەکا سەربەخو د دلێ گەردوونی دا دزڤڕیت. بەلێ هەر یەك ژ مە ژی پێکهاتەیەکە کو ب بارێ**

خوە پێ جبنان ژ ژیانێ دەرباز دبیت. ئەڤجا ئەگەر مە بارێ خوە ل بەندەرەکێ گونجایی دانا، هینگێ ئەم ژ ڤەستا و بێ مفا نەژیاینە..."

وێ ئەڤ چەندە ژبەرکر و چونکی دزانی بۆ وێ یا ئاڕاستەکریە نەك بۆ سۆفیایێ. وێ هەردوو دار دانان و خوە ڕادەستی پێلێن ئاڤێ کر کو ب کەیفا خوە ئەو دئینا و دبر.

ئەو ژی وەکو ڤێ بەلەما سادە یاکو ل سەر ڕوویێ کەنداڤەکێ بچووك ل لیلساندێ دهاتی و دچووی، هەست ب وێ چەندێ دکر کو ئەو ب تنێ وەکو ڤەلپێ گویزێ یە ل سەر ڕوویێ ڤێ ژیانێ دهێت و دچیت. ئەرێ چارەنڤیسێ سۆفیایێ و ئەلبێرتۆی د ڤی وێنەی دا چیە؟ ئەرێ ئەو نوکە ل کیڤەنە؟

ئەو نەشێت وێ بیرۆکەیێ بپەژرینیت کو ئەڤ هەردوو بوونەوەرە ب تنێ "پاڵدانێن کەهرومۆگناتیسینە" د مەژیێ بابێ وێ دا و ب تنێ هندەك بوونەوەرێن چێکرینە ژ حبری و کاغەزێ کو ئامیرێ نڤیسینێ ئەو چێکرینە و دەرێخستینە. ل گۆرەی ڤێ چەندێ، ئەرێ ئەو ژی نە ب تنێ پێکهاتەیەکە ژ پڕۆتینێن تێکەلبوویی کو د ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان دا شێوەیەکێ دەستنیشانکری ب خوە ڤە گرتیە. د "گۆمەکا بچووك یا ئاڤا تێهنشیر" دا؟ لێ ئەو .. ئەو تشتەکێ دی ژی یە. ئەو هێلد موللەر کناگەا!.

یا دیارە کو ئەو ڤائیلا مەزن خەلاتەکێ جوان بوو د جەژنا بوونا وێ دا بۆ هاتی. پێدڤیە ئەو دانپێدانێ بکەت بابێ وێ دەستێ خوە کریە تێلەکا هەستیار د ناخێ وێ دا، لێ ئەو حەز ژ ڕەفتارا وی یا تڕانەپێکەر ناکەت ل بەرامبەر ئەلبێرتۆی و سۆفیایێ.

ژبەر هندێ ئەو دێ وێ کەت یاکو وی شاش و مەندەهۆشکەهی دکەت ل دەمێ ڤەدگەریت ئانکو دێ کارەکێ هۆسا کەت ڕێکێ ل بەر وی بەرزە دکەت. ئەڤە کێمترین تشتە کو پێدڤیە ل سەر وێ ئەو بۆ وان هەردووکان بکەت. ئەوێ هۆسا هزرا خوە دکر کو بابێ وێ وەکو کەسەکێ بەرزە و شاش و مەندەهۆشکەهی بێ ل مەمەرێن ڤرۆکخانەیا کۆپنهاگن بلەز پێ دهێت و دچیت.

هێلدێ هۆسا هزرکر کو ئەو ب ئێکجاری ئارام بوو، وێ دەست دا هەردوو دارێن بەلەمێ و بەرەڤ کنارێ دەریاچەیێ ڤەگەڕیا. ل دوماهیێ شیا ب دلێ خوە تێشتێ دگەل دایکا خوە بخوت. چەندا یا خوشە بەحسی تشتێن بێ ڕامان بکەین، وەکو: هێك یا دلڤەکەرە، لێ

**خوژێ خولەکەکا دی ژێ کەلی با. ئەو ل فائیلا خوە نەڤەگەڕیا تاکو بوویە دوماهیا شەڤبیریێ، کو گەلەك لاپەڕ نەمابوون ئەو بخوینیت.**

دیسان کەسەکی دەرگەهـ قوتاڤە.

ئەلبێرتۆی گوت: "ئەگەر مە گوهێن خوە کەڕ کرن، دێ ئەو کەسێ دەرگەهی دقوتیت بێزار بیت و چیت"

- "نەخێر، من دڤێت بزانم ئەو کی یە."

سۆفیا ڕابوو و ئەلبێرتۆ ژی ب دووڤ کەفت.

وان زەلامەکێ ڕووس ل بەر دەرگەهی دیت کو ب ئاوایەکێ ماقویل ڕاوەستیا بوو و تانجەك ل سەر سەری بوو.

- "و پاشی؟ بۆچوونا جڤاتا خانەدانان چیە سەبارەت جلکێن نوو یێن ئیمپڕاتۆری؟"

سۆفیا و ئەلبێرتۆ ڕەپ ڕاوەستیان و زێدە مەندەئاگەهی مان کو ئەڤ زەلامێ ڕووس ئەو شاش و مەندەئاگەهی کرن و ل وان کرە هەوار: "هەوە سلاڤ ژی نەڤەدا!"

ئەلبێرتۆی خوە وێرەك کر و بەرسڤا وی دا: "ئەڤە ڕاستە، لێ ئیمپڕاتۆر وەکو کرمەکی یێ ڕووسە." لێ زەلام هەر ما ل سەر ڕاوەستیانا خوە یا خومەزنکەر و بێ منەت، بێ کو هیچ تشتەکی بێژیت.

ئەلبێرتۆی خوە چەماندە بەر گوهێ سۆفیایێ و گوتێ: "ئەو هزر دکەت ئەو، ئەو زەلامەیە یێ کو پێدڤیە وەکو وی لێ بهێت."

ژ نیشکەکێ ڤە زەلامی خوە لڤاند و گوت: "ئەرێ هوون زێرەڤانیەکێ ل ڤی خانی دگرن؟"

ئەلبێرتۆی بەرسڤ دا: " بەختڕەشیا مە، مە مەژیەکێ زەلال هەیە و ئەم ل دووڤ هەستێن خوە دچین پتر ژ هەر دەمەکێ بوری. ژبەر هندێ ئیمپڕاتۆری چ هیڤی نین ژ ڤی جهی ببوریت و ئەو ب ڤی سەروسیمایێ هەتکبەر."

سۆفیایێ هەستپێکر سەروبەرێ ڤی زەلامی یێ ب کەنی یە لەوڕا نەشیا خوە و ب دەنگەکێ بلند کرە کەنی. هەروەکو ئەڤ چەندە بوویە ئاماژەیەکا نهێنی کو زەلامی ل دوماهیێ هەست ب هندێ کر ئەو ب تەمامی یێ ڕووسە. وی ب دەستێ خوە ئەندامێ خوە یێ سێکسی ڤەشارت و بلەز بەرەڤ دارستانێ ڤە چوو. دبیت وی ل وێرێ ئادەم و حەوا دیتبن، نوح، خوەدانا ساکۆیێ سۆر و وینی یێ هرچ.

بۆ دەمەکی ئەلبێرتۆ و سۆفیا مانە ل بەر دەرێ ژوور و دکرنە کەنی.

ئەلبێرتۆی گوت "دێ، دا بڤەگەڕین،. دێ بۆ تە بەحسی فرۆیدی و بیرۆکەیا وی کەم ل سەر بێئاگەهیێ."

دەمێ ل نێزیك پەنجەرێ ڕوونشتین، سۆفیایێ سەحکرە دەمژمێرا خوە و گوت: "بوو دەمژمێر دوو و هێشتا من گەلەك بەرهەڤی ماینە ژ بۆ ئاهەنگا ئێڤاری."

- "هەروەسا من ژی. ژبەر هندێ ئەز دێ بۆ تە پیچەك ل سەر فرۆیدی ئاخڤم."
- "ئەرێ ئەو ژی فەیلەسۆفە؟"
- "ئەم دشێین بێژین کو ئەو ب شێوەیەکی ژ شێوەیان فەیلەسۆفە. سیگمۆند فرۆید ل سالا 1856ێ ژ دایکبوویە و زانستێ نوشداری ل زانکۆیا ڤیەنا خواندییە و پتریا ژیانا خوە ل وێرێ بوراند کو ل وی دەمی ئەڤ باژێرە یەك ژ گرنگترین ناڤەندێن ڕەوشەنبیری بوو ل ئەورۆپا. فرۆیدی نوشداریا دەماران خواند و ژ دوماهیا چەرخێ نۆزدێ تاکو نیڤەکا چەرخێ بیستێ، وی ل سەر دەروونناسیا ناخێن مرۆڤان دخواند، کو دبێژنێ شرۆڤەکرنا دەروونی."
- "تو دێ بۆ من بەحسێ وی کەی مانە؟"
- "زاراڤێ "شرۆڤەکرنا دەروونی" بەحسی وەسفکرنا ناخێ مرۆڤی دکەت ب ئاوایەکێ گشتی، هەروەسا بەحسی سیستەمەکی و ڕێکارەکێ دکەت بۆ چارەسەرکرنا نەخوشیێن دەروونی و دەماری. من نەڤێت ب تەمامی بۆ تە بەحسی فرۆیدی و چالاکیێن وی بکەم، لێ تیۆریا وی ل سەر بێئاگەهیێ یا گرنگە ژ بۆ تێگەهشتنا وێ چەندێ کا مرۆڤ چیە.
- "تە بۆ من مەرەق چێکر .. تەمام بکە."

- "فرۆیدی هزردکر پەیوەندیەکا هەڤرکیێ یا بەردەوام دناڤبەرا مرۆڤی و دەوروبەرێن وی دا هەیە. ب تایبەت هەڤرکیا دناڤبەرا حەز و ڤیانێن وی و داخوازی و تشتێن قەدەغەکری یێن د جڤاکێ وی دا. بێ زێدەڕویی ئەم دشێین بێژین فرۆید یەکەم کەس بوو ژیانا غەریزی یا مرۆڤی ئاشکەراکری. ڤێ چەندێ ژی ئەو کرە یەك ژ نوونەرێن گرنگترین پێکۆلێن سروشتی یێن دیار و بەرچاڤ ل دوماهیا چەرخێ نۆزدێ."

- "مەرەما تە چیە ژ ژیانا غەریزی یا مرۆڤی ؟"

- "نە ب تنێ ئەقلێ مرۆڤی کریارێن مە بڕێڤە دبەت، چونکی مرۆڤ نە ب تنێ بوونەوەرەکێ ڕاشیونالیزمی یە، هەروەکو فەیلەسۆفێن ڕاشیونالیزمی یێن چەرخێ هەژدێ دڤیای مە ڕازی بکەن ل سەر ڤێ چەندێ. بارا پتر پاڵدەرێن نەئەقلانی وێ چەندێ دەستنیشان دکەن کا ئەم چ هزر دکەین یان چ خەون دبینین یان چ دکەین. و دبیت ئەڤ پاڵدەرێن نەئەقلانی دەربڕینەك بن ژ حەز و ڤیانێن مرۆڤی یێن کوور. بۆ نموونە، حەزا سێکسی ل نك مرۆڤی پێدڤیەکا سەرەکی یە کو چ ژ پێدڤیا زارۆکی بۆ شیردانێ کێمتر نینە."

- "تێدگەهم."

- "ئەڤە نە تشتەکێ نوویە. لێ فرۆیدی ئەڤ یەکە سەلماند کو دبیت ئەڤ جۆرێ پێدڤیێن سەرەکی د ڤەشارتی و بێدەنگکری بمینن، بەلێ ئەو حەز و ڤیانێن مە بڕێڤە دبەن بێ کو ئەم هەست پێ بکەین، هەروەسا سەلماند کو زارۆکان ژی جۆرە هەستەکێ سێکسی ل نك هەیە. ئەڤ بەحسکرنا وی ل سەر "هەستێ سێکسی ل نك زارۆکان" بوو ئەگەرێ دلتەنگکرنا چینا ڕەوشەنبیران ل ڤیەننا، هەروەسا بوو ئەگەرێ هندێ ببیتە کەسەکێ گەلەك نەخوشتڤی."

- "ئەز ژبەر ڤێ بوچوونا وی مەندەئاگەهی نەبووم."

- "ئەم یێ بەحسی ڤۆناغا ڤیکتۆریانیزمێ دکەین "ئانکو ڤۆناغا دەستهەلاتا ڤیکتۆریا" کو ل وی سەردەمی هەر تشتێ پەیوەندی ب سێکسی ڤە هەی یێ قەدەغەکری بوو. فرۆیدی ژی د چوارچۆڤەیێ کارێ خوە دا وەك نوشدارێ دەروونی ئاشکەراکر کو هەستێ سێکسی ل نك زارۆکان هەیە، هەر ژ بۆ ڤێ چەندێ دەستێ خوە کرە هندەك ڕەگەزێن تاقیکرنێ، کو تێبینیا هەبوونا چەند شێوەیێن ژانێن دەروونی و حالەتێن

- "دەمارگیریێ کر ییێن ڤەدگەڕن بۆ هندەك کێشەیان کو کەسێ نەخوش د زارۆکینیا خوە دا تێڕا بوری یە. هۆسا وی هێدی هێدی جۆرەکێ تایبەت یێ چارەسەریێ ڤەدیت کو ئەم دشێین بێژینێ "لێگەڕیان ل شوونوارێن دەروونێ مرۆڤی" یان ژی ڤەکۆلینا ناخێ مرۆڤی."

- "مەرەما تە ژ ڤێ چەندێ چیە؟"

- "لێگەڕێ شوونواران پێکۆلێ دکەت شوونوارێن کەڤنار یێن سەردەمێن بوری ببینیت، ب ڕێیا کۆلانا تەخێن دیرۆکا شارستانیەتان. دبیت ئەو کێرەکێ ببینیت کو یا سەردەمێ چەرخێ هەڤدێ بیت. پاشی تەخەکا کوورتر بکۆلیت و شەیەکێ سەردەمێ چەرخێ چواردێ ببینیت و تەخەکا هێشتا کوورتر بکۆلیت و گۆسکەکێ سەردەمێ چەرخێ پێنجێ ببینیت..."

- "ئێ؟"

- "ب هەمان ئاوا، شرۆڤەکارێ دەروونی ژی ب هاریکاریا نەخوشێ خوە تەخێن دەروونی یێن نەخوشی دکۆلیت داکو وان ئەزموونێن ژیانێ دەربێخیت یێن دەمەکی بووینە ئەگەرێ پەیداکرنا ژانێن دەروونی بۆ وی نەخوشی. ل گۆڕەی فرۆیدی، ب ڤی ڕەنگی ئەم د کوورترین کووراتییێن ناخێ خوە دا بیرهاتنێن خوە یێن بەرێ دڤەشێرین."

- "نوکە ئەز باشتر تێگەهشتم."

- "ئەو ژ ڤان کووراتیان ڤەدگەڕیت و دگەهیتە خالا ب ئاگەهـ هاتنا نەخوشی کو دبیت د ئەزموونەکا ژیانێ یا گران دا دەربازبوویە و چەندین سالە پێکۆلێ دکەت ژبیر بکەت، لێ مایە د کووراتییێن ناخێ وی دا، ئەڤ ئەزموونە شیانێن ڤی مرۆڤی دیار دکەت و دلڤینیت. و ئەڤ "ئەزموونا تروما" جارەکا دی دیار دبیتەڤە و مرۆڤ لێ ب ئاگەهـ دبیتەڤە، بەلێ ب دەربڕینەکا دیتر، ئەو ژی ب دانانا ڤێ ئەزموونێ ل بەر چاڤێن نەخوشی، داکو بشێت حساباتێن خوە دگەل ڤێ ئەزموونێ بکەت و چارەسەر ببیت."

- "ئەڤە تشتەکێ بەرئاقلە."

- "لێ ئەز د سەر چەند قۆناغان ڕا بوریم. دا بڤەگەڕین و سەحکەینە وەسفا فرۆیدی بۆ دەروونێ مرۆڤی. ئەرێ تە زارۆکەکێ ساڤا دیتیە؟

- "من کوڕمامەك هەیە ژیێ وی چوار سالن."

- "دەمێ ئەم دهێنە ڤێ جیهانێ، ئەم ب سانەهی ژ هەموو پێدڤیێن خوە یێن دەروونی و جەستەیی دەرباز دبین زێدەباری هەر تشتەکێ مە بێزار دکەت. ئەگەر شیر نەدا مە، ئەم دکەینە گری، هەروەسا ئەم دکەینە هەوار دەمێ ئەم خوە تەڕ دکەین. هەروەسا ئەم ب ئاشکەرایی و یەکسەر ژ پێدڤیبونا خوە بۆ ڤیانێ دەرباز دبین."

- "فرۆیدی "بنەمایێ پاڵدەران" و "خۆشی وەرگرتنێ" ب زاراڤێ "ئازرینا بێئاگەهیێ" ناڤکریە. هەر ژ بەر ڤێ یەکێ، زارۆکێ ساڤا شێوەیەکە ژ شێوەیێن ڤێ "ئازرینا بێ ئاگەهیێ".

- "بەردەوام بە."

- "ئەم ب درێژاهیا ژیانا خوە تاکو پشتی ئەم پێدگەهین ژی، ڤێ "ئازرینا بێئاگەهیێ" د ناخێ خۆ دا دهێلین. لێ د حەزێن خوە دا ئەم هێدی هێدی فێری هەڤسەنگیێ دبین و خوە دگەل یاسایێن جڤاکی دگونجینین. ئەم فێری وێ یەکێ دبین "بنەمایێ کەتواری" ب سەر "بنەمایێ خۆشی وەرگرتنێ" بێخین. فرۆید دبێژیت ئەم "ناخەکی" دروست دکەین ب ڤی ئەرکێ ڕێکخستی و ڕاستڤەکری ڕادبیت. هۆسا مە زانی هەتا مە تشتەك بڤێت ژی، نابیت ئەم بکەینە هەوار و بکەینە گری داکو وی تشتی بدەستڤە بینین یێ کو ئەم پێدڤی و مە حەز ل سەر هەی."

- "چ پێنەڤێت، نەخێر."

- "دبیت مە گەلەك حەز ل سەر تشتەکی هەبیت کو جیهانا ژ دەرڤە "جڤاك" وی تشتی ڕەتبکەت، دبیت ل وی دەمی ئەم حەزێن خوە بێدەنگ بکەین و بڤەشێرین، ئەڤجا دێ پێکۆلێ کەین ژ بیردانکا خوە بینینە دەر و ژ بیرا خوە ببەین."

- "تێگەهشتم."

- "لێ فرۆید دووپاتیێ ل سەر هەبوونا کریارەکا دی د دەروونێ مرۆڤی دا دکەت. هەر ژ زارۆکینیا خوە ئەم ڕوو ب ڕوو پێگیریێن ڕەوشتی ژ لایێ مەزنان و جڤاکێ دەروبەر ڤە دبین. ئەگەر هات و مە تشتەکێ شاش کر، دێ ئەندامێن خێزانێ ل مە کەنە هەوار: "نەخێر، نە هۆسا!" یان "تو چەندێ گێژی!". و هۆسا و ژیێ مە یێ مەزن دبیت، ئەم ڤان پێگیری و فەرمانێن پێشتر یێن ڕەوشتی ل پشت خوە ڕادخشینین و دگەل خۆ دئینین و ل

دوماهیێ ئەم دکەینە د ناخێ خوە دا، کو دبنە پشکەك ژ مە.  فرۆید دبێژیتە ڤێ چەندێ "ئەزێ نموونەیی."

- "ئەرێ ئەو بەحسێ وژدانێ دکەت؟"

- "ل گۆڕەی فرۆیدی، وژدان پشکەکە ژ ئەزێ نموونەیی. لێ ئەڤ ئەزە مە ئاگەهدار دکەت دەمێ مە "حەزێن" پیس یان "نەپەژراندی" هەبن. ب تایبەت حەزێن سێکسی و شەهوانی. هەروەکو من گوتی فرۆید داکوکیێ ل سەر وێ چەندێ دکەت کو د ڕاستی دا ئەڤ حەزێن "ڤارێبوویی" هەر ژ قۆناغا زارۆکینیێ هەنە لێ د ڤەشارتینە."

- "ڕوهن بکە."

- "ئەم دزانین و تێبینییا وێ چەندێ دکەین کو زارۆکێن ساڤا بۆ وان هەستەکێ خوش پەیدادبیت ئەگەر دەستێ خوە بکەیە ئەندامێن وان یێن سێکسی و ب تنێ هەڕە مەلەڤانگەهەکێ دێ تێبینییا ڤێ چەندێ کەی. ل سەردەمێ فرۆیدی، ئەو زارۆکێ هەست ب ڤێ چەندێ دکری، دا شەقەکێ ل دەستێ وی دەن. دگەل گوتنا ئاخفتنێن توند "هەی بێ مەژی!" یان "ما تو شەرم ناکەی؟!" یان "دێ .. دەستێ خوە دانە سەر جلکێن خوە!".

- "لێ ئەڤە دیناتی یە!"

- "ئەڤە وێ چەندێ دگەهینیت کو هەر تشتەکێ پەیوەندی ب سێکسی و ئەندامێن وی ڤە هەبیت هەستکرن ب گونەهێ ل نك مرۆڤی پەیدادکەت. ژبەرکو ئەڤ هەستە د "ئەزێ نموونەیی" دا دمینیت، ژبەر هندێ ب بۆچوونا فرۆیدی پرانیا مرۆڤان ب درێژاهییا ژیانا خوە هەست ب گونەهێ دکەن ل بەرامبەر هەر تشتەکێ گرێدایی ب سێکسی ڤە، د دەمەکی دا حەز و پێدڤیێن سێکسی پشکەکن ژ لەشێ مرۆڤی. ل ڤێرە، هەڤڕکیا هەروهەری دناڤبەرا حەز و هەستکرن ب گونەهێ دەست پێدکەت."

- "ئەرێ تو هزر ناکەی ئەڤ هەڤڕکیە دێ لاوازتر لێ هێت پشتی سەردەمێ فرۆیدی؟"

- "چ پێ نەڤێت. لێ هژمارەکا مەزن ژ نەخۆشێن فرۆیدی د ڤێ هەڤڕکیێ دا ب ئاوایەکێ خراب دژیان کو فرۆیدی ئەڤ چەندە ب "دەمارگیرییا دەروونی" ناڤکر. بۆ نموونە، یەك ژ وان نەخوشان ب نهێنی ڤە ئەڤیندارا هەڤژینێ خوشکا خوە بوو. پشتی خوشکا وێ ژبەر نەخوشییەکا گران گیانێ خوە ژ دەستدای، ئەوێ گوتە خوە: "نوکە ئەو دشێت ژیانا

هەڤژینییێ دگەل من پێکبینیت" لێ ئەڤ هزرە ب "ئەزێ نموونەیی" کەڤت و هەر زوو د ناخێ خوە دا ڤەشارت و بێدەنگکر، هەروەکو فرۆیدی نڤیسی، مەرەما وی ئەو بوو کو وێ ئەڤ هزرە کرە د خانەیا بێئاگەهییا خوە دا. ئەڤ ژنا گەنج یا نەخوش تووشی هستیریایێ بوو. ل دەمێ چارەسەرکرنا وێ، ئەوێ تێبینییا هندێ کر کو وێ ب تەمامی دیمەنێ ڕاوەستیانا خوە ل بەرامبەر سندریکا خوشکا خوە ژبیرکر، ل دەمێ هەستێ خۆپەرێس یێ نەڕاگەهاندی د ناخێ وێ دا پەیدابووی لێ د دەمێ چارەسەرییێ دا ئەڤ هەستە هاتە بیرا وێ: ئەڤ ساتە ب هەلچوون و تێکچوونەکا مەزن ڤەگەڕیا و ئەو ژنە چارەسەر بوو".

- "نوکە تێگەهشتم کا مەرەما تە ژ "لێگەڕیان ل شوونوارێن دەروونی" چ بوو."

- "نوکە ئەم دشێین وێنەیەکێ تەمام یێ دەروونێ مرۆڤی ب شێوەیەکێ گشتی بکێشین. پشتی چەندین سالێن تاقیکرنێ ل سەر نەخوشێن خوە، فرۆید گەهشتە ئەنجامەکی، ئەو ژی ئاگەهییا مرۆڤی ب تنێ پشکەکا بچووکە ژ دەروونێ مرۆڤی. ئاگەهییا مرۆڤی هەروەکو ئەو پارچەیا دیارە ژ چیایێ بەستییێ. ل بن ڕوویێ ئاڤێ، ئانکو ل بن ئاگەهیێ هەموو ئەوە یاکو ئەم ژێ د بێئاگەهـ. هەستێ ڤەشارتی پاشی بێ هەستی، ئاگەهییا ڤەشارتی پاشی بێئاگەهی."

- "ئەرێ بێئاگەهی ئەو چەندەیە یاکو د ناخێ مە دا هەی، لێ مە ژبیرکرییە و ئێدی ئەم نەشێین بینینە بیرا خوە؟"

- "هەردەم ئەزموونێن مە یێن ژیانێ د ئاگەهییا مە دا د ئامادە نینن. لێ هەموو ئەو هزر و بیر و ئەزموونێن کو د شیاندایە بڤەگەڕنە بیردانکا مە بێ کو ئەم زەحمەتەکا مەزن د هزرکرنێ دا ببەین دبنە ئەو پشکا "ل ژێر ئاگەهییێ" هەروەکو فرۆیدی بناڤکری. ئەو زاراڤێ بێئاگەهییێ ب تنێ ژ بۆ دەربڕینێ ژ وێ چەندێ بکاردئینیت ئەوا مە نڤیسی و ڤەگەڕاندیە ناخێ خوە. ئانکو هەموو ئەو هزر و بیر و تشتێن مە پێکۆل کری ژبیر بکەین ژبەرکو د نەگونجایی و ڤاڕێ و ڕەتکری بوون. ئەڤجا ل دەمێ ئاگەهی یان ئەزێ نموونەیی حەزەکا دەستنیشانکری ڕەت دکەت، ئەم وێ حەزێ دهاڤێژینە تەخا بنی. خوە قورتالکرنەکا باشە!"

- "تێدگەهم."

- "ئەڤ میکانیزمە ل نك هەموو کەسێن ساخلەم کار دکەت. لێ هندەك ژ وان پێدڤی ب پێکۆلەکا مەزنن داکو ڤان هزرێن نەخۆش و قەدەغەکری بڤەشێرن و بێدەنگ بکەن، کو د ئەنجام دا تووشی ژانێن دەماری یێن ڕاستەقینە دبین. ئەو هەستێ بێدەنگکری بەردەوام پێکۆلێ دکەت سەربکەڤیت و بەرەڤ ئاگەهییێ ڤە بچیت کو وە ل مرۆڤی دکەت هەڤسەنگیەکا دەستکرد دناڤبەرا حەزێن خوە و کەتواری دا دروست بکەت. فرۆیدی د یەك ژ وانەیێن خوە دا ل ویلایەتێن یەکگرتی یێن ئەمریکی ل سالا 1909ێ نموونەیەك ل سەر ڤێ میکانیزمێ ئینا بوو."

- "بەلێ، گوهێ من یێ ل تە."

- "گوتە جەماوەرێ خوە وەسا هزر بکەن کەسەکێ تێکدەر یێ د ڤێ هۆلێ ڤە هەی کو ب خەپسەڤە یێ دهێتە ژوور و دەنگی ژ یێن خوە دئینیت و بۆ ئامادەبوویان نەخوش دکەت و وانەبێژی نەچار دکەت بڕاوەستیت و بێدەنگ ببیت. ل ڤێرە هندەك زەلامێن وێرەك ڕادبنەڤە و وی کەسێ تێکدەر ڕادکێشنە ژ دەرڤە. هۆسا ئەو هاتە دوورخستن و بێدەنگکرن و گوتاربێژ ژی دشێت وانەیا خوە ب ئارامی بەردەوام بکەت. داکو ئەڤ زەلامە نەهێلن جارەکا دی تێکدان دووبارە ببیتەڤە، ئانکو دا بهێلن بێدەنگکرن سەربکەڤیت، ئەو دێ ل بەر دەرگەهێ هۆلێ ل سەر کورسیێن خوە ڕوونن خوە وەکو "پەرژانەکی" لێکەن و ئەم دشێین هۆلێ ب "ئاگەهی"ـێ و ژ دەرڤەی هۆلێ ب "بێئاگەهی"یێ ناڤکەین داکو وێنەیەکێ ڕوهن و ئاشکەرا یێ کریارا بێدەنگکرنێ دروست بکەین."

- "ئەز ژی دبێژم وێنەیەکێ باشە."

- "لێ ئەو زەلامێ تێکدەر هێشتا ئاخفتنا خوە یا دوماهیێ نەگوتیە. هزر و پاڵدەرێن مە یێن بێدەنگکری ژی یێن ئەم بەردەوام ل ژێر فشارا وان دژین ب هەمان شێوەنە، پێکۆلێ دکەن ڕێیا خوە بشەقینن بەرەڤ ئاگەهییێ ڤە، لەورا ئەم بەردەوام تووشی "هلنگفتنێن ئەزمانی" دبین. هۆسا کارڤەدانێن نەهەستپێکەر هەست و کریارێن مە برێڤە دبەن."

- "چەوا؟"

- "فرۆیدی هندەك میکانیزم ژ ڤی جۆری ئاشکەرا کرن. ژ وان ژی: کارڤەدانێن خراب. کو ئەم ژ نك خوە تشتەکی دکەین و دبێژین کو مە پێشتر پێکۆل دکر وی تشتی بڤەشێرین و بێدەنگ بکەین. ل سەر ڤێ چەندێ ئەو بۆ مە نموونەیەکێ ڤەدگوهێزیت کو

داخواز ژ کرێکارەکی هاتبوو کرن گلاسەکی ژ ڤەخوارنا هۆستاییێ خوە ڤەخوت، لێ ئاریشە ئەوە کەس حەز ژ ڤی هۆستاییی ناکەت، تاکو هندەکان ئەو ب چڤێل ناڤدکر."

- "ئێ .."

- "پاشی کرێکاری گلاس بلند کر و ب دەنگەکێ بلند گوت: "دا نوکە ڤەخوارنا چڤێلێ خوە یێ خوەشتڤی ڤەخوین"

- "هۆسا!"

- "ب ڕاستی کرێکاری چ درەو ل خوە نەکرن ژبەرکو د ڕاستی دا وی ئەو گوت یاکو وی هزر دکری، بێ کو وی هیچ نیازەکا خڕاب ژ گوتنا خوە هەبیت. ئەرێ تە نموونەیەکا دی ژی دڤێت؟"

- "ب دلخۆشی ڤە."

- "خێزانا گوتاربێژەکێ ئاینی ژ هژمارەکا کچێن بێدەنگ و جوان پێکدهات کو خوە ل هیڤیا سەرەدانا مەترانی گرتبوون. دفنا وی زەلامی ب شێوەیەکێ نەسروشتی یا درێژ بوو. ژبەر هندێ ڤی بابی ئاگەهیداری دا کچێن خوە کو چ ئاخفتنان ل سەر دفنا مێهڤانی نەبێژن. تو دزانی کو ئەو کەسە وەکو زارۆکان نینە ڕاستییان ل ناڤ چاڤێن خوەدانی بدەت، ئەو ژی ژبەر ئەگەرەکێ سادە کو بنەماییێ ڤەشارتن و بێدەنگکرنێ ل نک زارۆکان یێ بهێز نینە هەروەکو ل نک مەزنان یێ بهێز.

مەتران گەهشت، ئەڤ کچێن ب ڕەوشت پێگیری ب فەرمانا بابێ خوە کرن و بەرێ خوە نەدانە دفنا وی، بەلکو گەلەك پێکۆل کرن ب یەکجاری نەسەحکەنە دفنا وی، لێ وان ژ بلی وی هزرا خوە د چ تشتێن دی دا نەدکرن. دەمێ یەك ژ وان کچان هاتی داکو شەکرێ و قەهوەیێ بۆ پێشکێش بکەت، ب ڕێزڤە گوتێ: "ل شوونا بێژیتێ ئەرێ تە پیچەك شەکر دڤێت بکەیە چایا خوە، گوتێ ئەرێ تە پیچەك شەکر دڤێت بکەیە دفنا خوە؟".

- "ئۆی خودا! ... چەند یا ب شەرمە!"

- "ئەم دشێین نموونەیەکا دی بینین کو ئەو ژی هێجەتگرتنە. ئانکو ئەم هەموو هێجەتان ژ بۆ کریارێن خوە دگرین ل بەرامبەر خوە و کەسێن دیتر ژی، ئەڤ چەندە ژی ژبەر ئەگەرەکێ سادەیە کو ئەو ژی گەلەك یا ب زەحمەتە ئەم دانپێدانێ ب ئەگەرێ ڕاستەقینە بکەین ژبەرکو ئەگەرەکێ نەڕەوایە.

- "بیٚ زەحمەت نموونەیەکێ بدە من."

- "ئەز دشێم وە بکەم تو پەنجەرێ ڤەکەی. ئەو دەمێ تو ل ژێر کاریگەرییا نڤاندنا موگناتیسی. ئانکو ئەز تە دنڤینم و دبێژمە تە کو پێدڤیە تو ڕابیەڤە و پەنجەرێ ڤەکەی دەمێ ئەز ب دەستێ خوە مێزێ دقوتم. تو دێ وەکەی و دێ هێجەتێ کەیە ئەو چەندە کو سەقا یێ گەرمە. لێ ئەڤە نە ئەگەرێ ڕاستەقینەیە و تە نەڤێت دانپێدانێ بکەی کو تە فەرمانەکا من بجهئینا دەمێ تو یا نڤستی .. تو "هێجەتان دگری".

- "تێگەهشتم."

- "هۆسا ڕۆژانە مە "زمانەکێ دوولا" هەیە."

- "من بۆ تە بەحسی کوڕمامێ خوە ئەوێ چوار سالی کربوو و ئەز دبێژم وی گەلەك هەڤال نینن یاریێ دگەل بکەت، ژبەر هندێ ئەو گەلەك کەیفخوش دبیت دەمێ سەرەدانا وان دکەم. ڕۆژەکێ من گوتێ کو پێدڤیە ئەز بلەز بڤەگەڕمە مال نك دایکا خوە. ئەرێ تو دزانی وی چ گوتە من دا؟

- "چ گوت؟"

- "دایکا تە یا ساویلکەیە، بەهیمەیە."

- "ئەڤە نموونەیەکا باشە ل سەر مەرەما من ب هێجەتگرتنێ. زارۆکی چ مەرەم ب وێ گوتنێ نەبوون، ژبەرکو وی دڤیا بێژیت کو تشتەکێ ساویلکانەیە تو بچی لێ وی شەرم دکر وەبێژیت."

- "هۆسا ئەڤ چەندە چێدبیت دەمێ ب "ڤەگەڕاندن"ێ ڕادبین"

- "ئەرێ تو دشێی بۆ من شرۆڤە بکەی؟"

- "ئەڤ زاراڤە وێ ڕامانێ ددەت دەمێ کو ئەم هەست و هزرێن خوە یێن کو مە بێدەنگکرین و د ناخێ خوە دا ڤەشارتین بۆ کەسێن دی دڤەگەڕینین. دەمێ سەحدکەینە مرۆڤەکێ ڕەزیل و بەخیل، دێ بینین ب چاڤێ ڕەزیلیێ بەرێ خوە ددەتە کەسێن دی. هەروەسا دەمێ ئەم ژنەکێ دبینین شەرم دکەت دانپێدانێ ب گرنگیپێدانا خوە ب سێکسی بکەت، ئەڤجا دێ ڕابیت کەسێن دی ب شێتێن سێکسی بناڤکەت."

- "تێگەهشتم مەرەما تە چیە."

- "فرۆید دبێژیت ژیانا مە یا ڕۆژانە یا پڕە ژ نموونەیێن کریارێن نەهەستپێکەر. ئەم هەردەم ناڤێ کەسەکی ژبیردکەین یان ب شێوازەکێ سەیر دەستێن خوە دکەینە جلوبەرگێن خوە دەمێ ئەم دئاخڤین یان ژی دەمێ تشتان ژ جهێن وان ڕادکەین بێ کو مە ئاگەهـ ژ خوە هەبیت. هەروەسا وان هلنگفتنێن ئەزمانی ژی ژبیرنەکەین دەمێ مە ژ بێگونەهی تشت دگوتین. ب بۆچوونا فرۆیدی ئەڤە هەموو نیشانن. و ئەڤ هلنگفتنە د کریاران یان گوتنان دا بهێزترین و موکمترین نهێنییێن مە ئاشکەرا دکەن."

- "ژ نوکە وێڤە دێ یا هشیار بم ل سەر هەر تشتەکێ دبێژم."

- "لێ تو نەشێی خوە ژ پالدەرێن نەهەستپێکەر قورتال بکەی. ژبەر هندێ شارەزایی هەموو ئەوە کو خوە گەلەك ماندوو نەکەی ژ بۆ ڤەگەڕاندنا هزرێن نەئاشکەراکری بۆ ڕەوشا نەهەستپێکەر. هەروەکو مرۆڤ پێکۆلێ بکەت دەرێ کونەکا مشکێ ئاڤێ دناڤ ئاخا باخچەی دا بگریت، لێ چەند پێکۆلان دووبارە بکەی و سەربکەڤی، د ئەنجامدا دێ مشکێ ئاڤێ هەر پەنایێ بەتە بەر ڤەکرنا کونەکا نوو ل جهەکێ دی و نە گەلەك دوور. ژبەر هندێ گەر مرۆڤ دەرگەهی دناڤبەرا هەستی و نەهەستی دا پیچەك بهێلیتە ڤەکری ساخلەمترین و باشترین ڕێکە."

- "و ئەگەر مە دەرگەهـ گرت. ئەرێ دێ تووشی نەخوشیێن دەروونی بین؟"

- "بەلێ. ئەو کەسێ نەخوش ب دەمارگیریێ، ب هەموو شیانێن خوە پێکۆلێ دکەت وان تشتان ژ ئاگەهیا خوە بینیتە دەر یێن کو زەوقا وی تێکددەن. بارا پتر ئەو تشتێن دئینیتە دەر ئەزموونەکا گەلەك گرنگە تا وی ڕاددەی بێدەنگکرن و ڤەشارتنا وێ کارەکێ پڕ ڕامانە. فرۆیدی ناڤێ "شۆکا دەروونی" یان تروما ل سەر ڤان ئەزموونێن تایبەت دانایە کو د بنەڕەت دا بۆ پەیڤا گریکی "Trauma" ئانکو "برین" ڤەدگەڕیت."

- "تێگەهشتم."

- "فرۆید د پێکۆلێن خوە دا ژ بۆ چارەسەرکرنا نەخوشێن خوە پێکۆل دکر ڤی دەرگەهێ گرتی ڤەکەت و گەر ب سەرنەکەڤت، دەرگەهەکێ دی ڤەکەت داکو خوە بگەهینیتە ئاگەهیێ و ب هاریکاریا نەخوشی ب خوە، خوە بگەهینیتە ئەزموونێن ڤەشارتی و بێدەنگکری د بێئاگەهیێ دا، نەخوش ب خوە ب تشتێن خوە یێن ڤەشارتی و بێدەنگکری

ناحەسیێت، لێ ئەو دشێت ڕێ بدەتە نوشداری پشکداری وان تشتان ببیت و هاریکاریا وی بکەت ڕێیەکێ ببینیت وان تروماییێن ڤەشارتی دەربکەت."

- "و دێ چەوا نوشدار وەکەت؟"

- "فرۆیدی تەکنیکەك دانا ب ناڤێ "تەکنیکا پشکداریکرنا ئازاد" کو دێ نەخوش خوە ب ئاوایەکێ ئارام درێژکەت و دێ ب ئازادی بەحسی هەر تشتەکی کەت یێ دهێتە سەر هزرا وی یا وێ، ئەڤجا هەر تشتەکێ بێ ڕامان یان ب مەترسی و ژان بیت. ل ڤێرە هونەرێ چارەسەرکرنێ ڕۆلێ خوە دگێڕیت، ب ڕێیا شکاندنا ڤی "بەرگ"ی یان ڤێ "چاڤدێری"ێ کو تروما نخافتی یە و گرتی هێلایە. ئەڤ ترومایەنە نەخوشی مژوول دکەن و ئەو ب بەردەوامی کارتێکرنێ ل نەخوشی دکەت بێ کو بزانیت یان هەست پێ بکەت."

- "چەند ئەم پتر پێکۆلێ بکەین هزرا خوە د تشتەکی دا نەکەین، بێئاگەهی پتر هزرا خوە د وی تشتی دا دکەت. مانە هۆسایە؟"

- "بەلێ ب تەمامی هۆسایە. ژبەر هندێ پێدڤیە گوهداریا ئاماژەیێن بێئاگەهیێ بکەین. ب بۆچوونا فرۆیدی، "ڕێیا سولتانی" یاکو دگەهیتە بێئاگەهیێ، خەونێن مەنە، ژبەر هندێ پەڕتووکا وی ئەوا ل سالا 1900ێ بەربەلاڤبووی ب ناڤێ "ڕاڤەکرنا خەونان"، تێدا بۆ مە ڕوهن دکەت کو ئەم هۆسا ژ نیشکەکێ ڤە خەونان نابینین، چونکی هزرێن بێئاگەهـ پێکۆلێ دکەن ب ڕێیا خەونان خوە بگەهیننە ئاگەهیێ."

- "بەردەوام بە."

- "پشتی چەندین سالێن چارەکرنا نەخوشان و ڕاڤەکرنا خەونێن وان و هەروەسا خەونێن خوە ژی دا، فرۆید گەهشتە ڤەڕێژەکێ کو خەون ڕێ ددەن حەز بجهـ بهێن، ب بۆچوونا وی دبێژیت: بەسی مەیە ئەم بەرێ خوە بدەینە زارۆکان و خەونێن وان، ئەو خەونان ب گێلاس و دوندرمەیێ ڤە دبینن. لێ ل نك مەزنان، ئاریشە یا د وێ چەندێ دا حەزێن وان یێن کو د خەونان دا بجهـ دهێن بارا پتر د ڕازیکەرن، ژبەرکو هەتا ئەم د نڤستی ژی، ئەم چاڤدێریەکا توند ل حەزێن خوە دکەین. لێ چ پێ نەڤێت ئەڤ چاڤدێری و میکانیزما ڤەشارتن و بێدەنگکرنێ ل دەمێ ئەم د نڤستی لاوازترن ژ دەمێ کو ئەم د هشیار، لێ هند بهێزن کو وە ل مە بکەن ئەم د خەونێ دا بابەتێ حەزێ یێ کو ئەم ڕەت دکەین بڤەگوهێزین."

- "ل ڤێرە بۆچی یا گرنگە خەون بهێنە ڕاڤەکرن؟"

- "فرۆید ئاماژەیێ ب گرنگیا جوداهیکرنێ دکەت دناڤبەرا خەونێ "دەمێ ل سپێدەیێ دهێتە بیرا مە" و ڕامانا وێ یا کوور دا. ئەو وێنە و دیمەنێن خەونێ ب "فلم" یان "ڤیدیۆ" یا خەونێن مە بناڤ دکەت، "ناڤەڕۆکا دیار" یا خەونێ و ئەو هەردەم ژێدەرێن خوە د ڕوودانێن دەمێ هشیاریێ دا پەیدا دکەت. لێ خەونێ ڕامانەکا ڤەشارتی هەیە، کو خوە ژ ئاگەهیێ ڕزگار دکەت، ئەو ژی ناڤەڕۆکا ڤەشارتی یا خەونێ یە و دبیت ئەڤ هزرێن ڤەشارتی یێن کو خەون بەحس ژێ دکەت ڤەگەڕنە قۆناغێن گەلەك کوور، دبیت بگەهنە قۆناغا دەستپێکا زارۆکینیێ."

- "ئانکو پێدڤیە خەون بهێتە ڕاڤەکرن داکو د بابەتێ وێ بگەهین."

- "بەلێ. د ڕەوشا نەخوشیا دەروونی دا، پێدڤیە ئەڤ چەندە دگەل نوشدارێ چارەسەرکار بهێتە بجهئینان. لێ نوشدار ب تنێ خەونێ ڕاڤەناکەت، بەلکو ب هاریکاریا نەخوشی ب خوە دێ ب ڤێ چەندێ ڕابیت و د ڤی کاودانی دا، ڕۆلێ نوشدارێ دەروونی دێ وەکو ڕۆلێ داپیرکێ بیت، ئانکو دێ هاریکار بیت د ژ دایکبوونا ڕاڤەکرنا خەونێ دا."

- "تێگەهشتم."

- "فرۆید گوهۆڕینا "ناڤەڕۆکا ڤەشارتی" بۆ "ناڤەرۆکا دیار" ب کارێ خەونێ ناڤدکەت. کو ئەم دشێین بەحسی "یاریا ماسکان" یان "یاریا ئاماژەیان" بکەین سەبارەت بابەتێ ڕاستەڤینە یێ خەونێ، کو دخوازتە وێ چەندێ ڕاڤەکرن ببیتە کار د ئاڕاستەیێ بەروڤاژی دا، ئانکو ڕاکرنا ماسکان و ڕوهنکرنا هەموو ئاماژەیان ژ بۆ ئاشکەراکرنا "ڕامانا" ڤەشارتی ل پشت وان ماسك و ئاماژەیان."

- "بۆ نموونە؟"

- "پەڕتووکا فرۆیدی یا پڕە ژ نموونەیان، لێ ئەم نەشێین نموونەیەکا سادەتر و فرۆیدیتر ببینین. دا هۆسا بدانین کو گەنجەکێ بچووك د خەونا خوە دا دیت دوو پڤدانك ژ کچا مامێ خوە وەرگرتن."

- "و پاشی؟"

- "دێ، پێکۆلێ بکە ڤێ خەونێ ڕاڤە بکە!"

- "ممم .. دا ڤەگەڕینە دەستپێکێ: ناڤەڕۆکا دیار یا خەونێ ئەوە یا تە گوتی: کوڕەك دوو پڤدانکان ژ کچا مامێ خوە وەردگریت."

- "بەردەوام بە .."

- "تە گوتبوو کو ڕەگەزێن "پێکهاتەیێن" خەونێ ژ ڕۆژا پێشتر هاتینە وەرگرتن. ئەم دشێین بێژین ڕۆژا دوهی ئەو ل باخچەیەکێ یاریان بوو یان وی وێنەیێ پڤدانکان د ڕۆژنامەیەکێ دا دیتبوو."

- "ئەڤە دبیت، لێ ل ڤێرە پەیڤا "پڤدانك" ب تنێ بەس بوو، یان هەر تشتەکێ بیرا مرۆڤی ل پڤدانکێ دئینیت."

- "نوکە ژی پێدڤیە ئەم ڕامانا ڤەشارتی یا خەونێ دەربێخین، ئانکو ڕامانا وێ یا کوور. مانە؟"

- "بەلێ، پێدڤیە تو ڕامانا خەونێ ڕاڤە بکەی."

- "دبیت هۆسا ب سادەیی ئەو حەز بکەت وی پڤدانك هەبن."

- "نەخێر، ئەڤە ڕاڤەکرنەکا لاوازە. تو یا ڕاستی کو هزر بکەی خەون حەزەکا ڤەشارتی دڤەشێریت. لێ ل ڤێرە یاکو ڤی کوڕێ گەنج حەز ل سەر هەی نە پڤدانکێن ب دروستاهی نە، ئەگەر وەسا با، پێدڤی ب خەونێ نەدکر."

- "ئەز دبێژم ئەز تێگەهشتم: ئەو حەز ژ کچا مامێ خوە دکەت و هەردوو پڤدانك مەمکێن وێ نە."

- "ئەڤ ڕاڤەکرنە بەرئاقلترە کو دبیت ئەڤ گەنجە هەست ب نەخوشیێ و شەرمێ دکەت ل بەرامبەر هەستێ خوە ل سەر حەزەکا ژ ڤی جۆری."

- "هۆسا هەردەم خەون د ڕێکێن ئالۆز ڕا دچیت، وەکو وێنەیێ پڤدانکان، بۆ نموونە؟

- "بەلێ. بۆ فرۆیدی تێرکرنەکا ڕازیکەر یا حەزێن ڤەشارتی و بێدەنگکری د خەونان دا ئاشکەرا بوو. ئەگەر سروشتێ وان تشتێن ئەم ل ڤی سەردەمی د ناخێ خوە دا دڤەشێرین و بێدەنگ دکەین هاتبیتە گوهۆڕین و نە وەك سەردەمێ فرۆیدی بیت، لێ چێبوون و ڕوهنبوونا خەونێ هەر وەك خوەیە."

- "تێگەهشتم."

- "ئەو شرۆڤەکرنا دەروونی یاکو فرۆیدی ئاشکەراکری، دەنگڤەدانەکا مەزن ل سالێن بیستان ب دووڤ خوە دا ئینا، ب تایبەت د بیاڤێن نوشداریا دەروونی و هەروەسا بیاڤێن دی ژی دا، وەکو بیاڤێ هونەری و ئەدەبی."

- "ئەرێ مەرەما تە ئەوە هونەرمەندان گرنگی دا ژیانا بێئاگەهیێ یا مرۆڤان؟"

- "بەلێ، ل دوماهیا چەرخێ نۆزدێ ئەدەبی خوە ل فرۆیدی و شرۆڤەکرنا دەروونی نەگرت داکو ژیانا ناڤخوەیی یا مرۆڤی بڤەکۆلیت و لێبگەڕیت و فرۆیدی ژ نیشکەکێ ڤە تیورا خوە یا بێئاگەهیێ نەدانایە، بەلکو ل سالا 1890ێ دەست ب ڤەکولینان کربوو.."

- "ئەرێ ب ئاوایەکێ گشتی ئەڤ چەندە تشتەکێ تەڤگر بوو؟"

- "فرۆیدی ب چ ڕەنگان دیارنەکریە کو وی سیماییێن دەروونی ئاشکەرا کرینە، وەکو "ڤەشارتن و بێدەنگکرن" و "کریارێن نە مەرەمدار" و "هێجەتگرتن"، هتد. لێ ئەو یەکەم کەس بوو ئەڤ ئەزموون د نوشدارا دەروونی دا بکارخستین. ئەو ب ئاستەکێ نایاب د پشتەڤانیکرنا نامەیا خوە یا دکتورایێ دا بسەرکەڤت ئەو ژی ب پێشکێشکرنا نموونەیێن ئەدەبی کو تیوریا وی یا تایبەت ڕۆهن دکر. لێ هەروەکو من گوتی کاریگەریا وی یا مەزن ل سەر هونەری و وێژەی ل سالا 1920ێ دەستپێکر."

- "چەوا؟"

- "نڤیسەر و هونەرمەندان پێکۆلکرن ڤان هێزێن نەهەستپێکەر د کارێن خوە یێن داهێنەر دا دەربێخن. و ئەڤ چەندە ب تایبەت ژ سوریالیستان دگریت."

- "کێ؟"

- "سوریالیزم" هەروەکو ژ ناڤێ وێ دیار بەحسی جیهانەکا د سەر کەتواری دا دکەت. ل سالا 1924ێ ئەندرێ برێتۆنی بەیاننامەیا "مانیفستو"یا یەکێ یا سوریالیزمێ بەلاڤکر و تێدا ڕاگەهاند کو پێدڤیە هونەر ژ بێئاگەهیێ چێببیت و دەربکەڤیت و ل سەر هونەرمەندی پێدڤیە ئاماژەیێن ئازادتر وێنەیێ خەونان ببینیت و بەرەڤ "سوریالیزم"ێ ڤە بچیت کو تێدا چ سنوور دناڤبەرا خەونێ و کەتواری دا نینن و پێدڤیە هونەرمەند خوە ژ وێ چاڤدێریێ قورتال بکەت یاکو ئاگەهی ل سەر مرۆڤی دسەپینیت، داکو بیاڤەکێ ئازاد ل پێش ئاشۆپا خوە بهێلیت و پێشوازیێ ل وان پەیڤ و وێنەیان بکەت یێن کو بۆ وی دهێن."

- "تێگەهشتم."

- "فرۆیدی سەلماند هەموو خەلك ب ڕەنگەکی ژ ڕەنگان هونەرمەندن. خەون ب خوە ژی کارەکێ هونەری یە و ئەم هەر شەڤ خەونان دبینین. ئەو نەچار بوو پەنایێ ببەتە بەر هژمارەکا هێمایان داکو بشێت خەونێن نەخوشێن خوە ڕاڤە بکەت. هەروەکو ئەم تابلۆیەکێ هونەری یان دەقەکێ نڤیسینێ یێ ئەدەبی شرۆڤە دکەین."

- "ئەرێ ڕاستە کو ئەم هەر شەڤ خەونان دبینین؟"

- "دوماهیك ڤەکۆلین د ڤی بیاڤی دا ئاماژەیێ ب وێ چەندێ دکەن کو ئەم بیست ژ سەدێ ژ دەمێ نڤستنا خوە خەونان دبینین، ئانکو ڕۆژانە دوو بۆ سێ دەمژمێران. ئەگەر ئەم تووشی نەخوشیەکێ یان ئیزعاجەکێ بووین ل دەمێ ئەم د ڤۆناغەکا خەونێ دا، دێ ژ خەو ڕابین و ئەم د تۆڕەینە. ئانکو هەموو کەس ژ دایکبووینە و وان پێدڤیەکا زکماکی هەیە کو دەربڕینەکا هونەری بدەنە هەبوونا خوە. ئەم ب خوە کەرەستەیێ خەونێن خوەینە، ئەم د ژیانا خوە یا ڕۆژانە دا ل دووڤ هندەك پێکهاتەیان دگەڕین داکو د چێکرنا خەونێ دا بکاربینین و ئەم ب هەموو ڕۆلان ڕادبین. ب دەربڕینەکا دی، ئەو کەسێ دبێژیت کو ئەو گرنگیێ ب هونەری نادەت، ئەو کەسەکە خوە باش نانیاسیت."

- "یا ڕوهنە."

- "زێدەباری ڤێ چەندێ فرۆیدی ب شارەزایی گرنگیا ئاگەهیێ ل نك مرۆڤی سەلماند کو کارکرنێن وێ ل سەر چارەسەرکاریێن جێبەجێکار گەهشتنە ڕازیبوونا وێ ئەو ژی ب وی رەنگی کو هەر تشتەکێ مە دیتی و تێدا ژیاین د جهەکێ ژ جهان دناڤا ئاگەهیا خوە دا دڤەشێرین. د شیان دایە جارەکا دی ئەڤ تشتە سەربکەڤن و ل سەر ڕوویێ ژ دەرڤە دیار ببن. ئەڤجا دەمێ ئەم دبێژین "ئەڤە بیرا مە ل تشتەکی دئینیت" یان ئەڤ گرێ یە یاکو دبێژیت "یا ل سەرێ ئەزمانێ من" یان ژی "ئەڤ تشتە بۆ بیردانکا من ڤەدگەڕیت"، ئەم چ ناکەین ژ بلی دەربڕینێ ژ وێ ڕێیا هەر تشتەکێ ڤەشارتی د بێئاگەهیێ دا گرتیە بەر و ل دوماهیێ دەرگەهەکێ ڤەکری دیتی و دەربازبووین و گەهشتینە ئاگەهیێ."

- "هندەك جاران کار باش بڕێڤە ناچن ..."

- "هەموو هونەرمەند ڤێ چەندێ باش دزانن، بەلێ ئەگەر ژ نیشکەکێ ڤە هەموو چەکمەچی و دەرگەهێن ئەرشیڤی ڤەببن و هەموو تشت ئەو ب خوە ژێ بکەڤن، دێ هەموو

وان پەیڤ و وێنەیان بینین یێن کو ئەم د پێدڤی. ئەڤ چەندە ڕوودەت دەمێ ئەم پەڕدەیێ ل سەر بێئاگەهیێ ڕادکەین، دبێژنە ڤێ چەندێ سروش "وەحی"، کو هۆسا هەست دکەین ئەو تشتێ ئەم دنڤیسین یان وێنە دکەین ژ ناخێ مە ب خوە ناهێت."

- "چ پێ نەڤێت هەستەکێ جوانە."

- "چ پێ نەڤێت تو د ڤی هەستی دا ژیایە. ئەم دشێین چاڤدێریا ڕەفتارا زارۆکان بکەین دەمێ گەلەك دوەستیێن، هۆسا دیار دکەن کو د نڤستینە و چاڤێن وان د ڤەکرینە، ل وی دەمێ دئاخڤن هندەك پەیڤان دبێژن کو پێشتر فێرنەبووینێ. د ڕاستی دا ئەڤ پەیڤ و هزر و بیرە د ئاگەهیا وان دا نەبوون ب تنێ د بارودۆخێ ڤەشارتی دا نەبیت و ئەو پەیڤە دەرناکەڤن ب تنێ ل وی دەمی نەبیت دەمێ هەموو تشتێن قەدەغە کر یان هوشداریان ژبیر دکەن. ڕەوشا هونەرمەندی ژی ب هەمان ئاوایە: پێدڤیە ئەقلێ خوە یان هزرکرنا خوە قەدەغە نەکەت ژ ڤەبوونا کارڤەدانەکا نەهەستپێکەر د ناخێ خوە دا. ئەرێ تە نموونەیەك ل سەر ڤێ چەندێ دڤێت؟"

- "چ پێ نەڤێت."

- "چیڕۆکەکا گەلەك مەترسیدار و خەمگینە."

- "گوهێ من باش یێ ل تە .."

- "جارەکێ گیانەوەرێ چلوچوار پێی* دزانی ب باشی و شارەزایی سەمایێ بکەت، دەمێ سەما دکر هەموو گیانەوەرێن دارستانێ دهاتن دا تەماشە بکەن و دەربڕینێ ژ داخباربوونا خوە بکەن، ب تنێ کیسەلە نەبیت."

- "چ پێ نەڤێت ئەو یا دلپیسە."

کیسەلەیێ پرسیار ژ خوە کر" "دێ چ کەم داکو چلوچوار پێ جارەکا دی سەمایێ نەکەت؟."

- "ئەو ب تنێ بەس نینە بێژیت کو ئەو حەز ژ شێوازێ وێ یێ سەمایێ ناکەت و قەت نەشێت بێژیت کو ئەو ژ وێ باشتر دلەیزیت، ئانکو دێ بیتە جهێ ترانەپێکرنێ. ئەڤجا پێدڤیە پلانەکا دوژمەهی بدانیت."

---

* حریشە Centipede

- "زوو بێژە .. ئەو چیە .."

- "کیسەلەیێ نامەیەك بۆ چلوچوار پێی نڤیسی و تێدا گوت: "ئەی چلوچوار پێیا تاك و بێ وێنە! ئەز گەلەك داخبارا هونەرێ تە یێ سەرنجڕاکێش یێ سەمایێ مە. من دڤێت پرسیار ژ تە بکەم: تو چ دکەی دەمێ تو دلەیزی و سەمایێ دکەی؟ ئەرێ تو پێ خوە یێ چەپێ ژمارە 28 ڕادکەی و پاشی پێ خوە یێ ڕاستێ ژمارە 39 ڕادکەی؟ یان تو پێ خوە یێ چەپێ ژمارە 17 ڕادکەی بەری پێ خوە یێ ڕاستێ ژمارە 44 ڕابکەی؟ ئەز یا ل هیڤیا بەرسڤا تە. دگەل ڕێز و سلاڤێن من. کیسەلە."

- "ئانکو هۆسا!"

- "دەمێ چلوچار پێیێ نامە وەرگرتی، ژ نوو پرسیار ژ خوە کر و هزرێن خوە کرن کا ئەرێ ئەو ب دروستی چ دکەت دەمێ دلەیزیت، کیژ پێی ل دەستپێکێ ڕادکەت؟ پاشی کیژ پێ دی ڕادکەت؟"

- "تو دبێژی چ چێبوو؟"

- "ئەز دبێژم ئێدی ئەو نەشیا بلەیزیت."

- "ئها ئەڤە چێبوو و ئەڤ چەندە ڕوودەت دەمێ هزر و ئەقلێ مرۆڤی، ئاشۆپێ دووڕپێچ دکەن."

- "تو دشێی بێژی ئەو چیرۆکەکا خەمگینە وتراژیدیە!"

- "ژ بۆ هەر هونەرمەندەکی فەرە "خوە ئازاد بکەت". ئانکو تشتێن وەسا دیار بکەن هەروەکو ژ دەڤ خوە ب خوە دهێن. کاغەزەکا سپی بینیت و هەر تشتەکێ دهێتە سەر هزرا وی داڕێژیتە سەر. دبێژنە ڤێ چەندێ نڤیسینا ئوتۆماتیکی، ئەڤە ژی دەربڕینەکا وەرگرتیە ژ "ئامادەکرنا گیانی" کو دبێژیت گیانێ مرۆڤێ مری هەر دمینیت و دشێت بڤەگەڕیت و حەزا خوە پڕ بکەت ب ڕێیا ناڤبژیڤانان. لێ ئەز دبێژم ئەم دێ سباهی ل ڤی بابەتی ڤەگەڕین."

- "هەروەکو تە بڤێت."

- "هونەرمەندێ سوریالیست ب خوە ژی و ب ڕێیا خوە خالا گەهینەرە یان ناڤبژیڤانە بۆ ئاگەهیا خوە، لێ چ گومان تێدا نینە کو ڕەگەزەکێ بێئاگەهیێ د هەر کریارەکا داهێنانێ دا هەیە. ئەرێ پا "داهێنان" د ڕاستیێ دا چیە؟"

- "ب دروستی نزانم. لێ مانه هەر تشتەکێ نوو یە یێ کو ئەم دداهێنین؟"

- "ڕاستە، بەلێ و ئەڤ چێکرنە ب خوە ئەنجامێ هەڤکاریەکا بیرتیژانەیە دناڤبەرا ئاشۆپێ و ئەقلی دا. لێ هندەك جاران ئەقل بێهنا ئاشۆپێ چك دکەت و ئەڤە ژی مەترسیەکا مەزنە چونکی بێ ئاشۆپ هیچ تشتەکێ نوو ناهێتە بەرهەمئینان. ئاشۆپ د کەتواری دا هەروەکو سیستەمەکێ داروینی یە."

- "ببورە، ل ڤێرە ئەز تێنەگەهشتم .."

- "داروینیزم دسەلمینیت کو سروشت زنجیرەیەکا گوهۆڕینێن نەلۆژیکی یە کو ب تنێ هندەك ژ وان دشێن بەردەوام بن ژبەرکو سروشتی د وی دەمی دا پێدڤی ب وان هەیە."

- "باشە و پاشی .."

- "هەمان تشت ڕوودەت دەمێ ئەم هزرا خوە دکەین و هزرێن نوو بۆ مە دهێن، کو هزرەك هزرەکا دی یا گوهۆڕی د ئاگەهیێ دا پاشڤەدبەت، ب مەرجەکی ئەم چاڤدێریەکا توند ل سەر خوە نەکەین."

- "بەلێ ب تنێ هندەك ژ ڤان هزران مفای دگەهیننە مە. ژبەر هندێ ئەقل مافێن خوە ڤەدگەڕینیت و ب ڕۆلەکێ گرنگ و سەرەکی ڕادبیت."

- "ئەڤجا دەمێ ئەم ڤەڕێژا ڕۆژەکێ ل سەر مێزێ دڤاڤێرین، پێدڤیە ئەم ب کریارا ژێگرتن و هەلبژارتنێ ڕاببین."

- "ئەڤە هەڤبەرکرنەکا ئاسایی یە."

- "هزرا خوە د وێ ساتێ دا بکە دەمێ هەر تشتەکێ دهێتە سەر هزرا مە ب دەنگەکێ بلند بێژین یان هەموو تێبینیێن ئەم د دەفتەرا خوە یا ڕۆژانە دا دنڤیسین بەلاڤ بکەین یان بکەینە د بنێ چەکمەچیەکا خوە دا، ل وی دەمی دێ جیهان ل ژێر کارتێکرنا هزرێن بێمەبەست ژناڤ چیت. و پاشی هیچ کریارەکا "ژێگرتنێ" نابیت."

- "و ئەقل ب ڤێ کریارا ژێگرتنێ ڕادبیت دناڤبەرا هەموو هزرێن دهێنە سەر مێشکێ مە؟

- "بەلێ، ما تو وەسا هزر ناکەی؟"

- "بێگومان ئەقل تشتێن نوو چێدکەت، لێ ئەو ب خوە بڕیارێ نادەت کا پێدڤیە چ تشت ژ وان بمینیت. ئەو ب خوە ب کریارا "پێکئینانێ" ناڕابیت، پێکئینان کو ڕاستیا هەر

کارەکێ هونەری یە، بەرهەمێ هەڤکاریەکا جوانە دناڤبەرا ئاشۆپێ و ئەقلی دا و دناڤبەرا هەستی و هزرکرنێ دا. د هەر پرۆژەیەکێ داهێنانکار دا، ڕەگەزەکێ بێ مەرەم هەیە "ئانکو ژ نیشکەکێ ڤە دهێت و بێ کو مەرەمەك هەبیت". ژبەر هندێ ژی د قۆناغەکا دەستنیشانکری دا یا گرنگە تو ئازادیێ بدەیە ئاشۆپێ. گەر مە ڤیا پەزێ خوە بپارێزین، هینگێ ئەم د نەچارین بهێلین بەربەلاڤ ببن."

ئەلبێرتۆ پیچەك بێدەنگ ما، پاشی د پەنجەرێ ڕا تەماشەی ژ دەرڤە کر.. سۆفیایێ ژی د دووڤ دا سەحکرە ژ دەرڤە کو کومەکا مەزن ژ کەسایەتێن والْت دیزنی ل سەر کنارێ دەریاچەیێ دیتن، سۆفیایێ کرە هەوار.

"ئەڤە گۆفی یە... ئەڤە ژی دۆنالْد و برازایێن خوەنە. دیزنی و قارەمانێن جیهانا خوە .. ئەرێ تە گوهـ لێ هەیە ئەلبێرتۆ؟ .. ئەڤە میکی ماوسە .."

ئەلبێرتۆ لێ زڤڕی و گوتێ: "ئەڤە تشتەکێ بێزارە."

- "تە دڤێت چ بێژی؟"

- "ئەم یێن دبینە قوربانیێن مایجەری دەمێ پەزێ خوە بەرددەت. لێ ئەڤە شاشیا منە. من دەست ب گوتنا هەر تشتەکێ هاتیە سەر هزرا وی کر."

- " لوومەی خوە نەکە."

- "من ڤیا بێژم ئاشۆپ ژی ژ بۆ مە فەیلەسۆفان یا گرنگە، پێدڤیە ئەم دەست پێ بکەین داکو بشێین هزرێن نوو ببینین. لێ نوکە کار ژ دەستان دەرکەڤت."

- "ژ بۆ خوە نەکە خەم."

- "من ڤیا بەحسی گرنگیا هزرکرنێ بکەم ب مەژیەکێ ئارام. نوکە ئەو یێ قەرەبالغا بووکێن خوە بۆ مە فرێدکەت! ئەڤ زەلامە کەسەکێ بێ هەستە! .."

- "ئەرێ تو ب ترانە ڤە وە دبێژی؟"

- "ئەو یێ ترانەیان دکەت، نە ئەز، من پلانا خوە یا ل سەر دانای.

- "ئەز د مەرەما تە ناگەهەم."

- "مە بەحسی خەونان کربوو. د ڤێ چەندێ دا ترانەیەك هەیە، ئەم د ئاشۆپا مایجەری دا ب تنێ هندەك بوونەوەرێن ئاشۆپی نە؟"

- "ئۆف .."

- "ئەوی ژ قەستا وەکر، لێ وی تشتەکێ گرنگ ژبیرکر."

- "ئەو چ تشتە؟"

- "دبیت ئەو باش ل خەونا خوە یێ ب ئاگەهە، چونکی ئەو ل هەموو گەنگەشە و کریارێن مە یێ ب ئاگەهە. هەروەکو خەونبین "ئەو کەسێ خەونێ دبینیت" ناڤەرۆکا دیار یا خەونا خوە ل بیرا خوە دئینیت. ئەو ب خوەیە یێ کو پێنڤیس ب دەستێ خوە هەلگرتی، لێ ئەڤە رامانا وێ چەندێ نادەت کو ئەو بەردەوام یێ هشیارە."

- "جارێ راوەستە! مەرەما تە پێ چیە؟

- "ئەو هزرێن ڤەشارتی یێن خەونێ نزانیت. ئەو ژبیر دکەت کو ئەڤە هەموو ب تنێ خەونەکا ماسکدارە."

- "تو یێ هندەك تشتێن سەیر دبێژی."

- "ئەڤە بۆچوونا مایجەری ژی یە. لێ ئەو بۆچوونا خوە دپەژرینیت ژبەرکو ئەو زمانێ تایبەت یێ خەونا خوە نزانیت. ئەڤە ژ بۆ مە باشترە کو ب کێمی ئازادیا لڤینێ ددەتە مە. ب ڤێ رێکێ ئەم دشێین خوە ژ ئاگەهیا مایجەری ڤورتال بکەین. هەروەکو وان مشکێن ئاڤێ یێن کو دێ ل دوماهیێ دشێن ژ کونێن خوە دەرکەڤن و روویێ رۆژێ بینن د رۆژەکا هاڤینی یا جوان دا."

- "ئەرێ تو دبێژی ئەم دێ گەهینە وێ چەندێ؟"

- "پێدڤیە بگەهینێ، د هەیاما چەند رۆژان دا دێ ئاسۆیەکێ نوو دەمە تە، ل وی دەمی مایجەر نەشێت ڤە جهێ مشکێن خوە یێن ئاڤێ بکەڤیت و کا دێ کەنگی دیار بنەڤە."

- "بەلێ پا تاکو وی رادەی ئەم ب تنێ وێنەیێن خەونەکێ بین، لێ ئەز هەر کچا مرۆڤەکی مە. نێزیکی دەمژمێر پێنجە، پێدڤیە ئەز ڤەگەرمە مال داکو خوە ژ بۆ ئاهەنگا شەڤێ ئامادە بکەم."

- "ئەرێ تو دشێی د رێیا خوە دا ژ بۆ من خزمەتەکا بچووك بکەی؟"

- "چیە؟"

- "پێكۆلێ بكە سەرنجا وی بڕاكێشی، دێ یا باش بیت گەر بشێی وی نەچار بكەی ب درێژاهیا ڕێكێ چاڤدێریا تە بكەت، پێكۆلێ بكە هزرا خوە د وی دا بكەی، ل وی دەمی ئەو ژی دێ نەچار بیت هزرا خوە د تە دا بكەت."

- "و چ مفا د ڤێ چەندێ دا هەیە؟"

- "دێ ژ بۆ من گۆرەپانێ ڤالا هێلیت، داكو دوماهیك كارێ خوە ل سەر پلانا مە یا نهێنی تەمام بكەم."

- "دێ چمە دناڤ بێئاگەهیا مایجەری دا و دێ مینمە تێدا تاكو هەڤدیتنا مە یا بهێت."

# سەردەمێ مە یێ نوکە

...مرۆڤ یێ هاتیە پابەندکرن یێ ئازاد بیت...

دەمژمێر ببوو 11:55 شەڤێ دەمێ.هێلدێ خوە ل سەر تەختی درێژ کری و تەماشەی بانێ ژوورێ کری. وی پێکۆل کر هزروبیرێن خوە دووبارە رێکبێخیت. هەردەمێ دگەهشتە دوماهیا ڤێ زنجیرەیا هزران، پرسیار ژ خوە دکر کا بۆچی ئەو نەشێت بەشێن ماین بخوینیت و ب دوماهی بینیت.

ئەرێ تو بێژی تشتەك هەبیت ئەو پێکۆلێ دکەت بێدەگ بکەت؟

ئەگەر ئەو شیابایە زێرەڤانیا چ تشتان نەکەت، رەنگە ئەو شیابایە ب چاڤێن ڤەکری ڤە خەونان ببینیت، لێ خو هزرکرن ژی د ڤی بابەتی ئەو دترساند.

هەردەمێ وێ بێهنا خوە ڤەدابایە و هزرێن خوە بەربەلاڤ کربان، دا هزرا وێ چیتە سەر هندێ کو یا ل سەر کنارێن دەریاچەکێ، یان دناڤ کۆلکێ مایچەری یان ژی دناڤ دارستانا دەوروبەری کۆلکی.

ئەرێ ئەلبێرتۆی ل بەرە چ پلان بدانیت؟ چ پێنەڤێت بابێ وێ بڕیار یا دای تشتەکی ب ئەلبێتوی بدەتە کرن. ئەرێ بابێ وێ بەری هینگێ دزانیت کا ئەلبێرتۆ دێ چ پلان دانیت؟ ما بەلکو ئەو پیچەکێ وی ب تنێ بهێلیت داکو ب ئازادی رەفتاری بکەت، لێ هەر تشتێ ل دوماهیێ رووبدەت، رەنگە بۆ بابێ وێ ژی ببیتە سوپرایز.

گەلەك لاپەڕ نەمابوون هێلد ڕۆمانێ ب دوماهی بینیت. تو بێژی ئەو ب دزیکی ڤە تەماشەی لاپەڕێ دوماهیێ بکەت کا دێ چ ل چیرۆکێ هێت؟ نەخێر، ئەڤ چەندە دێ بیتە قوپیا. وەکو دی ژی ئەو نە یا پشتڕاستە کا ل وێرێ چیرۆك دێ ب دوماهی هێت یان نە.

د ڕاستی دا، بیرۆکەیەکا سەیر بوو! چونکی نوکە فائیلە یا ل بەر دەستێ وێ و ئێدی بابێ وێ نەشێت چ تشتان تێدا کێم و زێدە بکەت یان بگوهۆڕیت، لێ ب مەرجەکی هەکە ئەلبێرتۆ چ پلانێن نهێنی نەدانیت و دەستپێشخەریەکێ بکەت و بابەتی سەروبن بکەت.

ژ لایێ خوە ڤە، هێلد دێ هندەك سوپڕایزان بۆ بابێ خوە چێکەت، ژبەرکو نوکە بابێ وێ چ زێرەڤانی و سانسور ل سەر وێ نینە، لێ ئەرێ هێلدێ ب خوە سانسورەکا تەمام ل سەر خوە هەیە؟ ئەرێ ئاگەهی چیە؟ ئەرێ ما ل ڤێرێ ئەو دەستێ خوە بۆ یەك ژ مەزنترین نهێنییێن گەردوونی درێژ ناکەت؟ باشە پا بیردانك چیە؟ ئەو چ تشتە وەل مە دکەت بیرا خوە ل هەر تشتەکی بینین یێ مە دیتی یان هەر سەربۆرەکا ژیانێ یا مە بوراندی؟"

ئەرێ چەوا هەرشەڤ دیمەنەکێ سینەماییێ یێ کەسایەتی دناڤ خەونێن مە دا دهێتە پێشکێکرن؟ دەمێ هێلد ب کووری دناڤ ڤاڤ هزران دا نقووم بووی، وێ بەردەوام چاڤێن خوە دگرتن و ڤەدکرن هەتا ل دوماهیێ ژبیرکری جارەکا دی ڤەکەت و چوویە د خەوەکا کوور دا.

دەمێ ل دووڤ ڤیژڤیژا دەنگێ باڵندەیێن نەورەس یێن برسی هشیاربووی، دەمژمێر 6:66 خولەك بوو. ئەرێ ئەڤە چ ژمارەیا سەیرە! وەکو هەرجار، هێلد ژ سەر جهێن خوە ڕابوو ڤە و چوو د پەنجەرکێ دا و تەماشەی دەریاچێ کر. ئەڤ ڕەفتارا وێ یا ڕۆژانە وەك نەریتەکی لێ هاتبوو. هەموو زڤستان و هاڤینان وەدکر.

ژ نیشکەکێ ڤە هزرکر سەرێ وێ تژی بوو ژ ڕەنگان، ژبەرکو ئەو خەونا بەری هینگێ دیتی هاتە پێشچاڤێن وێ. ب ڕاستی ژی ئەو دیمەنێن د هاتینە پێشچاڤێن وێ ژ خەونەکێ پتر بوون، چونکی گەلەك ب سانەهی و ڕۆهنی هەموو تشت دهاتنە سەر هزرا وێ.

**وێ د خەونێ دا ددیت بابێ وێ ژ لوبنانێ زڤڕی، لێ خەونا وێ هەموو درێژەپێدان بوو ب وێ خەونا بەری هینگێ سۆفیایێ دیتی، ئانکو دەمێ سۆفیایێ هێلد د خەونێ دا دیتی کو یا ل سەر لێڤا بەندەری ڕاوەستیایە و پاشی دەمێ خاچا وێ یا زێڕی دیتی.**

**هەروەکو د خەونا سۆفیایێ دا، هێلد ل سەر بەندەری یا ڕاوەستیای بوو و گوهـ ل دەنگەکێ نزم بوو کو دگوتێ: "هێلد، ئەڤە ئەزم سۆفیا". وێ پێکۆل کر خوە نەلڤلڤینیت بەلکو بشێت بزانیت کا ئەو دەنگ ژ کیژ ئاڕاستەی دهێت. "تە گوهـ ل من هەیە، هێلد، تو ل کیڤەی، ما تو یا کەری یان کورەی". پشتی هینگێ ب دەمەکێ کێم بابێ وێ دناڤ گۆڕەپانێ دا دیاربوو و ڤاتەکا لەشکەری یا نەتەوەییێن یەکگرتی ل بەر بوو و ب دەنگەکێ بلند گازی دکری: "خوشتڤیا من، هێلد". ژ جهێ خوە ڕابووڤە و بەرەڤ بابێ خوە ڤە چوو و هەمبێز... پاشی خەون ب دوماهی هات.**

**ژ نیشکەکێ ڤە، دێڕێن شعرەکا شاعرێ نەرویجی "ئارنولف ئوڤرۆلاند"ی هاتنە بیرا وێ دەمێ دبێژیت[*]:**

**شەڤەکێ، ژبەر خەونەکا سەیر هشیاربووم.**
**دەنگەکێ بەرزە دگەل من دئاخفت**
**یێ دوور بوو، وەکو کانیەکا دناڤ ژکێ ئەردی دا**
**ئەز ڕابووم و پرسیار کر: تە چ ژ من دڤێت؟**

**هێشتا هێلد ل بەر پەنجەرێ یا ڕاوەستیای بوو دەمێ دایکا وێ هاتیە د ژوور ڤە.**

- **"چاوا؟ تو هێشتا یا هشیاری؟"**
- **"ئاها ئەز ژی هێشتا نە یا پشتڕاستم کا ئەزا نڤستیمە یان هشیار."**

---

[*] دەقێ هوزانێ یێ ئینگلیزی:

Wakened one night by a curious dream
and a voice that seemed to be speaking to me
like a far-off subterranean stream
I rose and asked: What do you want of me?

- **"باشه وەکو هەر جار، ئەز دێ ل دەمژمێر چواری ئێڤاری ژ سەر کاری زڤرم."**
- **"باشه."**
- **"هیڤیا من ئەوە تو خوشیێ ژ بێهنڤەدانا خوە وەربگری."**
- **"سوپاس. بخێرهاتی."**

**هێشتا دایکا وێ دەرگەهـ باش نەگرتی، هێلد بلەز چوو سەر جهێن خوە دووبارە دەست ب خواندنا ڕۆمانێ کر.**

**ئەز دێ چمە دناڤ بێئاگەهیا مایجەری دا و هەتا دیدارا مە یا بهێت دێ دناڤ دا مینم. ب ڤی ڕەنگی، وێ دەست ب خواندنێ کر، لێ ب هاریکاریا تبلا خوە یا چەپێ کو ڕەخەکێ پەڕتووکێ ڕومانێ گرت بوو، هێلدێ هەستپێکر گەلەك پەڕ نەماینە ئەو ب دوماهی بینیت.**

دەمێ سۆفیا ژ کۆلکێ مایجەری دەرکەفتی، هندەك کەسایەتیێن چیرۆکێن والت دیزنی دیتن کو هێشتا ل سەر کنارێ دەریاچێ بوون، لێ چەند ئەو پتر نێزیکی وان دبوو، کەسایەتی هێدی هێدی د حەلیان هەتا ل دوماهیێ ئەو گەهشتیە دەڤ بەلەمێ، هەموو حەلیابوون.

ب درێژاهیا ڕێکێ و هەتا گەهشتیە لایێ دی یێ ئاڤێ و وەریسکێ بەلەمێ گرێدای، وێ بەردەوام لڤینێن سەیر دکرن داکو سەرنجا مایجەرێ بۆ خوە بڕاکێشیت و دەلیڤەیەکا درێژتر بدەتە ئەلبێرتۆی داکو خوە دناڤ کۆلکی دا ڤەشێریت.

دەمێ گەهشتیە سەر ڕێکا ئاخێ ژی، وێ جار جارە خوە بلند دکرە بەر ئەسمانی و پاشی پێکۆل کر وەکو ڕۆبوتەکی ب ڕێڤە بچیت و ل دووڤ دا دەست ب سترانگوتنێ کر و ل دوماهیێ ژی ب دەنگەکێ نزم ستران گوتن.

پاشی بۆ ماوەیەکی ڕاوەستیا و هزرا خوە د پلانا ئەلبێرتۆی دا دکر، ئەرێ تو بێژی نوکە ئەو چ پلان بداڕێژیت؟ لێ هەر زوو هەست ب شاشیێ کر و ژ بۆچوونا خوە لێڤەبوو. ژبەر هندێ سوواری دارەکێ بوو هەتا گەهشتیە سەرێ وێ، لێ دەمێ گەهشتیە گوپیتکا دارێ،

ڤێجا ما ئاسێ و نەشیا بهێتە خوارێ. لێ نابیت ئەو براوەستیت و دەستان بداهێلیت، داکو مایجەر ژ وێ بێزار نەبیت و بەرەڤ ئەلبێرتۆی ڤە نەچیت.

وێ پێن خوە لێکددان، هەروەکو دا بێژی وێ دوو پەر پێن هەین و یا دفریت، پاشی دەست ب ڤێژ ڤێژێ کر و وەکو دیکلی ب دەنگەکێ بلند گوت "کوکوکو". هەرچەندە ئەڤە یەکەم جار بوو ئەو زاری دەنگێ گیانەوەران ڤەکەت، لێ دگەل هندێ یا ژ زارڤەکرنا خوە ڕازی بوو.

وێ پێکۆل کر ب ڕێکا تایەکێ دی بهێتە خوارێ، لێ هۆسا دیارە ئەو یا ئاسێ بووی و دناڤبەرا چەڤێن دارێ دا یا هاتیە دوورپێچکرن. پشتی هینگێ قازەك ل سەر چەڤێ وێ دارێ ڕوونشت یێ سۆفیایێ خوە پێڤە گرتی، لێ ژبەرکو بەری هینگێ سۆفیایێ گەلەك کەسایەتیێن والێت دیزنی دیتبوون، ژبەر هندێ بۆ وێ نە یا سەیر بوو دەمێ قازێ دەست ب ئاخفتنێ کری.

- "ناڤێ من مارتنە و ئەز قازەکا کەهی مە، لێ تایبەت ژبەر تە ئەز دگەل قازێن لوبنانێ یێن کیڤی یا هاتیمە ڤێرێ، چونکی مە زانی تو پێدڤی ب هاریکاریێ داکو بشێی بچیە خوارێ."

- "بەلێ پا تو گەلەك یا بچووکی، دێ چەوا شێی هاریکاریا من کەی؟"

- "گەلەك زوو بڕیارێ نەدە خاتین، ئەز نە گەلەکا یا بچووکم، بەلکو تو گەلەك یا مەزنی."

- "ما چ جوداهی هەیە. ئەنجام هەروەکو یەکە."

- "بۆ زانینا تە، من زارۆکەکێ بچووك کو ژیێ تە دا بوو، ژ بیستانەکێ هەلگرت و دانا سەر پشتا خوە و دناڤ هەموو ئەردێن سویدێ دا گێڕاند. ناڤێ وی نیلز هۆلگرسن بوو."

- "لێ ژیێ من پازدە سالن."

- "ژیێ نیلزی چواردە سال بوون. نە یا گرنگە ژیێ تە سالەکێ پتر یان کێمتر بیت."

- "باشە تو چەوا شیای وێ ب هەلگری."

- "من تەپەك ل سەرێ وی دا و گێژ بوو. دەمێ هشیاربووی، قەبارێ وی هندی بۆستەکێ یان ژی ئینجەکێ لێ هاتبوو."

- "باشه. پا دێ تەپەکێ ل سەرێ من ژی بدە، چونکی من نەڤێت هەتا هەتایێ ل سەر ڤێ دارێ بمینم. وەکو دی ژی ئەز یا بەرهەڤیێن ئاهەنگەکا فەلسەفی ل ڕۆژا شەمبیا بهێت دکەم."

- "ها بگرە! ئەڤ تشتێ تە گوتی بۆ من یێ گرنگ بوو! من گرتی ئەڤەژی پەڕتووکەکا فەلسەفی یە. دەمێ نیلز ل سەر پشتا من و ئەز ل سەر ئەردێ وەلاتێ سویدێ دفڕیم، چاڤێ نیلزی ب ژنەکا دانعەمر کەفت و دگەل ئاخفت. وێ ژنێ د ژیانا خوە هەموویێ دا خەون ب هندێ ڤە ددیتن پەڕتووکەکێ بۆ قوتابیان ل دور وەلاتێ سویدێ چێکەت کو ببیتە پەڕتووکەکا کەتواری و فێرکاری، دەمێ نیلزی سەرهاتییێن خوە بۆ ڤەگێڕاین، وێ بڕیار دا سەرهاتییێن نیلزی ل سەر پشتا قازێ بکەتە ناڤەرۆکا پەڕتووکا خوە."

- "هزرەکا جوانە."

- "ئەز دبێژم جۆرە شکاندنەك د ڤێ چەندێ دا هەبوو. چونکی ئەم هەردوو د ڤێ پەڕتووکێ دا بووین."

سۆفیایێ هەست ب شەقەکا هێدی ل سەر ڕوویێ خوە کر. هێدی هێدی قەبارێ وێ بچووك بوو هەتا ئەو دار ل بەر وێ هندی دارستانەکێ لێ هاتی و قاز ژی هندی هەسپەکی.

قازێ گوت: "دێ وەرە! نوکە تو دشێی بهێیە سەر پشتا من."

سۆفیایێ چەند پێنگاڤەك ل سەر چەقێ دارێ هاڤێتن و پاشی خوە هاڤێتە سەر پشتا قازێ. هەرچەندە پەڕێن وێ گەلەك د نەرم بوون، لێ ژبەرکو سۆفیا گەلەك یا بچووك بوو، هندەك داڤێن پەڕێن وێ گلیزانکێن وێ ڤەدکرن و دچوونە د لەشێ وێ ڕا.

هێشتا وێ باش خوە نەگرتی، قاز بلند بوو بەر ئەسمانی. سۆفیایێ ژی جار بۆ جارێ سەرێ خوە خوار دکر و تەماشەی دەریاچێ و کۆلکی دکر و هزرا ئەلبێرتۆی دکر کا ئەرێ نوکە وی پلانا خوە یا نهێنی ب دوماهی ئینایە یان نە.

قازێ پەڕێن خوە لێکدان و گوت: "ئەم دێ چینە گەشتەکێ بچووك."

پاشی ل بنێ وێ دارێ دادا یا سۆفیا ل سەر ئاسێ بووی. سۆفیایێ ژی خوە ل سەر پشتا وێ خشاند و چەند جارەکان ل سەر گیای تەحسی هەتا ل دوماهییێ جارەکا دی ڤەبارێ وێ وەکو بەرێ لێ هاتیە ڤە.

قاز دوو سێ جارەکان ل دور سۆفیایێ زڤڕی. وێ ژی گوت: "گەلەك سوپاس بۆ هاریکاریا تە."

- "چ زەحمەتی بۆ من تێدا نەبوو. ئەرێ تە بەحسێ پەڕتووکەکا فەلسەفی نەدکر؟"
- "نەخێر ئەز نەبووم، بەلکو تە بەحسێ وێ پەڕتووکێ دکر."
- "هەرچەوا بیت، چ جوداهی نینە. ئەگەر ئەڤ چەندە ب تنێ ل سەر من ڕاوەستیابایە، کا چەوا من نیلز ل دور سویدێ هەموویێ زڤڕاند، ئاها هۆسا تە ژی دناڤ دیرۆکا فەلسەفێ دا گێڕینم. ل وی دەمی دا تە ل هنداڤی میلی، ئەسینا، قودس، ئەسکەندەریە، ڕۆما، فلورەنسا، لەندەن، پاریس، ئینا، هیدلبێرك، بەرلین، کوپنهاگن...هتد گێڕینم."
- "سوپاس، ئەڤ چەندە بەسە."
- "ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو گەڕیان دناڤ چەرخان دا مژارەکا ب سانەهی یە، خوە بۆ قازەکا وەکو من یا تڕانەکەر ژی، لێ هەرچەوا بیت دێ ب سانەهیتر بیت ئەگەر ل سەر هەموو دەڤەرێن سویدێ بفڕم."

پشتی ڤێ گوتنێ، بلند بوو و فڕی.

سۆفیایێ هەست ب واستیانەکا مەزن کر، دەمێ خوە گەهاندیە کۆلکێ خوە یێ بچوك ل پشت باخچێ مال، هزرێن خوە د ئەلبێرتوی دا دکرن کا ئەرێ ئەو یێ ژ ڤان یارییێن وێ بۆ خاپاندنا مایجەری یێ ڕازی یە. ئەرێ تو بێژی ماوێ خولەکەکێ هزرا وی چووبیتە سەر ئەلبێرتۆی؟"

ئەگەر ئەو تووشی نەخوشیا شیزوفرینیا "نەخوشیا ژبیرکرنا تشتان" ببیت، نوکە وی هزر د ئەلبێتوی دا نەکریە!

بەری دایکا وێ ژ سەر کاری بزڤڕیت، سۆفیا شیا خوە بگەهینتە مال. چونکی ب ڤی ڕەنگی ئەو پێدڤی ب گرتنا چ هێجەتان نەبوو، چونکی ئەگەر ئەو گیروبایە، پێدڤی بوو

بۆ دایکا خوە دووپات کربایە کا چەوا ل سەر دارەکێ ما ئاسێ و قازەك هات ئەو ژ سەر دارێ ئینا خوارێ.

پشتی خوارنێ، دەست ب بەرهەڤیێن ئاهەنگێ کر: مێزەکا داری ب درێژاهیا سێ چوار مەتران ژ کوگەهێ ئینا دەرێ و دانا دناڤ باخچەی دا، پاشی چوونە د ژوور ڤە داکو وان تشتان بینن یێن وان برپاردای بدانە سەر مێزێ.

ب ڤی رەنگی ئەو شیان مێزەکا مەزن ل ناڤ باخچەی و ل بن دارێن فێقی بەرهەڤ بکەن. دوماهیك جارا وان ئەڤ مێزە ئینایە دەرێ، ئاهەنگا هەڤژینیا دایك و بابێن وێ یا دەهێ بوو کو هینگێ هێشتا ژیێ وێ نەبووونە هەشت سال. باش بیرا سۆفیایێ ل وێ ئاهەنگێ دهێت کو هەموو مرۆڤێن وان ب بچووك و مەزنان ڤە ئامادە ببوون.

دەنگوباسێن سەقای دیاردکرن رۆژا شەمبی ئەسمان دێ یێ پاقژ و رۆهن بیت. ئەڤە ژ رۆژا رابوونا باهۆزێ وەرە خو چپکەکا بارانێ ژی نەباری یە. لێ دگەل هندێ ژی وان هزرکر باشترە ئەو خوە ل هیڤیا سپێدەهیا شەمبیێ بگرن و پاشی بخەملینن، ژبەرکو دانا مێزێ ل ناڤ باخچەی بۆ ئەڤرۆکە بەسە.

ب شەڤێ، سۆفیایێ و دایکا خوە دوو جۆرێن کێکان چێکرن: جۆرێ یەکێ هندەك پارچەیێن بچووك یێن تامدای ب شیری بوون، جۆرێ دووێ ژی کێکەکا مەزن و خەملاندی بوو. زێدەباری بەرهەڤکرنا مریشك و زەلاتێ. هەردیسان وان میموك ژی ژبیر نەکرن. تشتێ یەکانە یێ سۆفیا ژێ دترسیای ئەو بوو هەڤالەکا وێ بتلەکێ بیرێ دگەل خوە بینیت، چونکی وێ نەدڤیا چ ئاریشە دناڤ ئاهەنگا وێ دا پەیداین.

دەمێ رابووی داکو بچیت بنڤیت، جارەکا دی دایکا وێ پرسیار ژێ کر کا ئەرێ دێ ئەلبێرتۆ هێتە ئاهەنگا وێ یان نە.

- "چ پێنەڤێت دێ هێت، وی سوز یا دایە من رووینشتەکا دانوستاندنێ یا فەلسەفی ژی رێکبێخیت."

- "دانوستاندنەکا فەلسەفی؟ رامانا ڤێ چەندێ چیە؟"

- "دانوستاندنەکا ئاسای یە، دبیت بەحسێ هندێ بکەت کا چەوا کێڤریشك ژ کولاڤێ درێژ دهێتە دەرێ."

- "جارەکا دی بەحسێ وێ کێڤریشکێ نەکەیە ڤە."
- "بەلێ مادەم ئەو فەیلەسۆفە، ئاهەنگا مەژی دێ بیتە ئاهەنگەکا فەلسەفی."
- "ئەز دبێژم تو چ جاران نەشێیە ئەزمانێ خوە."
- "و پا تو، تەژی هزرا خوە کریە کا دێ بەشداریا تە د ئاهەنگێ دا چ بیت؟"
- "چ پێنەڤیت. من هزرەکا بچووك و تایبەت هەیە."
- "دێ گوتارەکێ پێشکێش کەی؟"
- "خورتیێ ل من نەکە، ئەز هەر بۆ تە نابێژم. نوکە ژی شەڤا تە بمینیت خوش."

ل سپێدێ، دایکا وێ کچا خوە ژ خەو راکر داکو بەری بچیتە سەر کاری خاترا خوە ژێ بخوازیت و لیستا کەلوپەلێن پێدڤی بدەتە ڤێ کو پشتی هینگێ بچیت ژ بازاڕی بکریت. هێشتا دایکا وێ ب دروستاهی ژ مال نەدەرکەفتی، زەنگا تێلەفۆنا وان هاتە لێدان و ئەلبێرتۆی ژ لایێ دی یێ بازێری پەیوەندی ب سوفیایێ کر، خو دێ بێژی ئەو دزانیت کا کەنگی دێ سۆفیا مینتە ب تنێ.

- "باشە... ئەرێ پلانا تە یا بچوك باش ب ڕێڤە دچیت؟"
- "هشبە، چ تشتا نەبێژی! دەلیڤێ نەدێ ئەو ب نیازا مە بحەسیێت."
- "ئەز دبێژم من دوهی باش سەرنجا وی بۆ خوە ڕاکێشا."
- "باشە."
- "ئەرێ هێشتا وانەیێن فەلسەفێماینە."
- "نێ ژبەر هندێ من تێلەفۆن یا بۆ تە کری. نوکە ئەم یێ گەهشتینە قۆناغا سەردەم و ئەز د وێ باوەرێ دامە ژ نوکە وێ ڤە تو ب خوە دشێی کاروبارێن خوە بڕێڤە ببەی. یا گرنگ ئەوە تە نوکە بنیاتەکێ باش ل دور تێگەهشتنا فەلسەفێ هەیە، لێ من دڤێت تە ببینم داکو پیچەکێ باخڤین."
- "بەلێ پا پێدڤیە ئەز بچمە بازاڕی بۆ کرینا..."
- "گەلەك باشە، چونکی ئەم ب خوە ژی دێ بەحسێ قۆناغا سەردەم کەین."
- "ئەو چەوا؟"
- "باشترە ئەم ل بازاڕی هەڤدوو ببینین."
- "تە دڤێت ئەز بهێمە دەف تە ل مال؟"

- "نەخێر، مالا من نوکە یا بێسەروبەرە! من هەموو تشت یێ سەروبنێك كرین داكو پشتڕاستبم كو مایجەری چ بهیستوك دناڤ مالا من دا نەڤەشارتینە."
- "ئاها..."
- "كافێیەكا نوو ل دوماهیا گۆڕەپانا بازاڕی یا ڤەكری: كافێیا بییر، تە دیتی یە؟"
- "بەلێ من زانی. كەنكی ل وێرێ هەڤدوو بینین؟"
- "نێزیكی دەمژمێر دوازدەی بەری نیڤرو."
- "ئەم پێكهاتین.. ل كافێ."
- "پاشی ئەم دێ ب درێژاهی ئاخفین."
- "بخێرهاتی."

سۆفیا بچیتە درەنگ گەهشت. كافێیا بییر یەك بوو ژ جهێن نوو هاتیە ئاڤاكرن و هەموو تشتێن وێ ژی یێن سەردەم بوون: كورسیك و مێزە و شووشەیێن ڤەخوارنێ یێن هەمەجۆر، زێدەباری جۆرەها خوارنێن سەردەوام و نوو.

هۆلا وێ كافێیێ نە هند یا مەزن بوو، لێ تشتێ سۆفیا حێبەتی كری ئەو بوو دەمێ چوویە د ژوور ڤە، ئەلبێرتۆ تێڤە نەبوو. هۆل یا پڕبوو ژ مێهڤانان و سوفیایێ یەك یەكە تەماشەی هەموویان كر.

سۆفیا فێرنەببوو ب تنێ بچیتە د كافێیان ڤە، ئەرێ تو بێژی یا باشتر بیت نوكە ئەو بدەركەڤیت و پاشی بێهنەكا دی بزڤڕیت بەلكو هەتا هینگێ ئەلبێرتۆ بهێت؟ یان ژی هەما هەر چ نەبا ڕۆژنامەیەك ڤێبایە داكو خوە پێڤە مژوول كربایە!

داكو خوە مژوول بكەت، وێ تەماشەی خەلكێ ل دەروبەرێن خوە دكر، هندەكان ژی ب گرنژین ڤە بەرسڤا ئاورینێن وێ ددا. ژ نیشكەكێ ڤە سۆفیا هەستپێكر ئەو یا ب ڕەخ كومەكا كچێن گەنج ڤە ڕوونشتی. ڕاستە هێشتا ژیێ وێ ژ پازدە سالان نەبوریە، لێ خولكێ وێ وەكو یێ كچەكا شازدە سالی دیار دكەت.

ئەرێ تو بێژی ئەڤ خەلكە هزر بكەن كا ئەو ل ڤێرێ چ دكەت؟ دێ بێژی ژ نیشكەكێ ڤە یێن هاتینە ڤێرێ، هەما وان یا دیتی دەرگەهێ كافێ یێ ڤەكریە، ڤێجا هەموو

یێ ب ژوور کەفتین و گەنگەشە و دانوستاندنان دکەن، لێ دیارە دانوستاندنێن وان ل سەر بابەتێن بێ ڕامانن.

ئاخفتنەکا کیرکیگاردی هاتە بیرا وێ دەمێ دگوتی یەك ژ ساخلەتێن هەرە دیار یێن مرۆڤی ئەوە گەلەك دئاخڤن و پتریا ئاخفتنا وان یا بێ ڕامانە. ئەرێ ئەڤ کوما خەلکی هەموو د قۆناغا سستبوونێ دا دژین؟ یان ژی ل دەڤ وان، تشتەکێ هەبوونخوازی یێ گرنگ هەیە و ژپێخەمەتی وی دژین.

د یەك ژ نامێن وێ یێن دەستپێکێ دا، ئەلبێرتۆی گوتبوویێ کو نێزیکبوونەك دناڤبەرا زارۆك و فەیلەسۆفان دا هەیە. نوکە سۆفیا جارەکا دی یا هەست ب ترسێ دکەت کو مەزن ببیت و ژ قۆناغا زارۆکینیێ بدەرکەڤیت. ما بۆچی ئەو خوە دناڤ فەروویێ کێڤریشکا سپی دا ناڤەشێریت ئەوا دناڤ کولاڤێ گەردوونی یێ بلند دا هاتیە دەرێ.

چاڤێن وێ قەت ژ دەرگەهی ڤەنەدبوون، ئاها ئەڤە ل دوماهیێ ئەلبێرتۆی دەرگەهێ کافێیێ پالدا و هاتە د ژوور ڤە. هەرچەندە نوکە ئەو د وەرزێ هاڤینێ دا بوون، لێ هێشتا جلکێن وی یێن زڤستانێ ل بەر بوون و چاکیتەکێ ڕەنگ قەهوای یێ درێژ ژی ل سەر دا کربوویێ. ئەلبێرتۆ بەرەڤ سۆفیایێ ڤە هات و ل دەڤ وێ ڕوونشت کو ئەڤەژی یەکەم جار بوو ئەڤ هەردوو پێکڤە ل جهەکێ ڕوونشتی بڕوونە خوارێ.

- "تە تەماشەی دەمژمێرێ کریە؟ دەمژمێر دوازە و چارێکەکە."
- "مانێ هەر کەسەك ژ مە ماف هەیە هەتا چارێکەکێ گیرو ببیت؟"
- "ئەز دشێم تشتەکێ بۆ ڤێ خاتینا بچووك داخواز بکەم؟"

ئەلبێرتۆ ڕوونشت و تەماشەی سوفیایێ کر.

- "تو دشێی لەفەکێ بۆ من داخواز بکەی."

پاشی ئەلبێرتۆ ڕابووڤە و بەرەڤ بۆفێیا خوارنگەهێ ڤە چوو و دەمێ زڤڕی دوو لەفەیەیێن گوشتی و پەنیری دگەل کوپەکێ قەهوێ ئینان.

- "ئەرێ بهایێ وان یێ گران بوو؟"
- "تە خەم پی نەبیت... نە هند گران بوون."

- "ئەرێ تە ئەگەرەك هەبوو تو هۆسا گیروبووی؟"

- "نەخێر. بەلکو من ژ دەڤ خوە ئەڤ چەندە کر. گوهێ خوە بدە من دێ بۆ تە ڕۆهن کەم کا بۆچی گیرو بووم."

لەقەك ل لەفێ دا و پاشی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە.

- "دێ بەحسێ سەردەمێ مە یێ ئەڤرۆکە کەین."

- "ئەرێ ما ژ لایێ فەلسەفی ڤە تشتەکێ گرنگ تێدا هەیە؟"

- بەلێ، گەلەك تشتێن گرنگ هەنە. تا وی ڕادەی کو بەرەڤ هەموو ئاڕاستەیان ڤە دچیت. ل دەستپێکێ دێ بەحسێ پێلەکا گرنگ و یەکلاکەر کەین دبێژنێ "هەبوونخوازی". ئەڤ زاراڤە گەلەك پێکۆلێن فەلسەفی ب خوە ڤە دگریت کو ڕهوڕیشالێن وان بۆ دوخێ هەبوونا مرۆڤی دزڤڕن. ژبەر هندێ ئەڤرۆکە ئەم دێ بەحسێ فەلسەفەیا هەبوونخوازیێ د چەرخێ بیستێ دا کەین، ب ڕەنگەکی کو گەلەك ژ ڤان فەیلەسۆفێن هەبوونخوازی فەلسەفا خوە ژ کیرکیگارد و هیگا و مارکسی وەرگرت بوو."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "فەیلەسۆفێ کو ڕۆلەکێ هەڕە مەزن د چەرخێ بیستێ دا گێڕای، فەیلەسۆفێ ئەڵمانی "فریدریك نیچە" بوو ئەوێ دناڤبەرا سالێن 1844 هەتا 1900ێ دا ژیای. نیچە ژی دژی فەلسەفەیا هیگلی و دیرۆکا ئەڵمانیا ڕاوەستیا. وی ل هەمبەر گرنگیدانا ڕەها ب دیرۆکێ کو دهاتە ناڤکرن "ڕەوشتێن بەندایەتیا مەسیحی"، گرنگی ب ژیانێ ب خوە ددا. وی دڤیا هەموو تشتان دووبارە بهەلسەنگینیت داکو تشتێن لاواز نەبنە ڕێگر د ڕێکا تشتێن ب هێز دا. نیچە د وێ باوەرێ دا هەموو ئاینێ مەسیحی و میراتێ فەلسەفی بەری خوە ژ جیهانا کەتواری لادایە و ل شوونا وێ بەرێ خوە دایە "ئەسمان"ی و "جیهانا بیرۆکەیان". لێ ئەو تشتێ وان ب جیهانەکا ڕاستەقینە دهەژمارت، د ڕاستی جیهانەکا ئاشوپی بوو. نیچەی دگوت: دگەل ئەردی یێ وەفادار بە و گوهێ خوە نەدە وان یێن سوزا ژیانەکا باشتر ل جیهانەکا دی ددەنە تە."

- "ێ پا..."

- "هزرمەندەکێ دی ژی گەلەك یێ ب کیرکیگارد و نیچەی داخباربوو، ئەوژی فەیلەسۆفێ هەبوونخوازی "مارتن هیدگر" بوو، لێ ئەز دبێژم باشترە ئەز بۆ تە بەحسێ

هەبوونخوازێ فرەنسی "جان بول سارتەر"ی بکەم ئەوێ دناڤبەرا سالێن 1905 هەتا 1980ێ دا ژیای، چونکی ئەو دهێتە هەژمارتن سەرکێشی پێکۆلا هەبوونخوازان. وی تیورا خوە ل دور هەبوونخوازیێ پشتی شەڕێن جیهانی پێشئێخست، ب تایبەت د سالێن چلان دا، هەردیسان ئەو یێ نێزیکی بیرۆکەیا مارکسی بوو بێ کو سەر ب حزبەکا سیاسی ڤە بیت."

- "ئانکو ژبەر وی تە ژڤانەك ل کافێیا فرەنسی دا من؟"

- "ئەڤ چەندە ژ نیشکەکێ ڤە نەبوو. سارتەری ژی گەلەك سەرەدانا کافێیان دکر. جارەکێ ژ جاران چاڤێ وی ب هەڤالا وی "سیمون دو بوڤوار"ێ کەفت کو ئەو ژی فەیلەسۆفەکا هەبوونخوازی بوو."

- "ژنەکا فەیلەسۆف؟"

- "من باش گوهلێبوو کا تە چ گوت..."

- "جهێ خوشحالیێ یە ل دوماهیێ مە دیتی مرۆڤایەتی یا بەرەڤ شارستانیەتێ ڤە دچیت."

- "لێ د هەمان دەم دا ڤۆناغا مە ژی یا ڤالا نینە ژ ئاریشە و تشتێن بێ ڕامان."

- "تە گوت دێ بۆ تە بەحسێ هەبوونخوازیێ کەم."

- "سارتەری دیارکر کو " هەبوونخوازی فەلسەفەیەکا مرۆڤایەتی یە"، مەرەما وی ژ ڤێ چەندێ ئەو بوو کو ل دەڤ فەیلەسۆفێن هەبوونخوازی ب تنێ یەك خالا دەستپێکرنێ هەیە، ئەو ژی مرۆڤە. لێ مرۆڤدوستیا ڤی شێوازێ مرۆڤایەتیێ، گەلەك ژ مرۆڤدوستیا چەرخێ ڕێنیسانێ تاڕیتر بوو."

- "بۆچی؟"

- "کیرکیگارد ژی وەکو پتریا فەیلەسۆفێن هەبوونخوازی یێن سەردەمێ مە، کەسەکێ مەسیحی بوو، لێ سارتەر کەسەکێ "خودێنەنیاس بۆ هەبوونخوازیێ" دهاتە هەژمارتن. ل دووڤ بۆچوونا نیچەی، ئەم دشێین فەلسەفەیا وی هۆسا لێکبدەین کو پشتی مرنا خودای دلوڤانیێ ب ڕەوشا مرۆڤان نابەت!"

- "بەردەوام بە..."

- "پەیڤا گرنگ و کلیلکا فەلسەفێ د فەلسەفەیا سارتەر و کیرکیگاردی دا، پەیڤا "هەبوون" بوو، لێ ئەڤ زاراڤە ب تنێ دەربڕینێ ژ کارێ هەبوونێ ناکەت. بۆ نموونە، ڕووەك

و گیانەوەر ژی هەنە و دژین، لێ ئەو چ گرنگییێ ب هەبوونا خوە نادەن، لێ مرۆڤ بونەوەرێ زیندی یێ یەکانەیە گرنگییێ ب هەبوونا خوە ددەت. ئانکو "مرۆڤبوون" تشتەکێ تایبەت وجودایە کو مرۆڤ بۆنەوەرەکێ دی یان تشتەکێ دی بیت."

- "ئەڤ چەندە یا دیارە."

- "ب هەمان ڕێك، سارتەری دگوت هەبوونا مرۆڤی ل بەری هەموو وان شرۆڤەکرنان دهێت یێن ئەم پێکۆلێ دکەین پێ مرۆڤی بدەینە نیاسین، ئانکو ڕاستیا "هەبوونا من" بەری هندێ دهێت کا "ئەز کیمە". ژبەر هندێ سارتەری دگوت "هەبوونا مرۆڤی بەرێ نەژادێ مرۆڤی یان جەوهەرێ وی دهێت."

- "ئوف، ڕاستی ئەڤ ڕستەیە یا ب زەحمەت بوو."

- "مەرەما مە ژ جەوهەری ئەو تشتە یێ مرۆڤی پێکدئینیت، ئانکو سروشت و قەوارەیێ وی. لێ سارتەر د وێ باوەرێ نەبوو کو مرۆڤی سروشتەکێ زکماکی یێ ب ڤی ڕەنگی هەبیت، ژبەر هندێ پێدڤیە ئەو ب خوە سروشت و جەوهەرێ بئافرینیت، چونکی ئەڤ تشتە ل دەستپێکێ بۆ مرۆڤی ناهێنە دان."

- "ئەز دبێژم نوکە ئەز باشتر تێگەهشتم."

- "ب درێژاهیا دیرۆکا فەلسەفێ، فەیلەسۆفان بەردەوام پرسیارا جەوهەر و سروشتێ مرۆڤی کریە، لێ سارتەر د وێ باوەرێ دا بوو کو مرۆڤی چ سروشتێن هەتا هەتایی نینن، ژبەر هندێ پێدڤی ناکەت پرسیارێ دەربارەی ڕامانا ژیانێ ب شێوەیەکێ گشتی بکەین. ب دەربڕینەکا دی، ئەم یێن هاتینە پابەندکرن کو ئەم ب خوە ژیانێ و تشتێن دەوروبەری ب خوە ئاشکەرا بکەین، ئانکو ئەم وەکو وی ئەکتەری نە یێ کەسەکی پاڵدایە سەر دەپێ شانۆیێ بێ کو ڕۆلەکێ دەستنیشانکری بدەتە ڤێ یان کەسەك ژ دوورڤە بێژیتێ کا دێ چ کەت و چ ناکەت، بەلکو ئەو دێ نەچار بیت ژ دەڤ خوە ئەکتەرییێ کەت، ژبەر هندێ وەکو وی ئەکتەری، پێدڤیە ئەم ب خوە بڕیارێ بدەین کا دێ چەوا ژین."

- "د کەتواری دا، ئەڤ چەندە یا دروستە. ئەم دێ ترسین هەکە ب تنێ پشتا خوە ب پەڕتووکا پیرۆز یان پەڕتووکەکا فەلسەفی گەرم بکەین کا پێدڤیە چەوا بژین."

- "نوکە تو د هەموو تشتان گەهشتی. ل دووڤ ئاخفتنا سارتەری، مرۆڤ تێدگەهیت کو هەبوونا خوە هەیە و ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان دێ مریت و د هەمان دەم دا چ شرۆڤەکرنان بۆ

ڤێ چەندێ نەبینیت، ل وی دەمێ دێ هەست ب دوودلیێ کەت. د بنیات هێشتا ل بیرا تە بیت کو کیرکیگاردی ژی ساخلەتا دوودلیێ وەك تایبەتمەندیەکا هەرە بەرچاڤ یا رەوشا هەبوونا مرۆڤی ل قەلەم ددا."

- "بەلێ."

- "سارتەر زێدەتر دبێژیت کو مرۆڤ د جیهانەکا بێ رامان دا، هەست ب بیانیا یان غەریبیا خوە دکەت. دەمێ بەحسێ غەریبیا مرۆڤی دکەت، دگەل بیرۆکەیێن هەر یەك ژ مارکس و هیگلی هەڤرا دبیت. دەمێ مرۆڤ ل سەر روویێ ئەردی هەست ب غەریبیا خوە دکەت، دێ بیتە ئەگەر هەست ب رەشبینیێ و بێهنتەنگی و دلرەشبوون و بێزاریێ بکەت."

- "بەلێ پا هەتا نوکە ژی گەلەك کەس د وێ باوەرێ دانە هەموو تشت یێن گەندەل و پیچ بووین و جیهان هەموو یا بێ قیمەت بووی."

- "بەلێ. سارتەر وەسفا مرۆڤی باژێری یێ چەرخێ بیستێ دکەت. ئەگەر بیرا تە بهێت، د چەرخێ رێنیسانسێ دا ئازادی و سەربەخویا مرۆڤی ب شێوەیەکێ باش دیاربوو، لێ سارتەر دبێژیت ئازادی بارەکێ گرانە."

- "مرۆڤ یێ هاتیە پابەندکرن یێ ئازاد بیت، ل ڤێرێ ئەم دبێژین یێ هاتیە پابەندکرن چونکی وی خوە نەئافراندیە، دگەل هندێ ئەو یێ ئازادە ژی. رامانا ڤێ چەندێ ئەوە، پشتی مرۆڤ دهێتە هنارتن بۆ ناڤ جیهانێ، ئێدی ئەو یێ ئازادە و بەرپرسیارە ژ هەر کارەکێ دکەت."

- "بەلێ پا مە داخواز ژ کەسێ نەکریە مە وەکو تاکەکەسێن ئازاد بئافرینیت."

- "ئەڤە بۆچوونا سارتەی ژی بوو. لێ ب حکمێ کەتوارێ ئەم تێدا دژین، ئەم تاکەکەسێن ئازادین، ئازادیا مە وە ل مە دکەت ب درێژاهیا ژیانێ د پابەند بین و تشتان ب هەلبژێرین، ژبەر هندێ چ راستی بۆ هەبوونا بیروباوەرێن نەمر و هەتا هەتایی نینە کو گەڤان ل سەر ژیانا مە بکەن. ل ڤێرێ گرنگیا وی بریارێ دەردکەڤیت یا ئەم ددەین، ژبەر هندێ ئەم بەرپرسیارین ژ هەر کارەکێ دکەین. سارتەر دووپات دکەت نابیت ب چ رەنگان مرۆڤ بەرپرسیاریا کارێن خوە ل سەر خوە لادەت یان پاڤێژیتە سەر ملێن کەسەکێ دی. ئانکو ل ڤێرێ ئەم نەشێین خوە ژ بەرپرسیاریا هەلبژارتنان ڤەدزین و بێژین ئەم د "نەچارین" بچینە سەر کاری، یان ژی ئەم "د نەچارین" ل دووڤ هندەك رێسا و یاسایێن

بورجوازی بژین کو شێوازێ ژیانا مە دەستنیشان بکەن. ئەو کەسێ دهێلیت ئەڤ فشارێن دەرەکی کارتێکرنێ لێ بکەن، دێ بیتە کەسەکێ بەرزە و دناڤ خەلکی دا دێ بەرزەبیت. ئەڤ مرۆڤە درەوان ل خوە دکەت و بەرەڤ نیازەکا خراپ ڤە دچیت. لێ بەروڤاژی، ئازادی مە پاڵددەت کارەکی بکەین و پێکۆلێ بکەین ببینە تشتەکێ باش نەك بووکەکا لاستیکی د دەستێ هندەك کەسێن دی دا. هۆسا دێ ب شێوەیەکێ ڕاستەقینە هەست ب هەبوونا خوە کەین."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "ل دەستپێکێ، ڤێ چەندێ پەیوەندی ب هەلبژارتنێن مە یێن ئەتیکی ڤە هەیە، ب ڕەنگەکی کو نابیت ئەم شاشیێن خوە بکەینە خەتاییێن "سروشتێ مرۆڤایەتیێ" یان "هەژاریا مرۆڤان" یان هەر هێجەتەکا دی تر. دبیت مرۆڤ وەکو بەرازەکی ڕەفتارێ بکەت و پاشی لومەی ئادەمی بکەت، لێ چ هەبوونێن ڕاستەقینە ژ بۆ ڤی مرۆڤی نینن. بەلکو ئەو ئادەمی ب تنێ وەکو ڕێکەکێ بکاردئینن داکو بەرپرسیاریا شاشیان ژ سەر خوە لادەن."

- "دگەل ڤێ چەندێ، دڤێت سنوورەك هەبیت دەمێ مرۆڤ خەتاییێن شاشیێن خوە دهاڤێژتە سەر پاتکا کەسەکێ دی."

- "بەلێ پا، ئەگەر سارتەر دووپاتیێ ل سەر هندێ بکەت کو چ ڕاستی بۆ هەبوونێ ب خوە نینن، ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت ئەو یێ ب ڤێ چەندێ کەیفخوشە، ژبەرکو ئەو نە کەسەکێ هیچپەرست یان نیهیلستە Nihilist."

- "ڕامانا وێ چیە؟"

- "نیهیلست ئەو کەسە یێ هزر دکەت چ تشتان ڕامانا خوە نینە و هەموو تشت ژی د ئامادەنە و ڕێك پێ هاتیەدان. لێ سارتەر د وێ باوەرێ دا بوو کو دڤێت ژیانێ ڕامانا خوە هەبیت و ل ڤێرێ ئەم دێ ڕامانێ دەینە ژیانێ. ڕامانا هەبوونێ ئەوە تو ب خوە بشێی هەبوونا خوە بئافرینی."

- "تو دێ شێی ڤێ بیرۆکێ پتر ڕۆهن کەی."

- "سارتەری ب خوە پێکۆل دکر بسەلمینیت کو ئاگەهی ب خوە تشتەك نینە ئەگەر بەری هینگێ هەست ب تشتەکی نەکەت. ژبەرهندێ، د بنەڕەت دا، ئاگەهی ئاگەهداربوونە ل سەر تشتەکی و ئەم ب خوە ژی بەشداریێ د پێکهاتنا وی تشتی دا دکەین. ب ڕێکا وان

تشتێن ئەم دهەلبژێرین و ڕامانا وان ل دەڤ مە یا گرنگ، ئەم شێوەیێ هەستێن خوە دهەلبژێرین."

- "نموونەك ل سەر ڤێ چەندێ هەیە؟"

- "دبیت دوو کەس د کافێیەکێ ڤە هەبن لێ هەر یەك ژ وان ب ڕەنگەکی دێ هەست ب تشتێن دەوروبەری خوە کەت. ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤرێت ئەم ڕامانەکا تایبەت ددەینە وان تشتێن بۆ مە دگرنگ. ژنا ب دووگیان هەست پێدکەت هەموو ژنێن دی ب دووگیانن، هەرچەندە بەری هینگێ وێ گەلەك ژنێن ب دووگیان دیتینە لێ هەست ب وان نەکریە هەتا ئەو ژی ب دووگیان کەفتی. وەکو دی ژی، ما کی نابێژیت کەسێ نەساخ ژی هزر دکەت کەسێن دی هەموو د نەساخن."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "هەبوونا مە یا تایبەت، ڕێکا دیتنا مە بۆ تشتێن دەوروبەر دەستنیشان دکەت. ئەگەر تشتەکی چ ڕامانا خوە ل دەڤ من نەبیت، ڕامانا وێ ئەوە ئەز وی تشتی نابینم."

- "باشە. دبیت نوکە ئەز بشێم بۆ تە شرۆڤە بکەم کا بۆچی ئەز گیرو هاتم."

- "تە گوت هەما ژ خو، من خوە گیرو کر."

- "پا کا تو بێژە، دەمێ تو هاتیە د ژوور ڤە، تە چ دیت یان هزرا تە چوو سەر چ؟"

- "یەکسەر من تیبینیا هندێ کر کو تو د ژوور ڤە نینی."

- "ئەرێ تو نابینی یا سەیرە یەکەم تشتێ تە دیتی، تشتەکێ هۆسا بوو کو ل وی دەمی هەبوونا خوە ل وێرێ نەبوو."

- "دبیت. بەلێ پا من ژڤانەك دگەل تە هەبوو."

- "دبێژنە ڤێ چەندێ ڕاهێنانا پڕاکتیکی."

- "تو ژی گەلەك زێدەڕویی دکەی."

- "بۆ نموونە، ئەگەر تو عاشق بی و ل هیڤیا تێلەفۆنا هەڤالێ خوە بی، ب درێژاهیا شەڤێ دێ هەستپێکەی وی تێلەفۆن نەکریە. خو هەکە ئەڤ چەند یا سەیر و هەڤدژ بیت، لێ ل وی دەمی ب تنێ تە گوهـ ل بێدەنگیا تێلەفۆنێ هەیە. یان ژی هەکە تو بچیتە بنگەهێ شەمەندەفران بۆ پێشوازیا هەڤالێ خوە و خەلك هەموو بهێنە خوارێ و ئەو دناڤ دا نەبیت، ل وی دەمی تو وی خەلکی هەموویێ ژی نابینی. چونکی هەبوونا وان چ گرنگیا خوە بۆ تە

نینه، دوور نینه کەربێن تەژی ژ وان ڤەبن. تشتێ یەکانه یێ د هزرا ته دا کوپی دبیت ئەوە کو هەڤالێ ل وێرێ نەبوو."

- "ئەز تێگەهشتم."

- "سیمون دو بوڤوارێ پێکۆل دکر هەبوونخوازیێ ل سەر رۆلێ رەگەزان پراکتیزە بکەت، ب تایبەت پشتی سارتەری ئاماژی ب هندێ کری کو مرۆڤ خوەدانێ سروشتەکێ هەتا هەتایێ نینه پشتا خوه پێ گەرم بکەت، بەلکو دگوت ئەم ب خو، خوه دئافرینین و پێناسەیا خوه دەستنیشان دکەین."

- "ێ و پاشی؟"

- "ئەڤ تشته ل سەر وی وێنەی دهێنه پراکتیزەکرن یێ مه بۆ هەردوو رەگەزان د سەرێ خوه دا کێشای. ب بۆچوونا دی بوڤوارێ، چ "سروشتێن مێ" یان "سروشتێن نێر" یێن هەتا هەتایی نینن. بەلکو ئەڤه ئەو تشته یێ بیروبۆچوونێن کلاسیکی پێکۆلێ دکەت وەل مه بکەت باوەریێ پێ بینین. بۆ نمونه تشتەکێ بەربەلاڤه ئەگەر زەلامەکی سروشتەکێ هۆسا هەبیت حەز بکەت ژ سنووران دەربازبیت، ژبەر هندێ بەردەوام ژ دەرڤەی مالا خوه ل دووڤ رامان و ئارمانجەکێ دگەریێت. دەربارەی ژنێ ژی بۆچوونەکا بەروڤاژی هەبوو. ئانکو ژن یا "پێگیرە" و حەز دکەت وەکو خوه بیت و حەز ل وی جهی دکەت یێ هەی. ژبەر هندێ دناڤ خێزان و سروشت و تشتێن دەردوری خوه دا دمینیت. ژبەر هندێ ئەم دشێین بێژین ژنا نوکه پتر ژ زەلامی گرنگیێ ب "بهایێن ئارام" ددەت.

- "ئەرێ سیمون دو بوڤوار ژی د ڤێ باوەرێ دا بوو؟"

- "نەخێر. گوهێ ته باش لێنەبوو. وێ دگوت چ سروشتێن مێ یان نێر نینن، بەلکو بەروڤاژی، وێ دگوت پێدڤیه زەلام خوه ژ ڤان بۆچوونێن کەڤن فورتال بکەن."

- "بۆ ڤێ چەندێ ئەز ژی دگەل وێ مه."

- "گرنگترین پەرتووکا وێ ل سالا 1949ێ ل ژێر ناڤونیشانێن "رەگەزێ دووێ" دەرکەفت."

- "مەرەما وێ ژ ڤی ناڤونیشانی چ بوو؟"

- "د ڤێ پەرتووکێ دا وێ بەحسێ ژنێ دکر، چونکی د کەلتورێ مه دا، سەرەدەریا رەگەزێ دووێ دگەل ژنێ دهێته کرن. زەلام وەکو رەگەزێ سەرەکی خوه دیار دکەن و ژن

ژی ب تنێ وەکو ئالاڤەکی نە د دەستێن وان دا. ب ڤی ڕەنگی ژن بەرپرسیاریا ژیانا خوە ژ دەست ددەت."

- "دڤێت ژن وێ بەرپرسیاریێ بزڤڕینیت. دڤێت ئەو خوە دیار بکەت و پێناسەیا خوە ب زەلامی ڤە گرێنەدەت. د ڕاستی دا، زەلام ب تنێ ژنێ سەرکوت ناکەت، بەلکو ژن ب خوە ژی ب وەرنەگرتنا ڤێ بەرپرسیاریێ خوە سەرکوت دکەت."

- "ئانکو مەرەما وێ ئەو بوو دڤێت ژن بڕیارێ بدەن د ئازاد و سەربەخو بن."

- "بەلێ، ئەگەر تە ڤیا تو دشێی یا هۆسابی. فەلسەفا هەبوونخوازیێ هەر ژ سالێن چلان وەرە کاریگەریەکا مەزن ل سەر بوارێ ئەدەبی ژی هەبوو ب تایبەت ل سەر درامایێ. سارتەری ب خوە چەندین شانۆ و ڕۆمان نڤیسینە. نڤیسەرێن دی یێن گرنگ وەك ئەلبێر کامویێ فرەنسی و ساموئیل بیکیتێ ئێرلەندی و ئوگین ئیونسکو یێ ڕۆمانی و ویتولد جومبرۆ-ویکزێ پۆلۆنی. ساخلەت هەڤپشك یا دناڤبەرا ڤان نڤیسەر و پترِیا نڤیسەرێن دی یێن سەردەم دا دبێژنێ ئەپسوردیزم Absurdism کو زاراڤەکە پەهرا پتر بۆ شانۆیا ئەپسوردی دهێتە بکارئینان."

- "ئاها."

- "تو دزانی کا مەرەما مە ژ زاراڤێ ئەپسوردیزم چیە؟"

- "مانە ڕامانا وێ ئانکو تشتەکێ بێ ڕامان و نەبەرئاقل؟"

- "هەلبەت. شانۆیا ئەپسوردی یا هەڤدژ بوو دگەل شانۆیا کەتواری، ئارمانجا وێ دیارکرنا بێ ڕامانیێ بوو د ژیانێ دا داکو خەلکی پالبدەت خوە نەڕازی بکەن، نەك بیرۆکا بێ ڕامانایێ د سەرێ خەلکی دا بچینن. بەلکو بەروڤاژی، ب ڕێکا دیارکرنا تشتێن بێ ڕامان د ژیانێ دا، وەل خەلکی دکر ل ژیانەکا ڕاستەڤینتر و باشتر بۆ خوە بگەرن."

- "تشتەکێ بالکێشە."

- "پترِیا جاران شانۆیا ئەپسوردی بابەتێن سادە و بێ ڕامان نیشان ددان، ژبەر هندێ ئەم دشێین ناڤێ وێ بکەینە شێوەیەك ژ شێوەیێن "زێدەڕوییی د ڕیالیزمێ دا- Hyperrealism" کو مرۆڤی وەکو خوە نیشان ددەت. بەلێ پا ئەگەر ل سەر دەپێ شانۆیێ ئەو تشت بهێتە نیشاندان یێ مرۆڤ د ڕۆژەکا خوە یا ئاسایی دا ئەنجام ددەت، بۆ نموونە دەمێ سەرێ خوە دشوت، یان دەمێ سپێدێ ژ خەو هشیار دبیت یان ڕووداناکا دی یا

ئاسایی، ئەز بۆ تە دووپات دکەم بینەر هەموو دێ کەنە کەنی. ئەم دشێین بێژین ئەو وێ پێکەنینێ وەك بەرهنگاریەك دژی دیتنا خوە ب ڕووسی ل سەر دەپێ شانۆیێ لێکبدەن."

- "بەلێ. هەلبەت هۆسایە."

- "هەردیسان شانۆیا ئەپسوردی هندەك دیمەنێن سریالی* نیشان ددان. ئەکتەرێن سەر دەپێ شانۆیێ خوە د هندەك کاودانێن نەبەرئاقل و وەکو خەونان دا ددیت. بۆ نموونە دەمێ ئەکتەر بێ هیچ حێبەتیەك ڕۆلێ خوە دگێڕیت، بینەر دێ نەچاربیت ژبەر ڤێ بێ حێبەتیا ئەکتەران حێبەتی بمینیت. مە ئەڤ چەندە د فلمێن بێدەنگ یێن ئەکتەرێ ناڤدار "شارلی شاپلن" دا دیتیە. کاریگەریا ب کەنی یا ڤان فلمێن بێدەنگ پتریا جاران دەربڕین ژ ڕازیبوونا شاپلینی بۆ هەموو وان تشتێن بێ ڕامان یێن ب سەرێ وی دهاتی دکر. ڤێ چەندێ ژی بینەر نەچار دکرن ب شێوەیەکێ پتر کەتواری و ڕاستەقینەتر تەماشەی خوە بکەن."

- "پشتڕاست دێ مرۆڤ حێبەتی مینیت دەمێ دبینیت تشتەك یێ ب سەرێ کەسەکی دهێت بێ کو گازندان بکەت."

- "ل ڤی دەمی دبیت تو یا دروست بی، دەمێ ب ڤی ڕەنگی هەستپێدکەی. ئەڤە تشتەکە من دڤێت ژێ دوور بکەڤین، هەرچەندە هێشتا ئەز نزانم کا دێ بەرەڤ کیڤە چم."

- "ئەگەر خانیێ تە سوت، تو دێ نەچاربی بچیە ژ دەرڤە خو هەکە تە چ جهێن دی ژی نەبن تێڤە بژی."

- "ئەڤە ڕاستە. تە چایەکا دی ژی دڤێت بۆ تە بینم؟ یان ژی ساردەمەنیەك؟

- "باشە. بەلێ پا هێشتا ئەز یا هزرا خوە دکەم کا بۆچی تو گیرو ببووی."

- "بەلێ پا ئەز دشێم هۆسا بژیم."

پشتی دەمەکی، ئەلبێرتۆ زڤڕی و کوپەکێ دی یێ قەهوێ و ساردەمەنیەك د دەستان دا بوون. هێدی هێدی سۆفیایێ ژی حەژ ژ سەقایێ وێ کافێیێ دکر. هەردیسان هزرا خوە د هندێ دا دکر کو دانوستاندنێن ل سەر مێزێن دی ڕەنگە هند د سادە و بێ بها نەبن وەکو وێ بەری هینگێ پێشبینی دکر.

---

* سریالی یان ژی سریالیزم Surrealism بزاڤەکا کەلتوری بوو ل دەستپێکا سالێن 1920ێ پەیدابوو و گرنگی ددا ئەدەب و هونەری.

ئەلبێرتۆی بتلێ ساردەمەنیێ ب شێوەیەکێ ب هێز دانا سەر مێزێ. ژبەر هندێ هژمارەکا کەسێن ل سەر مێزێن دی تەماشەی وی کر.

وی گوت: "و ڤێ چەندێ ئەم گەهاندینە دوماهیا ڕێکێ."

- "ئانکو دیرۆکا فەلسەفێ ل دەڤ سارتەر و هەبوونخوازیێ دڕاوەستیت؟"

- "نەخێر. ئەڤ چەندە تشتەکێ زێدەیە تو دبێژی. فەلسەفەیا هەبوونخوازیێ کاریگەریەکا مەزن ل سەر هژمارەکا مەزن یا خەلکی ل سەرانسەری جیهانێ بجھ هێلایە. هەروەکو مە دیتی، ڕهوریشالێن وێ ڤەدگەڕنە دیرۆکێ ب ڕێکا کیرکیگاردی و هەتا دگەهیتە سۆکراتی. چەرخێ دوازدێ ژی چەندین پێشکەفتن و نویکرن ل دور پێکۆلێن فەلسەفی یێن بەری هینگێ مە بەحسکرین ب خوە دیت بوو."

- "وەکو چ تشت؟"

- "باشە. یەك ژوان پێکۆلێن فەلسەفی دگوتنێ "تومیزما نوو-Neo Thomism"، ئانکو ئەو بیرۆکەیێن بۆ هرزرۆبیرێن کلاسیکی یێن تۆماس ئەکوینی دزڤڕین. پێکۆلەکا دی دگوتنێ فەلسەفەیا شرۆڤەکاری یان ئیمپرپیسیزما لوژیکی کو ڕەهوڕیشالێن وێ ژی بۆ فەلسەفەیا هیومی و ئیمپرپیزمێن بریتانی دزڤڕی، هەتا دگەهشتە فەلسەفەیا لوژیکی یا ئەڕستۆی ب خوە ژی. ژ بلی ڤان ژی، فەیلەسۆفێن چەرخێ بیستێ ژی ب شێوەیەکێ سروشتی کەفتنە ژێر کاریگەریا مارکسیا نوو، ب ئاڕاستەیێن جۆراوجۆر ڤە. بەری نوکە مە بەحسێ داروینیزما نوو و شرۆڤەکرنا دەروونی ژی کریە."

- "بەلێ."

- "پێدڤیە ئەم بیرا خوە ل ڕێبازا فەلسەفی یا دوماهیێ ژی بینین کو دبێژنێ مەتریالیزم* کو وێ ژی هندەك ڕهوڕیشالێن دیرۆکی هەنە. ئەم دشێین ڕهوڕیشالێن پتریا زانستێن سەردەمێ ئەڤرۆکە بۆ سەردەمێ بەری سۆکراتی بزڤڕینین. بۆ نموونە، ڤەکۆلین و لێگەریان ل دور "دندکێن بنچینەیی" یێن نەبینراو کو هەموو ماددەیێن دی پێکدئینن. هەتا نوکە کەس نەشیایە شرۆڤەکرنەکا ڕازیکەر دەستنیشان بکەت کا ماددە چیە. زانستێن

* مەتریالیزم Materialism یان ژی فەلسەفەیا ماددی. فلسفه المادیه.

سەردەم وەك فیزیكا ناڤوكی و زیندەكیمیازانی شانازیێ ب هندێ دبەت كو بووینە بەشەكێ هەرە گرنگ یێ فەلسەفەیا ژیانا وان."

- "ئانكو بەردەوامی دناڤبەرا تیورێن كەڤن و نوو دا هەیە."

- "بەلێ. چونكی پتریا ئەو پرسیارێن فەلسەفی یێن مە كورسێ خوە پێ دەستپێكری هێشتا نەهاتینە بەرسڤدان. سارتەری ئاماژە ب تیبینەكا گرنگ دكر دەمێ گوتی نابیت پرسیارێن هەبوونخوازیێ بهێنە بەرسڤدان بەلكو دڤێت بۆ هەتا هەتاییێ بمینن. پێناسەیا دروست ئەوە كو پرسیارێن فەلسەفی تشتەكێ هۆسانە كو هەر بەرەبابكەك، هەر تاكەكەسك ژی، پێدڤیە بەردەوام ژ خوە بكەن."

- "هزركرنەكا پۆسیدەیە؟"

- "ئەز نەیێ پشتراستم كا ئەز دگەل بۆچوونا تە یێ هەڤرامە یان نە. چ پێنەڤێت ب رێكا كرنا ڤان پرسیاران ئەم دزانین كا ئەم چەوا دژین. هەردیسان، دەمێ مرۆڤی دەمێ خوە ب لێگەریانا بەرسڤێن پرسیارێن ب زەحمەت ڤە بوراندی، ئەو شیاین بەرسڤەكا رۆهن و دوماهیێ بۆ چەندین پرسیارێن دی ب دەست خوە ڤە بینن. زانست و ڤەكۆلین و تەكنولوژیا هەموو بەرهەمێ رەنگڤەدانا هزروبیرێن مە یێن فەلسەفی نە. ئەرێ مانە هەر حێبەتیا مە ل دور ژیانێ بوویە ئەگەر مرۆڤ بگەهیتە سەر بانێ هەیڤێ؟"

- "بەلێ. ئەڤ چەندە راستە."

- "دەمێ نیل ئارمسترۆنگی پێن خوە دانانینە سەر بانێ هەیڤێ، وی دگوت: ئەڤە پێنگاڤەكا بچووكە بۆ مرۆڤەكی، لێ پێنگاڤەكا گەلەك مەزنە بۆ مرۆڤایەتیێ هەموویێ. دگەل گوتنا ڤان پەیڤان و دەمێ پێن خوە دانایینە سەر بانێ هەیڤێ، هەموو ئەو مرۆڤێن بەری وی ژیاین دگەل خوە راكێشانە سەر بانێ هەیڤێ. چونكی چوونا وی بۆ سەر هەیڤێ بەرهەمێ خەباتا وی ب تنێ نەبوو."

- "چ پێنەڤێت، نەخێر."

- "ل سەردەمێ مەیێ ئەڤرۆكە ژی، ئەم روو ب رووی چەندین ئاریشەیان بووینە. گرنگترین ئاریشە ژی ئەون یێن پەیوەندی ب ژینگەهێ ڤە هەین. ئاراستەیەكێ فەلسەفی یێ ناڤەندی ل چەرخێ بیستێ هاتیە ناڤكرن ب "فەلسەفەیا ژینگەهێ-Ecophilosophy" و یەك ژ دامەزرێن وی یێن سەرەكی، فەیلەسوڤێ نەرویجی ب ناڤێ "ئارن نەیس"، ناڤێ وێ

دانایە. گەلەك ژ فەیلەسۆفێن ژینگەهدوست یێن جیهانا ڕۆژئاڤای ئاماژێ ب هندێ ددەن کو شارستانیا ڕۆژئاڤای یا ل سەر ڕێکەکا شاش دچیت ها وەختە دێ گەهیتە ڕادەیەکی کو ڕەنگە ئێدی ئەختەرا مە خوە ل بەر نەگریت. ژبەر هندێ پێکۆل دکر هندەك پێشنیارێن پراکتیکی ل دور نەهێلانا کاریگەریا پیسبوون و کارەساتێن ژینگەهێ دەستنیشان بکەن. تشتەکێ شاش د هزرا ڕۆژئاڤای دا هەیە."

- "ئەز دبێژم ئەو د ڕاستن."

- "بۆ نموونە. فەیلەسۆفێن ژینگەهێ پرسیار و گومان ل دور تیورا وەراپرکرنێ ژی هەنە کو بنەمایێ وێ ل سەر هندێ هاتیە دانان کو مرۆڤ ل سەر هەموو زیندەوەرێن دی دایە و سەرکێشێ سروشتی یە. ئەڤ جۆرێ هزرکرنێ ژی ڕەنگە بۆ سەر ژیانا هەموو زیندەوەرێن دی ل سەر ئەختەرا مە یا ب مەترسی بیت."

- "دەمێ ئەز هزرا خوە تێدا دکەم، ئەز دین دبم."

- "بۆ ڕەخنەگرتنێ ل ڤێ مگرتیێ، گەلەك فەیلەسۆفێن ژینگەهێ تەماشەی هزرکرن و بیرۆکەیێن کەلتورێن دی دکەن، بۆ نموونە کەلتورێ هندێ. هەردیسان ڤەکۆلین ل دور شێوازێ هزرکرن و دابونەریتێن خەلکێ ڕەسەن دکەن، بۆ نموونە خەلکێ ڕەسەن یێ ئەمریکا، ئەو ژی ژ پێخەمەت ڤەدیتنا وان تشتان یێن مە ژ دەست داین.

- "ئەز تێگەهشتم."

- "ل ڤان سالێن دوماهیێ د بوارێ زانستی ژی دا دهێتە گوتن کو جۆرێ هزرکرنا مە ل بەرامبەری "گوهۆڕینەکا نموونەیی" ڕاوەستیایە. ئانکو ئەم دشێین بێژین ئەو داخوازا گوهۆڕینەکا بنچینەیی د شێوازێ هزرکرنێ دا دکەن. هەر ژ نوکە د چەندین بواران دا بەرهەمێ فێقیێ وان گەهشتیە و ئارمانجێن وان هاتینە بجهـ ئینان. بۆ نموونە، چەندین پێکۆلێن جهگرتی دەرکەفتینە کو پێکۆلێ دکەن ستایلەکێ نوو یێ ژیانێ بئافرینن."

- "گەلەك باشە."

- "بەلێ پا وەکو هەر جار، دەمێ تشتەکی پەیوەندی ب مرۆڤی ڤە هەبیت، پێدڤیە ئەم جوداهیێ دناڤبەرا تشتێن باش و خراب دا بکەین. هندەك کەس دبێژن ئەم یێن چووینە د سەردەمەکێ نوو دا، لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت کو هەموو تشتێن نوو د باش و ب مفانە، هەردیسان نابیت هەموو تشتێن کەڤن ژی پشتگوهـ بهاڤێژین. ئەڤە یەك ژ

وان ئەگەران بوو کا بۆچی من ئەڤ کورسێ فەلسەفی دا تە. نوکە تە پاشینەیەکا دیرۆکی هەیە و تو ب خوە دشێی ئاڕاستێ ژیانا خوە بگوهۆڕی."

- "سوپاسیا تە دکەم."

- "ئەز هزردکەم کو تو دێ بینی پتریا ئەو تشتێن خوە ل بن سەردەمێ نوو ڤە ڤەشارتین، سەردابرنە. هەتا ئەو تشتێ دبێژنێ ئاینێ نوو، باوەری ئینان ب تشتێن ڤەشارتی و هەموو جۆرێن ئەفسانەیێن سەردەم ل ڤان چەند سالێن دوماهیێ کاریگەری ل سەر جیهانا ڕۆژئاڤای کریە. ئەڤ تشتە هەموو یێن بوونە بازرگرانیەکا نوو. پشتی کو هژمارا دووکەفتییێن ئاینێ مەسیحی ل کێمیێ دای، ئێدی بیروباوەرێن نوو وەکو کڤارکان هاتنە چاندن داکو پشتەڤانیا ڤی ئاینی بکەن."

- "بۆ نموونە، وەکو چ تشت؟"

- "لیستا نموونەیان هند یا درێژە ئەز نەشێم خو ژ دەستپێکێ بۆ تە هەموویان بێژم. وەکو دی ژی نە یا ب ساناهیە ئەز بەحسێ سەردەمێ کەسەکی ب خوە بکەم کو هێشتا یێ تێدا دژیت، بەلێ پا تو چ دبێژی ئەم پیاسەکێ دناڤ بازێری دا بکەین؟ تشتەکێ هەی من دڤێت نیشا تە بدەم."

- "ئەز نەشێم گەلەك بمینم، هیڤیا من ئەوە تە ئاهەنگا سۆباهی ژبیر نەکربیت."

- "چ پێنەڤێت من ژبیر نەکریە. چونکی تشتەکێ خوش ل وێرێ دێ ڕوودەت. پێدڤیە ل دەستپێکێ ئەم کورسێ فەلسەفی یێ هێلدێ ب دوماهی بینین. هەروەکو تو دبینی، مایجەری ژی زێدەتر ژ هندێ هزرا خوە نەکریە و چ تشتێ دی نەنڤیسایە، ژبەر هندێ وی پیچەکا دەستهەلاتا خوە ل سەر مە یا ژ دەست دای."

جارەکا دی ئەلبێرتۆی بتلێ ساردەمەنیێ بلند کر کو نوکە یا ڤالاْ بوو و پاشی ب هێز ل مێزێ دا. ئەو هەردوو پێکڤە چوونە ژ دەرڤە و چاڤێ وان ب خەلکی کەفت کو وەکو مێریان ل سەر جادێ یێ بەرەڤ کونمێرییێن خوە ڤە دچن. سۆفیا یا حێبەتی بوو کا ئەلبێرتۆی دڤێت چ تشت نیشا وێ بدەت.

پشتی بێهنەکێ ئەو ب ڕەخ پێشانگەهەکا مەزن ڤە چوون کو هەموو تشتێن گرێدای ب تەکنولوژیا پەیوەندیان ڤە دفرۆتن وەك تێلەڤزیون و ڤیدیو و سەتەلایت و موبایل و کومپیوتەر و ئامیرێن فاکسێ.

ئەلبێرتۆی دەستێ خوە بۆ وێ شاشەیا ئەڤ تشتە نیشان ددان درێژ کر و گوت: "ل ڤێرێ تو دشێی هەموو تشتێن چەرخێ بیستێ ببینی، سۆفیا. د چەرخێ ڕێنیسانسێ دا جیهان پەقی و چەندین داهێنان و ئاشکەراکرنێن مەزن دگەل خوە ئینان. ئەوروٚپیان دەست ب گەشتان بۆ سەرانسەری جیهانێ کر. لێ نوکە بەروڤاژی لێهاتیە. ئەم دشێین بێژینێ پەقینا بەروڤاژی."

- "ژ کیژ لای ڤە؟"

- "ژ وی لای ڤە کو جیهان هەموو یا کەفتیە دناڤ تۆڕەکا پەیوەندیکرنێ یا مەزن دا. بەری دەمەکێ نە گەلەك درێژ، فەیلەسۆفان بۆ هەیاما چەندین ڕۆژان گەشت ل سەر پشتان هەسپ و عەرەبانکان دکرن، داکو جیهانا دەوروبەری خوە ئاشکەرا بکەن و هەڤدیتنێ دگەل فەیلەسۆفێن دی بکەن. لێ ئەڤرۆکە ئەم دشێین ل هەر دەڤەرەکا ل سەر ڤێ ئەختەرێ بروونە خوارێ و ب تنێ ب ڕێکا شاشەیا کومپیتوری تەماشەی هەموو سەربۆرێن مرۆڤان بکەین."

- "هزرکرنەکا جوانە، لێ د هەمان دەم دا یا ب مەترسیدارە ژی."

- "پرسیار ئەوە کا ئەرێ دیرۆك ل کیڤە دێ ب دوماهی هێت، یان بەروڤاژی کا ئەم ئەرێ ئەم ل دەستپێکا سەردەمەکێ نوو ڕاوەستیانە. ئێدی ئەم هاولاتیێن سادە یێن باژێرەکی یان وەلاتەکێ دەستنیشانکری نینن، بەلکو ئەم هەموو پێکڤە یێ دناڤ شارستانیەکا سەرانسەری دا دژین."

- "ئەڤ چەندە ڕاستە."

- "پێشکەفتنێن تەکنولوژی، ب تایبەت د بوارێ پەیوەندیان دا، د ماوەیێ سیهـ بۆ چل سالێن بوری دا ژ هەموو ماوەیێ دیرۆکێ یێ بوری دا گەرمتر بوو. لێ ڕەنگە هێشتا ئەم ل دەستپێکێ بین و پێشکەفتنێن مەزنتر د ڕێکێ دا بن..."

- "ئەرێ ئەڤە ئەو تشت بوون یێن تە دڤیای نیشا من بدەی؟"

- "نەخێر. بەلکو ئەو تشت یێ ل ڕەخێ دی. ل نێزیکی دێرا هە."

دەمێ ئەو ب ڕێکا خوە دچووین، وێنەیێ چەندین سەربازێن نەتەوەیێن یەکگرتی ل سەر شاشا تێلەڤزیونەکێ دیاربوو.

سۆفیایێ گوت: "بەرێ خوە بدێ."

زووما کامیرێ چوو سەر سەربازەکی کو ڕیهێن وی ژی وەکو یێن ئەلبێرتۆی د ڕەش بوون. ژ نیشکەکێ ڤە وی پڕتەکا کاغەزێ بلند کر کو ل سەر هاتبوو نڤیسین: "ل دەمەکێ نێزیك دێ ڤەگەڕم هێلدا!" و پاشی ب دەستێ خوە یێ دی خاترا خوە خواست.

ئەلبێرتۆی گوت: "چ فێلبازە."

- "ئەرێ ئەو مایجەر بوو؟"
- "ببورە من نەڤێت خو بەرسڤا ڤێ پرسیارێ ژی بدەم."

پاشی ئەو دناڤ پارکا بەرامبەری دێرێ ڕا بورین هەتا گەهشتینە سەر جادەیەکا دی یا سەرەکی. ئەلبێرتۆ هۆسا خویادکر کو پیچەکێ یێ بێزارە. پاشی ئەو ل بەرامبەری مەزنترین پەڕتووکخانا باژێری یا ب ناڤێ "لیبریس" ڕاوەستیان.

- "تە دڤیا ڤێرێ نیشا من بدەی؟"

ئەلبێرتۆی گوت: "دا بچینە د ژوور ڤە."

د ژوور ڤە، وی دەستێ خوە درێژکرە درێژترین دیوارێ پەڕتووکخانێ کو سێ بەش هەبوون "سەردەمێ نوو، ستایلێ ژیانا جهگرتی، سێرەبەندی".

پەڕتووکان چەندین ناڤونیشانێن بالکێش هەبوون وەك ژیان پشتی مرنێ، نهێنیا ڕۆحانیەتێ، تاقیکرنا بەختی، دیاردەیا یوفو، چارەسەکرن، زڤڕینا خودای، بەری نوکە تو ل ڤێرێ بووی، ستێرناسی چیە؟ ب سەدان کتێب ل سەر ڕەڤانکان هاتبوونە دانان و ناڤونیشانێن وان د جوراوجۆر و سەیر بوون.

- "ئەڤەژی بەرهەمێ سەدێ بیستێ یە، سوفیا. ئەڤە پەڕستگەها سەردەمێ مەیە."
- "ئەرێ تە باوەری ب تشتێن هۆسا هەیە؟"
- "هەرچەندە پتریا وان گەلەك فەند و فێل تێدا هەنە، لێ ئەو ژی وەکو گوڤارێن پۆرنوگرافی "سێکسی" گەلەك دهێنە فرۆتن، ژبەر هندێ ئەم دشێین پتریا وان ژ جۆرێ گوڤارێن پۆرنوگرافی بهەژمێرین. گەنج دشێن بهێنە ڤێرێ و وان پەڕتووکان بکرن یێن

گەلەك سەرنجا وان ڕادكێشن. لێ پەیوەندیا دناڤبەرا فەلسەفەیا ڕاستەقینە و ڤان پەڕتووكان دا وەكو پەیوەندیا دناڤبەرا ئەڤینا ڕاستەقینە و گوڤارێن پۆرنوگرافی دایە."

- "ئەرێ تو پیچەكێ نەیێ توندی؟"
- "دا ژ ڤێرێ بچین و دناڤ باخچەی دا بڕوونە خوارێ."

ئەو هەردوو ژ پەڕتووكخانێ دەركەفتن و ل سەر كورسیەكا ڤالاٚ ل بەرامبەری دێرێ ڕوونشتن. ل بن هندەك داران دەنگێ كوتران و ویس ویسا چووچكان دهات.

ئەلبێرتۆی گوت: "دبێژنە ڤێ چەندێ پاراسایكولوژی، یان ژی دبێژنێ تیلپاسی*، فالڤەكرن، دەرووناسی. دبێژنە هندەكێن دی ژی ڕۆحانیەت، فەلەكناسی و میزناسی*"

- "كا جارێ ڕاست بەرسڤا من بدە، ئەرێ تو د وێ باوەرێ دای كو ئەڤ پەڕتووكە هەموو فەند و فێلن؟"

- "ب ڕاستی، بۆ فەیلەسۆفەكێ ڕاستەقینە نە یا جوانە بێژیت ئەو هەموو پەڕتووك هەموو هندی یەك نەدباشن. بەلێ پا چ ئاریشە نینە ئەگەر بێژم كو هەموو ئەو ناڤێن بەری نوكە من ئاماژە پێكری، نەخشەیێ هوور یێ جهەكێ بن كو د ڕاستی دا چ هەبوون بۆ نەبیت. ل ڤێرێ گەلەك "وێنەیێن ئاشوپی" هەنە كو هیومی دڤێت بهاڤێژتە دناڤ ئاگری دا. گەلەك ژ ڤان پەڕتووكان هندی یەك سەربۆرا مرۆڤی پێزانین تێدا نینن."

- "ئەرێ بۆچی ئەڤ هژمارا زێدە یا پەڕتووكان ل سەر ڤان بابەتان دهێنە نڤیسین؟"
- "چاپكرنا وان پرۆژەیەكێ بازرگانی یێ مەزنە و ئەو تشتە یێ خەلكی دڤێت."
- "بۆچی؟ تو چەوا دبینی؟"

- "یا دیارە كو مەرەما وان تشتەكێ نهێنی یە، تشتەكێ هۆسا كو یێ جودا بیت داكو پۆسیدەییا ژیانا خوە یا ڕۆژانە پێ ژبیرڤە ببەن. ئانكو وەكو هندێ یە كارەك نە هند یێ گرنگ بیت و مرۆڤ ئەنجام بدەت."

- "مەرەما تە چیە؟"

---

* تیلپاسی Telepathy ئانكو كارتێكرنا ژ دوورڤە. هەردیسان شیانێن خواندنا هزرێن كەسەكێ دی.

*میزناسی Urology ئەو زانستە یێ گرنگیێ ددەتە خواندنا بوریێن میزێ و ئەو نەخوشیێن تووشی دبنێ.

- "ل ڤێرێ ئەم یێ دناڤ سەرهاتیەکا خوش دا دهێن و چین. ل ڕۆژا ڕۆهن و گەش، کارەکێ هونەری یێ جوان ل پێشچاڤێن مە یێ سەرهلدەت، سۆفیا. ما ئەڤە نە تشتەکێ سەیرە؟"

- "ئەز ژی هۆسا هزر دکەم؟"

- "ئەرێ چ پێدڤی دکەت ئەم بچینە دەڤ ژنەکا فالڤەکەر یان کەسەکێ ئەکادیمی داکو ل تشتەکێ بالکێش یان سنوورشکێن؟"

- "ئانکو تو دبێژی هەموو ئەو کەسێن ڤان جۆرە پەڕتووکان دنڤیسن، د ڕاستی دا کەسێن درەوین و فێلبازن؟"

- "نەخێر. من وەنەگوتیە. لێ ئەم یێ بەحسێ سیستەمەکێ داروینی دکەین."

- "پێدڤیە پتر بۆ من ڕۆهن بکەی."

- "هزرا خوە د هەموو وان تشتێن جودا جودا دا بکە یێن د ڕوژەکا ب تنێ ڕوودەن. تو دشێی هەر ڕۆژەکا ژیانا خوە وەك نموونە وەربگری و پاشی هزرا خوە د هەموو وان تشتان دا بکە یێن تو دبینی یان ب سەرێ تە دهێن."

- "بەلێ."

- "نوکە و پاشی، هندەك سەربۆرێن سەیر ژی دێ هێنە د ڕێکا تە دا. دبیت تو بچیە دکانەکێ و بایێ 28 کورونان تشتان بکری. پاشی دێ جوانا هێت و وان 28 کورونان بۆ تە زڤرینیت یێن بەری هینگێ ژ تە ڤەرکرین. پاشی هوون هەردوو بڕیارێ بدەن بچنە سینەمایێ و کورسیکا ژمارە 28 ببیتە جهێ تە یێ ڕوونشتێ."

- "بەلێ. ئەڤە ڕێکەفتەکا سەیر و ئالۆزە."

- "هەرچەوا بیت، ئەو ب تنێ ڕێکەفتە. لێ ئاریشە ئەوە خەلك ڤان جۆرە ڕێکەفتان کوم دکەن، هەموو سەربۆرێن ڤەشارتی یان یێن چ شرۆڤەکرن دی بۆ نەی کوم دکەن. دەمێ ئەو ڤان سەربۆران ژ ژیانا بلیونەها خەلکی کوم دکەن و دکەنە پەڕتووك، وەکو هندەك داتایێن ڕاستەقینە لێ دهێن و بۆ خەلکی وەکو هندەك بەلگەیێن ڕازیکەر لێ دهێن. بڕا ڤان سەربۆران ڕۆژ بۆ ڕۆژێ زێدەتر لێ دهێت، لێ ئەڤ چەندە وەکو یاریا تاڤیکرنا بەختی یە، ب تنێ هژمارەیێن سەرکەفتی دیار دبن."

- "بەلێ پا هندەك كەسان شیانێن ڕۆحانی یان فالڤەكرنێ هەنە، مانە هۆسایە، كو د هەمبوو سەردەمان دا ئەو ڤی كاری دكەن؟"

- "چ پێنەڤێت. بەلێ پا دەمێ ئەم فالڤەكەران ددەینە ڕەخەكی، ئەم دشێین شرۆڤەكرنەكا تا ڕادەیەكی ڕازیكەر بۆ ڤان سەربۆرێن ڤەشارتی بدەست ڤە بینین."

- "ئانكو چەوا؟"

- "بیرا تە دهێت بەری نوكە مە بەحسێ تیورا فرۆیدی ل دور بێئاگەهیێ كربوو..."

- "چ پێنەڤێت."

- "فرۆیدی دیاركر ئەم گەلەك جاران دشێین وەكو ڕۆحانیەكی بۆ بێئاگەهیا خوە كار بكەین. دبیت ژ نیشكەكێ ڤە خوە ببینین كو یێ هزرا خوە د تشتەكی دا دكەین و كارەكی دكەین بێ ب دروستاهی بزانین كا بۆچی ئەم وەدكەین. لێ ئەگەرێ ڤێ چەندێ بۆ هندێ دزڤڕیت كو مە گەلەك سەربۆر و هزركرن و بیرهاتن د ناخێ خوە دا هەنە كو ئەم هەست پێناكەین یان مە ئاگەهـ ژێ نینە."

- "ێ پا؟"

- "هندەك جاران مرۆڤ دبینیت د خەونێ دا یێ دئاخڤیت یان بڕێڤە دچیت. ئەم دشێین بێژینە ڤێ چەندێ جۆرەكێ "ئوتوماتیكی یا ئەقلی". هەردیسان ل دەمێ نڤاندنا موگناتیسی دا دبیت مرۆڤ هندەك تشتان ژ دەڤ خوە بێژیت یان بكەت. بیرا خوە ل فەیلەسۆفێن سریالی بینە دەمێ پێكۆل دكری "نڤیسینا ئوتوماتیكی" بەرهەم بینن. وان ب تنێ پێكۆل دكر وەكو ناڤەندگێڕەكی* بن دناڤبەرا خوە و بێئاگەهیا خوە دا."

- "بیرا من دهێت."

- "د هەیاما چەرخێ بیستێ دا، جار جارە هشیاربوونا ڕۆحانیەتێ تێدا دەردكەفت. بیرۆكە ل ڤێرێ ئەوە كو كەسێ ناڤەنگێڕ دشێت پەیوەندیێ دگەل مریەكی بكەت، ئەو ژی ب ڕێكا دەنگێ كەسێ مری یان ژی نڤیسینا ئوتوماتیكی پەیاما وی كەسی دێ وەربگریت كو بەری نوكە ب پێنج یان پێنجی یان ژی چەند سەد سالەكان ژیایە. ئەڤ چەندە ژی وەكو بەلگەیەكی یە بۆ وێ گوتنێ كو ژیان پشتی مرنێ هەر یا بەردەوامە یان ژی مە گەلەك ژیان هەنە."

---

* ناڤەندگێر Mediator یان ژی الوسیگ.

- "بەلێ. ئەز دزانم."

- "ئەز نابێژم هەموو ناڤەندگێڕ د فێلبازن. هندەك ژ وان نیزەكا باش هەبوو و ب ڕاستی ژی ئەو ناڤەندگێڕ بوون، لێ پا ئەو ب تنێ دناڤبەرا خوە و بێئاگەهیا خوە ناڤەندگێڕ بوون. چەندین نموونە ناڤەندگێڕیێ ب هووری هاتینە خواندن و پاشی زانین و شیانێن هۆسا تێدا دیاربووینە كو نە وان و نە كەسێن دی زانیە كا چەوا ئەڤ شیانە ب دەست خوە ڤە ئینانە. بۆ نموونە. ژنەكێ كو چ زانیاری ل سەر زمانێ عیبری نەبوون لێ وێ پەیامەك ب زمانێ عبری گەهاند. ژبەر هندێ دبیت مرۆڤ بەری نوكە ژی جارەكێ ژیابیت یان پەیوەندی دگەل ڕۆحا مریان هەبیت."

- "تە باوەری ب كیژ وان بۆچوونان هەیە؟"

- "پاشی دەركەفت وێ ژنێ دایكەكا جوهی هەبوو دەمێ كو هێشتا یا زارۆك."

- "ئاها."

- "ئەرێ ڤێ چەندێ تو بێ هیڤی كی؟ بەلێ پا ئەڤ تشتە دیار دكەت كا چەوا مرۆڤەكی ئەو شیان هەنە بشێت پێزانین و سەربۆران دناڤ بێئاگەهیا خوە دا بهەلگریت."

- "ئەز دزانم كا مەرەما تە چیە؟"

- "ئەم دشێین هژمارەكا مەزن یا ڕوودانێن سەیر ب ڕێكا تیورا فرۆیدی ل دور بێئاگەهیێ شرۆڤە بكەین. دبیت ژ نیشكەكێ ڤە تێلەفۆنەك ژ دەڤ هەڤالەكێ من بهێت، كو چەندین سالان دەنگوباسێن وی گوهلێنەبووینە، ل وی دەمێ من دڤیای ل ناڤێ وی دناڤ لیستا ناڤان دا لێبگەرییێم."

- "ئەڤ چەندە من دترسینیت؟"

- "بەلێ پا ئەم دشێین شرۆڤەكرنا ڤێ ڕوودانێ بۆ هندێ بزڤرینین كو ڕەنگە ل وی دەمی مە هەردووكان گوهداریا وێ سترانێ كربیت یاكو بۆ دوماهیك جار دەمێ ئەم دگەل هەڤدوو مە گوهلێبووی. خالا بابەتی د هندێ دایە كو كەسێ ژ مە ئاگەهـ ژ وێ پەیوەندیا ڤەشارتی نینە."

- ئانكو ئەڤ چەندە ژی هەموو فێلەكە، یان ژی كاریگەریا ژمارەیێن سەركەفتی یێن بەختی نە یان ژی بێئاگەهیا مرۆڤی یە. مانە هۆسایە؟"

- "باشە. د هەر بارەکی دا، پا باشترە ب گومانەکا مەزن ڤە نێزیکی وان پەرتووکان ببین ب تایبەت هەکە کەسەك فەیلەسۆف بیت. ل ئینگلترا رێکخراوەکا تایبەت بۆ گومانکاران هەیە. بەری چەندین سالان وان پارەیەکی مەزن بۆ یەکەم کەس دانا کو بشێت بەلگەیەکی ل سەر تشتەکێ ل سەر سروشتی دا دیار بکەت. مەرج نینە ئەو تشت موعجیزەیەکا مەزن بیت، بەلکو نموونەیەکا تیلیپاسی یا بچووك ژی بەسە. بەلێ پا هەتا نوکە کەس نەشیایە بهێتە پێش و بەلگەیەکێ هۆسا پێشکێش بکەت."

- "ممم."

- "ژلایەکێ دی ڤە، چەندین تشت هەنە ئەم مرۆڤ تێناگەهین. دبیت ژی هێشتا ئەم د یاساییێن سروشتی نەگەهشت بین. د هەیاما چەرخێ بوری دا، هژمارەکا مەزن یا خەلکی د وێ باوەرێ دابوون کو دیاردەیێن وەکو موگناتیس و کارەبێ جۆرەکێ سێرێ نە. ئەو یێ پشراستم نوکە دا چاڤێن داپیرا من یا مەزن زیق بن هەکە من بەحسێ تێلەڤزیون یان کومپیوتەری بۆ کربایە."

- "باشە تە باوەری ب تشتەکێ د سەر سروشتی دا هەیە؟"

- "بەری نوکە ژی مە ل سەر ڤێ چەندێ ئاخفتبوو. هەتا زاراڤێ "سەر سروشتی" دا ب خو ژی یێ سەیرە. نەخێر. ئەز د وێ باوەرێ دا مە کو مە ب تنێ یەك سروشت هەیە و ئەو ب خوە ژی گەلەك یێ سەیرە."

- "باشە پا هەموو ئەو تشتێن سەیر یێن دناڤ پەرتووکێن تە نیشا من داین؟"

- "هەموو فەیلەسوفێن راستەقینە دڤێت چاڤێن خوە بهێلنە ڤەکری. خو هەکە مە چ جاران قەلەرەشك نەدیتبن، نابیت چ جاران ئەم براوەستین و لێنەگەرین. دبیت جارەکێ کەسەکێ گوماندار یێ وەکو من ژی نەچاربیت باوەر ژ وان دیاردەیان بکەت یێن بەری هینگێ وی باوەری پێ نەی. ژبەر هندێ دەرگەهێ ڤێ پێشبینیێ نەهێلمە ڤەکری، ل وی دەمی دێ بمە کەسەکێ باوەردار و فەیلەسۆفەکێ نەراستەقینە."

ئەلبێرتۆ و سۆفیا ب بێدەنگی ل سەر کورسیکێ مان بێ کو چ تشتێ دی بێژن. کوتران ملێن خوە درێژ دکرن و دەنگ ژ خوە دئینا. جار جارە ژی ژبەر دەنگێ پایسکلەکێ یان لڤینەکێ ژ نیشکەکێ ڤە دترسیاین.

ل دوماهیێ سۆفیایێ گوت: "پێدڤیە ئەز بچمە مال و خوە بۆ ئاهەنگێ بەرهەڤ بکەم."

- "بەلێ پا بەری ئەم ژێکڤە بین، ئەز دێ قەلەڕەشکەکا سپی نیشا تە دەم. گەلەك ژ وێ چەندێ مەزنترە یا ئەم هزر دکەین. تە دیت."

ئەلبێرتۆ ڕابووڤە و ب دەستێ خوە ئاماژە کرە پەڕتووکخانێ کو دڤێت جارەکا دی بچنە وێرێ. ڤێ جارێ ئەو ب ڕەخ پەڕتووکێن د سەر سروشتی ڕا بورین. ل دوماهیا هۆلێ ئەو ل هەمبەر ڕەفانکەکا زراڤ ڕاوەستیان و کارتەکا بچووك ب سەرێ وێ ڤە هاتبوو هەلاویستن ل سەر نڤیسابوو "فەلسەفە".

ئەلبێرتۆی ئاماژە ب پەڕتووکەکا دەستنیشانکری کر و دەمێ چاڤێن سۆفیایێ ب ناڤونیشانێن وێ کەفتی دلێ وێ ڕاوەستیا "جیهانا سۆفیایێ."

- "تە دڤێت ئەز ڤێ پەڕتووکێ بۆ تە بکڕم؟"
- "ئەز نزانم کا ئەز دوێرم بێژم ئە یان نە."

پشتی هینگێ ب دەمەکێ کێم، سۆفیا بەرەڤ مال چوو و پەڕتووك د دەستەکێ وێ دا بوو و د دەستێ دی ژی دا کەلوپەلێن ئاهەنگێ هەلگرتبوون.

# ئاهەنگا دناڤ باخچەی دا

...قەلەڕەشکا سپی...

**هێلد ل سەر جهێن خوە ڕوونشتبوو و واستیانەکا مەزن ل سەر دێمێ وێ پەیدابببوو. وێ هەستپێکر دەست و پێن وێ پێن دلەرزن، ب تایبەت دەمێ فائیلە هەلگرتی.**

**دەمژمێر نێزیکی یازدێ بوو، ئانکو ئەو پتر ژ دوو دەمژمێران بوو وێ دەست ب خواندنێ کری.، هندەک جاران سەرێ خوە بلند دکر و ب دەنگەکێ بلند دکرە کەنی، هندەک جاران ژی خوە وەردگێڕا سەر تەنشتا خوە و هەناسەیێن کوور هەلدکێشان، باش بوو وێ ڕۆژێ ئەو ب تنێ ل مال بوو.**

**سەیرە، د ماوەیێ دوو دەمژمێران دا ب تنێ وێ ئەڤ پیچکە خواندیە! پاشی وێ ژ وی جهی دەست ب خواندنێ کر دەمێ سۆفیایێ ڤیای سەرنجا مایجەری بڕاکێشیت، سوواری دارەکێ بوو، لێ ڤاژا مۆرتن وەکو فریشتەیەکێ ژ لوبنانێ هات و ئەو ڕزگار کر.**

**سەرەڕای بورینا گەلەک سالان، لێ هێشتا بیرا هێلدێ دهێت دەمێ بابێ وێ چیرۆکا گەڕیانا نیلز هۆلگیرسنی یا سەیر بۆ خواندی. هەردیسان بیرا وێ هات کا چەوا پشتی بورینا چەندین سالان ژی، هێشتا ئەو چیرۆک وەکو نهێنیەکێ بوو دناڤبەرا وان دا. نوکە ژی جارەکا دی یا ڤێ ڤاژا پیر بکاردئینیت.**

**پاشی سۆفیایێ خوە وەك مێهڤانەکا بیانی دناڤ کافێیێ دا دیت. هێلدێ پێکۆل دکر هەمو ئاخفتنێن ئەلبێرتۆی دەمێ بەحسێ سارتەر و هەبوونخوازیێ بۆ سوفیایێ دکری**

**ژبەر بکەت. تا ڕادەیەکی شیا باوەریێ بۆ سۆفیاییێ چێکەت کو ئەڤ هەلویستە، هەلویستێ یەکانە یێ گونجایە، لێ بەری هینگێ ژی باوەری ب چەندین فەلسەفەیێن دی ئینابوو.**

**بەری سالەکێ، هێلدێ پەڕتووکەك ل دور زانستێ ستێرناسیێ کریبوو، پشتی هینگێ دیاریەکا بەختی کریبوو و ل دووڤ دا ژی پەڕتووکەك دەربارەی ڕۆحانیەتێ کریبوو. هەموو جاران بابێ وێ ئەو ئاگەهدار دکر و پەیڤێن مینا "ئەفسانە" و"هەستێن ڕەخنەیی" دگەل وێ بکاردئینان. نوکە دەمێ وی هات و تۆلا خوە ژ وێ ڤەکر. هۆسا دیار بوو کو بابێ وێ نەدڤیا کچا وی بێی هەبوونا زانینەکا تێروتەسەل ل دور ڤان بابەتان مەزن ببیت. داکو ئەو ژ ڤێ چەندێ پشتڕاست ببیت، شاشەیەکا تێلەڤزیونێ بۆ بەرهەڤ کربوو. لێ ئەگەر وی ئەڤ چەندە نەکربا باشتر بوو!**

**لێ تشتێ ژ هەمووان پتر سەرنجا وی ڕاکێشای، ئەڤ سۆفیایە بوو. سۆفیا... تو کی؟ تو خەلکا کیڤەیی؟ بۆچی تو هاتیە دناڤ ژیانا من دا؟**

**ل بەشێ دوماهیێ، سۆفیاییێ پەڕتووکەك دەربارەی خوە د پەڕتووکخانێ ڤە دیت، ئەرێ تو بێژی ئەڤە هەمان ئەو پەڕتووك بیت یا نوکە ل بەر دەستێن هێلدێ؟ نەخێر، ئەڤە ب تنێ چەند کاغەزەکن، بەلێ ئەو چ بالۆلکە. چەوا چێدبیت ئەو دناڤ پەڕتووکەکێ ژیانا خوە دناڤ پەڕتووکەکا دی دا ببینیت؟ ئەرێ دێ یا چەوا بیت ئەگەر سۆفیا نوکە وێ پەڕتووکێ بخوینیت؟**

**هێلدێ ئەو بەرپەڕێن دناڤ دەستێن خوە دا هژمارتن و هەستپێکر چەند بەرپەڕەکێن کێم یێن ماین.**

چاڤێن سۆفیاییێ ل دەمێ ڤەگەڕیانێ دناڤ پاسێ دا ب دایکا وێ کەفتن. چ بەختەکێ ڕەشە! ئەرێ دایکا وێ دێ چ بێژیت دەمێ وێ پەڕتووکا دناڤ دەستێن وێ دا ببینیت؟

سۆفیاییێ پێکۆل کر وێ پەڕتووکێ بکەتە دناڤ زەرفی دا و دگەل پڤدانك و تشتێن دی یێن بۆ ئاهەنگێ کرین بڤەشێریت، لێ نەگەهشت وە بکەت.

- "هێ... ئەڤە جارەکا دی د یەك پاس دا دێ زڤڕینە مال، چ ڕێکەفتەکا جوانە!؟

- "وەیە..."

- "تە پەڕتووکەك کریە؟"

- "نەخێر، ب دروستاهی من نەکریە."

- **"جیهانا سۆفیایێ... چ ناڤەکێ سەیرە!"**

هەر بلەز بۆ سۆفیایێ دیاربوو کو ڤێ جارێ وێ چ دەرفەت نینن خوە قورتال بکەت و درەوەکێ یان هێجەتەکێ بگریت.

- "ئەلبێرتۆی یا بۆ من کریە دیاری."

- "نە تشتەکێ سەیرە، ئەز گەلەك حەز دکەم ب زووترین دەم وی زەلامی ببینم. ئەرێ ئەز دێ شێم سەحکەمە وێ پەڕتووکێ؟"

- "تۆ دشێی خوە بگری هەتا ئەم دگەهینە مال، ئەڤ پەڕتووکە ژی یا منە دادێ."

- "دێ مالا تە، نێ ئەز دزانم ئەو پەڕتووکا تە یە، لێ من دڤیا تەماشەی بەرپەڕێ یەکێ یێ وێ پەڕتووکێ بکەم، دێ..."

- "سۆفیا ئاموندسن ژ ڤوتابخانێ زڤڕی، بۆ ماوەیەکی ئەو ب ڕێکێ ڤە دگەل هەڤالا خوە جوانایێ بوو و بەحسێ مرۆڤێن ڕۆبوت دکرن."

- "ئەرێ ژ ڕاستا ئەڤ تشتە تێدا هاتینە نڤیسین؟"

- "بەلێ. ئەڤ پەڕتووکە ژ لایێ کەسەکی ب ناڤێ ئەلبێرت کناگ یا هاتیە نڤیسین. یا دیارە ئەڤە یەکەم جارە ئەو تشتەکێ دنڤیسیت.. باشە پا ناڤێ بابێ هەڤالێ تە ئەلبێرتۆی چیە؟"

- "کنوکس."

- "ئەز یا پشتڕاستم ڤی کەسێ سەیر ئەڤ پەڕتووکە ل سەر تە یا نڤیسی و پاشی ناڤەکێ خوازراو بۆ خوە یێ بکارئینای."

- "نەخێر دادێ هۆسا نینە، باشترە تو ڤی بابەتی بهێلی، وەکو دی ژی تو چ ژ ڤان بابەتان تێناگەهی."

- "تو وە دبێژی؟ ... چ نینە! سوباهی سپێدێ ئاهەنگا باخچەی دێ دەستپێکەت و ل دوماهیێ هەموو تشت دێ وەکو بەرێ زڤڕن."

- "ئەلبێرت کناگ د کەتوارەکێ دی دا دژیت، ژبەر هندێ ئەڤ پەڕتووکە وەکو قەلەڕەشکەکا سپیە."

- "باشە. ئەڤ چەندە نوکە بەسە، مانە بەری نوکە ژی بەحسێ کێڤریشکەکێ دکر!"

- "باشە، دا بابەتی بگرین."

پاسە گەهشتە تاخێ کلۆڤەر، لێ دەمێ ل پاسێ هاتینە خوارێ، کەفتنە بەرامبەر خوەنیشاندانەکا مەزن. دایکا وێ کرە هەوار و گوت: "ئەڤە چیە دیسان؟ ، من هزرکر دێ ل ڤی تاخی ژ خوەنیشاندانان ڕزگار بین!"

ژمارەیا وان کەسێن خڕڤەبوون ئەنجامدای، ژ دەهـ بۆ دوازدە کەسان نەدبووری و هندەك لافیتە بلند کربوون و ل سەر نڤیسابوو:

***مایچەر ل ڤان نێزیکان دێ زڤڕیت***

***بەلێ، ل ئاهەنگا جەژنا ڤەشە یوحەنای***

***داخوازا دەستهەلاتەکا بەرفرەهتر بۆ نەتەوەیێن یەکگرتی دکەین***

هەتا ڕادەیەکی دلێ سوفیایێ ب دایکا وێ ڤە بوو و گوت: "هۆسا هزر بکە ئەم ل ڤێرە نینین."

- "لێ ئەڤ خوەنیشاندانە یا سەیرە سۆفیا، یا بێ ڕامانە."

- "گوهێ خوە نەدەیێ. چ نینە."

- "هندی دەم بچیت ئەڤ جیهانە هەر دێ د گوهۆڕینان دا بیت، بۆ من ب خوە نە تشتەکێ سەیرە."

- "لێ پێدڤی بوو بۆ تە یا سەیر با کا بۆچی ئەڤ چەندە بۆ تە د سەیر نینن."

- "بەلێ پا ئەڤ کەسە د توند نینن، ب پیان ڤە نەچوویە سەر گولێن ناڤ باخچەی و نەئینانە دەرێ. ئەرێ ئەز نابینم چ مفایەك تێدا بیت ئەو دناڤ باخچەی دا خڕڤە بووین. دا زوو بچینە د ژوور ڤە."

- "ئەڤە خوەنیشاندانەکا فەلسەفی یە دادێ، خوەنیشاندەرێن فەلسەفی چ جاران پێ ل گولان نادانن."

- "ژ ڕاستا، سۆفیا؟ ئەرێ ما هێشتا فەیلەسۆفێن ڕاستەقینە ماینە. من باوەری ب ڤێ چەندێ نەمایە، چونکی د سەردەمێ ئەڤرۆکە دا هەموو تشت بووینە بازرگانی."

پشتی هینگێ وان دەمێ خوە یێ مایی و شەڤبیریا خوە ب بەرهەڤکرنا پێدڤیێن ئاهەنگێ ڤە بوراند. ل ڕۆژا پاشتر ژی جوانا هاتە مالا وان و هاریکاریا وان کر و مێزێن باخچەی خەملاندن. دەمێ ئەو گەهشتیە دناڤ باخچەی دا یەکسەر گازی وێ کر و گوت: "دوماهیك دەنگوباسێ من یێ نەخوش بۆ هەوە! دایك و بابێن من ژی دێ ل ئاهەنگێ ئامادەبن، هەموو تو ئەگەر بووی سۆفیا."

نیڤ دەمژمێرێ بەری مێهڤان ئامادەببن، هەموو تشت هاتبوونە بەرهەڤکرن، دارێن دناڤ باخچەی دا ب پەڕکێن ڕەنگاوڕەنگ و چرایێن یابانی یێن جوان هاتبوونە خەملاندن. دارێن دناڤ باخچەی دگەل دەرگەهێ ژ دەرڤە یێ مالێ ژی ب پڤدانکان خەملاندبوون کو بەری هینگێ سۆفیایێ و جوانایێ پێکڤە ئەو پڤدانك پڤدابوون.

ل سەر مێزەیا خوارنێ ژی، مریشك و زەلاتە و نان و سەمۆنە ل سەر هاتبوونە دانان، زێدەباری چەندین جۆرێن کێك و شیرینیاهیان ئامادە کربوون. بەری وان کێکان هەمووان بیننە دناڤ باخچەی دا، کێکەکا جەژنا بوونێ دانابوو سەر نیڤا مێزێ و بووکەك ژی ل سەر سەرێ وێ کێکێ دانابوو. ب ڤێ چەندێ هۆسا دیار دکر کو کەسەك د ڤێ ڕۆژێ دا دێ مەسیحیبوونا خوە ڕاگەهینیت. دایکا سوفیایێ د وێ باوەرێ دا بوو ئەو بووك دشێت خولکێ کچەکا پازدە سالی ژی بدەت، سۆفیا ژی د وێ باوەرێ دابوو دایکا وێ ل سەر خاترا کچا خوە ئەو بووك یا هەلبژارتی، چونکی سۆفیایێ هێشتا ب دروستاهی بڕیار نەدابوو ببیتە مەسیحی، دایکا وێ هۆسا هەستپێدکر کو ڕۆژا مەسیحیبوونا کچا وێ دناڤ وێ کێکێ دا بیت. بەری مێهڤان بگەهن، دایکا وێ گوت: "دڤێت تو بزانی کو ئەز نە دایکەکا نەمەردم."

یەکەم کاروانێ مێهڤانێن ئاهەنگا سۆفیایێ گەهشتن، ل دەستپێکێ سێ کچێن پۆلا وێ هاتن کو قەمیسێن هاڤینێ دگەل تەنۆرەیێن کورت کربوونە بەر خوە و شالێن تەنك دانابوو سەر ملێن خوە و چاڤێن خوە ژی کلدابوون.

ل دووڤ دا دوو کورِ ژی هاتن کو ئەو ژی یورجن و لارس بوون. ئەو هێدی هێدی هاتنە د ژوور ڤە و پیچەك د شەرمین بوون، لێ ب ڕەنگەکێ هۆسا خوە دیار دکرن کەس نەزانیت یێ هەست ب شەرمێ دکەن.

- "چەوانی، جەژنا بوونا تە پیرۆزبیت."
- "ئێدی ژ ئەڤرۆ پێڤە تو ژی مەزن بووی."

هەر ل دەستپێکێ سۆفیایێ زانی کو جوانا و یورجن یێ ب نهێنی ڤە تەماشەی هەڤدو دکەن، ئێڤاریا جەژنا یوحەنایە و دیاربوو تشتەك دێ ڕوودەت. هەمووان ژی دیاری دگەل خوە ئینابوون.

ئاهەنگ ئاهەنگەکا فەلسەفی بوو، چونکی هەموو ئەو کەسێن د ئامادە پێکۆل دکر تشتەکێ دەربارەی فەلسەفێ بزانن. هەرچەندە هەمووان نەشیابوو دیاریەکا فەلسەفی بۆ وێ بینن، لێ هندەکان شیابوو نڤیسینەکا فەلسەفی ل سەر دیارییێن خوە بنڤیسن. سۆفیایێ فەرهەنگەکا فەلسەفی و دەفتەرکەکا بچووك کو ب کلیلکێ دهاتە قوفلکرن ب دیاری وەرگرتبوو، ل سەر بەرگێ وێ ژی نڤیسیبوو: "تێبینییێن فەلسەفی یێن کەسایەتی".

هەر دگەل هاتنا مێهڤانان، دایکا وێ پەرداخێن درێژ تژی شەربەتا سێڤان دکرن و ل سەر مێهڤانان دابەش دکرن. دایکا وێ ئەڤ مێهڤانداریە هەموو کربوو ستۆیێ خوە.

- "بخێرهاتن... ئەرێ ناڤێ تە چیە؟ ئەز هزردکەم ئەڤە یەکەم جارە ئەز تە دبینم."
- "ئاه سیسیلیا! ئەز گەلەك پێخوشحال بووم تو ژی بەرهەڤ بووی."

ئەو گەنجێن ئامادەبوویی هەمووان جهێن خوە گرتبوون، کوپێن شەربەتێ د دەستێن وان دا بوون و کەفتبوونە سحبەتێ، پاشی دایك و بابێن جوانایێ هاتن و ترۆمبێلا

خوه ل بەر دەرگەهی ڕاوەستاند. شیرەتکارێ دارایی ڤاتەکا ڕەنگ گەور یا جوان کربوو بەر خوە، هەڤژینا وی ژی کراسەکێ سۆر یێ ب پیلەك د بەردابوو.

بۆ سۆفیایێ یا سەیر نەبوو کو دایکا جوانایێ چووبیتە فرۆشگەهەکێ و بووکەکا "باربی" کری بیت، پاشی چووبیتە درینگەهەکێ و داخوازا درینا دەستەکێ جلکان بۆ وێ بووکێ ژێ کربیت. دبیت شیرەتکارێ دارایی ئەو بووك کڕی بیت و بربیتە دەڤ سێربەندەکێ و بۆ کربیتە ژنەکا ڕاستەقینە.

دەمێ ئەو ژ مارسێدسا خوە یا سپی هاتینە خوارێ و بەرەڤ باخچەی چووین، هەموو گەنجان ب حێبەتی ڤە تەماشەی وان دکر. شیرەتکاری ب دەستێن خوە ئەو دیاری ب ناڤێ بنەمالا ئینگەربریگستنێ پێشکێشکر. سۆفیایێ ئەو دیاری ڤەکر و بووکەکا باربی تێدا بوو. وێ پێکۆل کر ب ئارامی وەربگریت، لێ جوانایێ نەشیا خوە و خوە لێ دا و گوت: "ئەرێ ما هوون دین بووینە، یا ژ هەوە هێشتا سۆفیا یاریان ب بووکا شووشەیی دکەت؟"

خاتینا ئینگەربریگستن دگەل خشخشا پیلەکێن کراسێ خوە بەرسڤا وێ دا و گوت: "ب تنێ بۆ خەملاندنا ژوورا وێ یا نڤستنێ یە، جوانا."

سۆفیایێ ب زمانەکێ هۆسا گوتێ کو وان ئارام بکەت: "هەر چەوابیت ئەز گەلەك سوپاسیا وە دکەم."

پاشی مێهڤان هەموو ل دور مێزێ کومبوون.

دایکا وێ ب دەنگەکێ نزم ڤە بێ کو بشێت دوودلیا خوە بڤەشێریت، گوت: "باشە، نوکە ب تنێ ئەلبێرتۆ یێ مایی، ئەم دێ ل هیڤیا وی مینین."

پاشی مێهڤانان دبن لێڤکان ڕا بەحسێ وی مێهڤانێ گرنگ کر.

- "وی سۆز یا دای کو بهێت، ئەو دێ هەر هێت."
- "ئەرێ ما نابیت بێ ئامادەبوونا وی ئەم دەست پێبکەین؟"
- "بەلێ بۆچی چێنابیت، فەرموون بڕوونن."

- "دایكا سۆفیایێ بخێرهاتنا مێهڤانان كر و هەموو ل دەوروبەرێن مێزێ ڕوونشتن، كورسیەكا ڤالاً د ناڤبەرا خوە و سۆفیایێ دا هێلا و بەحسێ سەقایێ ڕۆژێ كر و پاشی ل سەر ژیانا سۆفیایێ ژی ئاخفت و گوت نوكە سۆفیا یا بوویە ژنەكا پێگەهشتی.

پشتی بورینا نیڤ دەمژمێرێ، زەلامەك كۆ ژیێ وی نێزیكی چل سالیێ بوو، هاتە دناڤ باخچەی دا، ڕهێن وی د ڕەش بوون و كولاڤەك ل سەرێ وی بوو و پازدە گولێن سۆر د دەستێ وی دا بوون.

- "ئەلبێرتۆ."

سۆفیا چوو پێشوازیا وی و ئەو گولێن د دەستێن وی دا ژێ وەرگرتن، پشتی دەمەكێ ئەلبێرتۆی دەستێ خوە هاڤێتە بەریكا چاكیتێ خوە و هندەك یارییێن ئاگری ژێ دەرێخستن و ب ئەسمانی دا پەقاندن، پاشی شەمالكەك هەلكر و دانا د نیڤا كێكێ دا. چوو نك وێ كورسیا ڤالاً ئەوا د ناڤبەرا سۆفیا و دایكا وێ دا و گوت: "ئەز یێ بەختەوەرم كو ئەڤرۆكە ل ڤێرێ ئامادە بوویم."

هەموو ئامادەبوویی بێدەنگ مابوون، خاتین ئینگەربریگستنێ دبن چاڤكان ڕا تەماشەی هەڤژینێ خوە كر، دایكا سۆفیایێ گەلەك یا كەیفخۆش بوو ب هاتنا ئەلبێرتۆی، ژبەر هندێ ب هەر تشتەكی یا ڕازی بوو، سۆفیایێ ژی نەشیا كەنیا خوە یا وەكو دینان بڤەشێریت. دایكا سۆفیایێ دڤیا بئاخڤیت، ژبەر هندێ چەندین جاران ل سەر یەك كەچك ل گلاسێ ل بەر سینگێ خوە دا وەك نیشانەك بۆ بێدەنگبوونێ.

پاشی گوت: "دا ئەم هەموو پێكڤە بخێرهاتنا ئەلبێرتۆ كنۆكسی بكەین بۆ هاتنا وی ژ بۆ ڤێ ئاهەنگا فەلسەفی یا بچووك دا. من دڤێت بۆ هەوە دیار بكەم ئەڤ زەلامە نە ئەڤینداریێ من یێ نوویە. ڕاستە هەڤژینێ من گەشتێن دوور و درێژ ئەنجامددەت، لێ نوكە من چ ئەڤیندار نینن. ئەڤ زەلامێ هوون دبینن مامۆستایێ فەلسەفێ یێ سوفیایێ یە، ئەو زەلامەكێ سەیرە، ژ بلی پەقاندنا یارییێن ئاگری، ئەو دشێت چەندین كارێن دی ژی بكەت، بۆ نموونە ئەو دشێت كێڤریشكەكا سپی یا ساخ د كولاڤەكێ درێژ دا بینتە دەرێ، ئەرێ كێڤریشك بوو یان قەلەڕەشكا سپی بوو سۆفیا؟"

- "گەلەك سوپاس."

ئەلبێرتۆی ب تنێ ئەڤ ئاخفتنە گوت و ڕوونشت.

سۆفیایێ گلاسا خوە یێ شەربەتێ بلند کر و ب دەنگەکێ بلند گوت: "ب خۆشیا هەوە، نۆشی جان بیت."

بۆ دەمەکی، هەموو ئامادەبوویی بێدەنگ بوون و مژوولی خوارنێ بوون. ژ نیشکەکێ ڤە جوانا بەرەڤ کورسیکا یورجینی ڤە چوو و ماچەك ل لێڤێن وی دا و ب توندی لێڤێن وی گڤاشتن، دا کو ب باشی ئەو ژی بشێت لێڤێن وێ بگریت، ڕابوو ژ پیان ڤە و پشتا جوانایێ ل سەر مێزێ خوارکر.

خاتین ئینگەربریگستنێ کرە هەوار: "ئەڤ دیمەنە دێ من دلگرتی کەت!"

دایکا سۆفیایێ گوت: "هیڤی دکەم ل سەر مێزێ ڤی کاری نەکەن."

ئەلبێرتۆی بەرێ خوە دا دایکا سۆفیایێ و گوتێ: "ڤێجا بۆچی نە؟"

- "ڤێجا ئەڤە چ پرسیارە!"
- "لێ پرسیار کرن ژ دەڤ فەیلەسۆفەکێ ڕاستەقینە چ جاران نابیتە جهێ شەرمێ."

هندەك گەنجێن دی یێن کەس نەبووی وان ماچی بکەت، هەستیکێن مریشکا دهاڤێتنە سەربانی، ڤێ چەندێ ژی وەکر کو دایکا سۆفیایێ تۆڕە بیت.

- "بێزەحمەت وەنەکەن! چونکی هەستیکێن مریشکا دێ ئاڤرێژا بانی گرن."
- "داخوازا لێبورینی دکەین."

یەك ژ وان گەنجان ئەڤ ئاختنە گوت و پاشی ل شوونا هەستیکان پاڤێژنە سەربانی، د پەرژانێ باخچەی وەرکرن. دایکا سۆفیایێ گوت: "ئەز دبێژم دا ئەم ڤان ئامانان ڕاکەین و شیریناهیان بدانین، چەند کەس ژ هەوە دێ قەهوێ ڤەخون؟"

ئەلبێرتۆی و دایك و بابێن جوانایێ و دوو مێهڤانێن دی دەستێن خوە بلند کرن.

- "سۆفیا و جوانا.. هوون دێ شێن هاریکاریا من بکەن؟"

ب وی ڕەنگی دەلیڤە بۆ هەردوو هەڤالان چێبوو پیچەکێ د لێنانگەهێ ڤە دگەل هەڤدوو باخڤن. سۆفیایێ پرسیار ژێ کر: " تە بۆچی ئەو ماچی کر؟"

- "دەمێ ئەز یا ڕوونشتی، من سەحدکرە دەڤێ وی و گەلەك دلێ من چوویێ و من نەشیا خوە ڕاگرم. د ڕاستی دا ئەز چ جاران نەشێم خوە بەرامبەر ڤی کوڕی ڕاگرم."

- "ئەرێ ماچا وی یا خوش بوو؟

- "ب ڕاستی نە یا هۆسا بوو وەکو من چاڤەڕێ دکری."

- " دیارە یەکەم جارە تو وی ماچی دکەی؟"

- "لێ نابیتە دوماهیك جار ژی"

پشتی دەمەکی، قەهوە و شیرینی ل سەر مێزێ هاتنە دانان، ئەلبێرتۆ ژی مژوولی بەلاڤکرنا یارییێن ئاگری بوو ل سەر وان زارۆکان، ڤێ جارێ دایکا سۆفیایێ کەفچکێ خوە ل کوپێ قەهوێ دا و دەست ب ئاخفتنێ کر.

- "من نەڤێت ئەز ل سەر هەوە درێژ بکەم، لێ ئەز دبێژم، من ب تنێ ئەڤ کچە یا هەی، نوکە هەشت ڕۆژ ب سەر ژ دایکبوونا وێ دەرباز بووینە. وەکو هوون دبینن مە نەمەردی نەکریە، ئەڤ کێکە ژی 24 پارچەیە، ب کێمی هەر یەك ژ مە پارچەیەك ب بەردکەڤیت، ئەوێ ل دەستپێکێ ژی دەستپێبکەت دشێت دوو پارچەیان بۆ خوە ڕاکەت، ژبەر کو چەند کێك دهێتە بڕین پارچێن وێ یێن بنی مەزنتر دبن. هەروەکو ژیانا مەیە، دەمێ سۆفیا یا بچووك ل دور چەند بازنەیێن بچووك دزڤڕی، چەند ئەو مەزنتر لێ دهێت بازنە ژی دگەل وێ مەزنتر لێ دهێن. ڕۆژا ژ دایکبوونا تە پیرۆز بیت سۆفیا."

دایکا جوانایێ ب دەنگەکێ بلند گوت: "گەلەك جوانە."

سۆفیایێ پرسیار کر کا مەرەما دایکا جوانایێ چ بوو، ئەرێ مەرەما وێ کێك بوو؟ یان گوتارا دایکا وێ بوو؟ یان ژی مەرەما وێ سۆفیا ب خوە بوو.

هەمووان دەست قوتان، یەك ژ وان گەنجان یاریەکا ئاگری بەرەڤ دارا هرمیکێ پەقاند، دیسان جوانا ڕابوو و بەرەڤ یورجینی ڤە چوو و ل سەر کورسیکا وی ڕاکر و بەرەڤ جهەکێ باخچەی ڤە چوون و دیسان دەست ب لێڤگرتنێ کر. شیرەتکارێ دارایی گوت: "هۆسا دیارە د ڤی سەردەمی دا ئێدی کچ دەستپێشخەرییێ دکەن."

پاشی ڕابووڤە و بەرەڤ دارێن ناڤ باخچەی ڤە چوو داکو بشێت وان ژ نێزیك ڤە ببینیت. هەموو کەسێن دی ژی ب دووڤ وی کەڤتن ب تنێ سۆفیا و ئەلبێرتۆ نەبن.

خاتین ئینگەربریگستنێ ب دەنگەکێ نزم گوت: "ئەز دبێژم ئەم نەشێین وان بڕاوەستینین." هەڤژینێ بەرسڤا وێ دا و گوت: "نەخێر، هەر تشتەك تشتەکی ڤەدکێشیت."

پاشی بابێ وێ ل دور خوە زڤڕی و ل هیڤیا کەسەکێ بوو پشتگیریا ئاخفتنێن وی بکەت، لێ دەمێ دیتی هەموو د بێدەنگن، گوت: "ئەم نەشێین مایێ خوە تێبکەین."

سۆفیایێ ب دامایی ڤە تەماشەی ئەلبێتۆی کو یێ دبێژیت: "هەموو تشت گەلەك بلەزتر دهێنە ڕوودان ژ وێ چەندێ یا ئەم پێشبینی دکەین. من دڤێت زوو ژ ڤێرێ بچم، لێ یا ل سەر من پێدڤیە بەری بچم هندەك پەیڤان پێشکێش بکەم."

سۆفیایێ دەستێن خوە لێکدان و گازی هەمووان کر و گوت: "هیڤیدارم هەموو ب ڕوونن، ئەلبێرتۆی دڤێت تشتەکی بۆ هەوە بێژیت."

ژ بلی جوانا و یورجنی، یێن دی هەموو هاتن بڕوونن. دایکا سۆفیایێ گوت: "ئەرێ ڕاستە تە دڤێت تو گوتارەکێ بۆ مە بخوینی؟ ئاه ئەڤە گەلەك یا ب دلێ منە!"

- "سوپاس بۆ گرنگیدانا تە!"

- "هۆسا دیارە تە گەلەك حەزا پیاسەکرنێ هەیە؟ پیاسەکرن بۆ جوانی و ڕاگرتنا لەشسڤکیا مرۆڤی گەلەك یا ب مفایە، لێ ب بۆچوونا من ئەگەر ل دەمێ پیاسێ سەیەك دگەل مرۆڤی دا هەبیت باشترە... ناڤێ سەیێ تە هێرمسە، مانە هۆسایە؟"

ئەلبێرتۆ ڕابوو ژ پێرڤە و دەست ب ئاخفتنێ کر.

- " خۆشتڤیا من سۆفیا، بەری ئەز دەست ب ئاخفتنا خوە بکەم، من پێخۆشە ئەز جارەکا دیتر بیرا هەوە بینم کۆ ئەڤە ئاهەنگەکا فەلسەفی یە، ژبەر هندێ ئەز ژی دێ بۆ هەوە گوتارەکا فەلسەفی خوینم."

بەری ئاخفتنا وی ب دوماهیك بهێت دەستقوتانەکا ب هێز بۆ وی هاتە قوتان و ئاخفتنا وی هاتە بڕین. پاشی وی بەردەوامی دا ئاخفنتنا خوە.

- "د ڤان جۆرە ئاهەنگان دا مرۆڤی پێدڤی ب گەلەك ئەقلی نینە، لێ هەرچەوا بیت دڤێت ئەم پیرۆزباهیا سۆفیایێ دکەین کو ژیێ وێ بوویە پازدە سال."

ژ نیشکەکێ ڤە دەنگێ فرۆکەیەکێ کو ب نزمی ل سەر باخچەی وان ڕا دفڕی هات، ئەو دەنگ هێدی هێدی بلندتر لێدهات هەتا فرۆکە گەهشتیە هنداڤی باخچەی و لافیتەیەکا درێژ ل دووڤ خوە ڕادکێشا کو ل سەر هاتبوو نڤیسین "جەژنا بوونا تە پیرۆز."

هەمووان ب دەنگەکێ بلند دەست بۆ سۆفیایێ قوتان. دایکا سۆفیایێ ب دەنگەکێ بلند گوت: "هەوە دیت! ب ڕاستی ژی ئەڤ زەلامە ژ بلی پەڤاندنا یارییێن ئاگری، گەلەك کارێن دی یێن سەیر دکەت."

- "سوپاس. ئەڤە نە تشتەکێ مەزن بوو، د ڤێ هەیاما بوری دا من و سۆفیایێ ڤەکۆلینەکا فەلسەفی یا مەزن کریە، نوکە ژی مە دڤێت بەرهەمێ وێ ڤەکۆلینێ بۆ هەوە دیار بکەین و نهێنیا هەبوونا خوە ئاشکرا بکەین."

هەموو بێدەنگ بوون، بێدەنگیەکا هۆسا بوو کو دەنگێ چووچکان و دەنگێ ماچێن جوانا و یورجنی دگەهشتە گوهێن وان. سۆفیایێ گوتێ: "بەردەوام بە."

- "پشتی ڤەکۆلینەکا کوور یا فەلسەفی، کو ژ فەیلەسۆفێن گریکی مە دەستپێکربوو هەتا سەردەمێ ئەڤرۆ، بۆ مە دیاربوو ئەم هەموو یێ ل ژێر چاڤدێریا مایجەرەکێ دیارکری دا دژین. نوکە ئەو وەك چاڤدێرەکێ دگەل نەتەوەیێن یەکگرتی ل لوبنانێ کار دکەت. وی پەرتووکەك دەربارەی مە نڤیسیە و پێشکێشی کچا خوە کریە. ناڤێ کچا وی هێلد میللەر کناگە. ئەو ژی وەکو سۆفیایێ، ئەڤرۆ جەژنا بوونا وێ یە. وێ ئەڤ پەرتووکا بەحسێ مە دکەت، ل سپێدەهیا ڕۆژا 15 خزیرانێ ل سەر مێزا ب ڕەخ تەختێ خوە یێ نڤستنێ ڤە دیت. ئەگەر کووتر بەحس بکەم، ئەو پەرتووك ژ فائیلەکا مەزن پێکدهێت و نوکە ئەو یا نێزیکی دوماهیێ بووی."

هەموو ئامادەبوویی ژبەر ڤان ئاخفتنێن وی حێبەتی و تۆڕە بوون، لێ ئەلبێرتۆ یێ بەردەوام بوو ل سەر ئاخفتنا خوە.

- "بۆ مە دیار دبیت کو هەبوونا مە هەموو وەکو دیاریەکێ یە هاتیە پێشکێشکرن بوو هێلد موللەر کناگێ نەك زێدەتر. ئەم هەموو وەکو چورچووڤەیا وێ وانەیا فەلسەفی نە ئەوا بۆ وێ کچێ هاتیە نڤیسین. بۆ نموونە، ئەو مارسێدسا سپی ئەوا ل بەر دەرگەهی ڕاوەستاندی چ هەبوونەك نینە ژ بلی وێ چەندێ کو د هزرا مایجەری دا هەی، د ڕاستی ئەو

مارسێدس فلسەکێ ژی نائینیت، مەرەما من ئەو مایجەرە یێ نوکە ل بن دار قەسپەکێ ل وەلاتێ لوبنانێ ڕوونشتی، ڕۆژێن لوبنانێ گەلەك د گەرمن هەڤالان."

شیرەتکاری دارای گوت: "ئەڤە چ سەرهاتی و ئاخفتنا بێزارکەرە."

- "هەر کەسەك یێ ئازادە بۆچوونا خوە دەڕببریت. د ڕاستی دا ئەڤ ئاهەنگە هەموو یا بێزارکەرە، ئەگەر تشتەکێ مفا تێدا هەبیت، ئەڤ گوتارا من یا فەلسەفی یە."

شیرەتکاری دارایی ڕابوو ژپێرڤە و گوت: "یا باش ئەوە ئەم پێکۆلێ بکەین ب یەك دەست دژی هەر مەترسیەکێ براوەستین. هەروەکو هوون دبینن، لێ کەسەکێ وەکو ڤی کو چ کار نینن و دڤێت ب ڤان ئاخفتنێن خوە یێن فەلسەفی هەموو کارێن مە تێکبدەت."

ئەلبێرتۆی ب بەلێ سەرێ خوە هەژاند و گوت: "چ تشت ل هەمبەری ڤێ شرۆڤەکرنا فەلسەفی ناهێنە سەلماندن، ژبەرکو ئەم یێ بەحسێ تشتەکێ گەلەك مەترسیدارتر ژ کارەساتێن سروشتی دکەین، بەڕێز شیرەتکار. هەروەکو تو دزانی ئەڤ کارەساتێن هۆسا چ جاران ناهێنە پاراستن."

- "ل ڤێرێ چ کارەساتێن سروشتی ناهێنە ئەنجامدان."

- "نەخێر، بەلکو کارەساتا هەبوونخوازیێ یە. ئەگەر تەماشەی لایێ دی یێ باخچەی ل پشت دارێن مژمژان بکەی دێ باش د مەرەما من گەهی. هەروەکو چەوا ئەم نەشێین ڕێکەکێ پەیدابکەین کو تیشکێن ڕۆژێ ب دوماهیك نەهێن، هۆسا ئەم نەشێن چ ڕێکا پەیدابکەین و چ پشتڕاستیان بدەینە دیارکرن کو هەبوونا مە خراب نەبیت."

- "ڤێجا ئەم د نەچارین ب ڤێ چەندێ ڕازی ببین؟

بابێ جوانایێ ئەڤ پرسیارە ژ هەڤژینا خوە کر. هەڤژینا وی و دایکا سۆفیایێ هەردووکان سەرێن خوە هەژاندن و چ بەرسڤ نەدان.

ئەو گەنجێن ئامادە بەردەوام چاڤێن وان ل سەر ئەلبێرتۆی بوون. گەلەك جاران هۆسا چێبوویە گەنج زیرەکتر بن بۆ داهێنانێن هزرێن نوو، کوڕەکی کو بەرچاڤك د بەر چاڤێن وی بوون و پرچا وی یا زەر و خەلەك بوو، گوت: "ئەم حەز دکەین تو زێدەتر بۆ مە ل سەر ڤی بابەتی بئاخڤی."

- "گەلەك سوپاس، لێ د ڕاستی دا چ تشت نەمایە ئەم بێژین. ئەگەر ئەم تێبگەهین کو ئەم هندەك کەسێن دناڤ خەیالا کەسەکێ دیتر دا، باشترە ئەم بێدەنگ بین. ئەز حەزدکەم ب شیرەتەکێ ئاخفتنا خوە ب دوماهی بینم، ئەز ب باشی دبینم گەنج کورسەکێ بچووك یێ فەلسەفێ بخوینن، ب ڤی ئاوایی دێ شێین بینینەکا ڕەخنەگرانە ل نك خوە پەیداکەین، سەبارەت وێ ژیانا کو ئەو تێدا دژین. ب تایبەتی ڕەخنێ ل وی تشتی بگرین یێن کو بەری مە دایکوباب و باپیرێن وان بهایەکێ مەزن ددایێ. ئەگەر من ڤیابیت ئەز تشتەکی فێری سۆفیایێ بکەم ئەو تشت ئەڤە بوویە، هیگل بۆ ڤێ چەندێ دبێژیت "هزرکرنا ئەرێنی"

ڕاوێژکارێ دارایی هێشتا ژ پێرڤە یێ ڕاوەستای بوو و تبلێن خوە ل مێزێ ددان و دەست ب ئاخفتنێ کر: "ئەم وەك دایکوباب پێکۆلا هندێ دکەین هەلویستێن باش یێن وەکو قوتابخانە و دێرێ د مەژیێ نەڤیێن خوە دا بچینین، لێ ئەڤ گێلەشوکە بەردەوام بەرامبەر کارێن مە دڕاوەستیت و پێکۆلا ژناڤبرنا وان دکەت. وەکو هوون دزانن نەڤیێن مە خوەدانێن پاشەڕۆژێ نە، ڕۆژەك دێ هێت هەموو ئەو کارێن مە دروستکرین ئەو دێ بنە خوەدانێن وان. ئەگەر نوکە هوون ڤی کەسی ل سەر ڤێ مێزەیێ نەبەن، ئەز دێ تێلەفۆنا پارێزەرێ خێزانا مە کەم و ئەو دێ زانیت چەوا سەرەدەریێ دگەل ڤان جۆرە مرۆڤان بکەت."

- "هەر تشتەکێ تو بکەی، نەشێت چ تشتان ژ ڤی بابەتی بگوهۆڕیت، چونکی تو وێنەیەکێ ئاشوپی نەك زێدەتر. هەر چەوا بیت ئەز و سۆفیا پشتی دەمەکێ کێم دێ هەوە بجه هێلین، ژ بلی کورسێن مە یێ تیوری بۆ فەلسەفێ مە هندەك پڕۆژەیێن کرداری ژێ هەنە، ئەز و سۆفیا دێ ب جۆرەکێ هونەری خوە بەرزەکەین، ب ڤی ڕەنگی دێ ژ مایجەری ژی ڕزگاربین."

دایکا سۆفیایێ دەستێ کچا خوە گرت.

- "سەرەڕای هەموو تشتان، تو من بجه ناهێلی، سۆفیا؟"

سۆفیایێ دەستێ خوە دانا سەر ملێ دایکا خوە و سەحکرە ئەلبێرتۆی و گوت: "ب دلێ دایکا من نینە."

- "نەخێر. ئاخفتنەکا کومێدی و بێ ڕامانە. دڤێت ئەو تشت ل بیرا تە بیت ئەوا تو فێربووی، تو دزانی دڤێت ئەم خوە ژ ڤان تشتێن بێ ڕامان ئازاد بکەین. دایکا تە ژنەکا جوان و شیرینە، هەروەکو ڤێ زەمبیلا سۆر ئەوا لەیلایێ ژ خوارنێ تژی کری و بۆ داپیرا خوە بری، لێ ژ ڕوودانا وێ فرۆکەیێ دلتەنگتر نینە ئەوا بەری دەمەکی ل هنداڤ سەرێ تە فری، بێگومان پانزین یا بۆ هاتیە مەزاختن و ب تنێ دا پیرۆزباهیا تە بکەت."

- "ئەز مەرەما تە تێگەهشتم. "

پاشی سۆفیایێ بەرێ خوە دا دایکا خوە و گوتێ: "ژبەر هندێ دڤێت ئەز گوهێ خوە بدەمە وی، هەرچەوا بیت ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان هەر دێ تە بجهـ هێلم. "

- "لێ تو دزانی ئەز دێ گەلەك بیریا تە کەم. باشە، ئەگەر ئەسمانەکێ دیتر ل سەر ڤی ئەسمانی دا هەبیت، بفرە. تە خەما جوڤیندایێ نەبیت، ئەز دێ چاڤێ خوە دەمە وێ، ئەرێ ئەو ڕۆژێ بەلگەکێ کەلەمیێ دخۆت یان دووان؟"

ئەلبێرتۆی دەستێ خوە دانا سەر ملێ دایکا سۆفیایێ و گوتێ: "نە تو و نە ژی چ کەسەکێ دیتر نەشێن مە ژبیر بکەن، چونکی کەس ژ هەوە هەبوونا خوە نینە، ژبەر هندێ هوون نەشێن مە ژبیر بکەن."

- ""ئەڤە نەخۆشترین تشتە من د ژیانا خوە دا گوهلێبووی."

خاتین ئینگەربریگستنێ ئەڤ ئاخفتنە گوت و هەڤژینێ وێ ژی سەرێ خوە هەژاند وەك ڕازیبوون ل سەر بۆچوونا وێ.

- "هەرچەوا بیت، ئەو دێ بهایێ ڤان سفکاتی پێکرنان دەت. لێ ئەز یێ پشتڕاستم کو ئەو کەسەکێ کۆمونیزمە، ژبەر هندێ وی دڤێت هەموو تشتێن ئەم حەز ژێ دکەین ژ مە بستینیت. ئەڤ زەلامە کەسەکێ پیچە و یێ نەفرەتکریە."

پشتی ڤێ چەندێ شیرەتکار و ئەلبێرتۆ ڕوونشتن، لێ دێمێ شیرەتکاری سۆر ببوو. پاشی جوانا و یورجن ژی هاتنە سەر مێزێ، جلکێن وان پیس ببوون، هەڕی و تۆز ل سەر پرچا جوانایێ بوو. ئەلبێرتۆی تەماشەی سۆفیایێ کر و گوتێ "نوکە دەم هات."

دایکا سۆفیایێ بەرێ خوە دا کچا خوە و گوتێ: "دێ شێی بەری بچی، بۆ مە قەهوەیەکێ ئامادە بکەی؟"

- "بەلێ بێگومان دێ شێم."

سۆفیایێ قوریکێ قەهوێ هەلگرت و بەرەڤ لێنانگەهێ ڤە چوو، قەهوە دانا سەر ئاگری و خوارن دا ماسی و چووچکان هەتا قەهوە ئامادەبووی، هەروەسا دەلیڤا وێ یەکێ ژی هەبوو بەلگەکێ کەلەمیێ بدەتە کیسەلەیێ خوە. وێ پشیکا خوە نەدیت، لێ سێنیکا وێ یا خوارنێ تژیکر و دانا سەر دەرەجکان، وێ ئەڤ کارە هەموو ب چاڤێن ڕۆندك ڤە کرن."

دەمێ ب قەهوە ڤە ڤەگەڕیایە ناڤ باخچەی، ئەو ئاهەنگ وەکو ئاهەنگەکا زارۆکان دهاتە پێشچاڤێن وێ، ڕەنگێ ئاهەنگێن فەلسەفی ل سەر دیار نەبوو. ل وی دەمێ سۆفیا گەهشتیە سەر مێزێ، یەك ژ وان کوڕێن گەنج ئەوێن ئامادە یاریەکا ئاگری کرە دناڤ کێکێ دا و پشتی دەمەکێ کێم پەقی و کێك پارچە پارچە بوو و ب سەر مێزێ دا بەربەلاڤبوو. پارچەیا ژ هەمووان مەزنتر ب سەر کراسێ سۆر یێ خاتین ئینگەربریگستنێ دا ڕژیا. یا ژ هەموویێ سەیرتر ئەو بوو هەموو ئامادەبوویان ئەڤ بوویەرە گەلەك سادە وەرگرت. جوانایێ پارچەیەکا کێکێ هاڤێتە سەر دێمێ یورجنی و یەکسەر پشتێ وێ چەندێ ب زمانێ خوە ئەو کێکا ل سەر دێمێ وی هەموو ئالیست.

دایکا سۆفیایێ و ئەلبێرتۆ ل دووری وێ مێزێ ڕوونشتبوون، دەستێ خوە بۆ سۆفیایێ بلند کر و گازیکرە نك خوە، پاشی سۆفیایێ گوت: "هەرچەوا بیت هوون شیان بکەڤنە هەمبەری هەڤدوو و هەڤنیاسینێ بکەن."

دایکا سۆفیایێ ب دلخوشی بەرسڤا وێ دا و گوت: "تە ڕاست گوت، ئەلبێرتۆ مرۆڤەکێ زانایە، ئەز ب پشتڕاستی ڤە دێ تە ڕادەستی وی کەم."

سۆفیا دناڤبەرا هەردووکان دا ڕوونشت.

دوو کوڕ چوونە سەربانێ مالا وان، کچەك ژی دناڤ باخچەی دا دهات و دچوو و پوفدانك دپەقاندن. پشتی دەمەکی کەسەکێ نەنیاس ب ماتۆرسکلی هاتە دناڤ باخچەی دا و تژی شووشەیێن بیرێ و مەیێ دگەل بوون، هندەك ژ وان گەنجێن ئامادە ب دلخوشی بەرەڤ

وی ڤه چوون. شیرەتکارێ دارایی دیسان ڕابوو ژ پێرڤه و گوت: "کوڕ و کچێن گەنج هەوە دڤێت ئەم یاریان بکەین؟"

پاشی وی بتلەکێ بیرێ هەلگرت و بلەز هەموو ڤەخوار، وی ئەو بتلێ بیرێ ب ڕەخ گولێن باخچەی ڤە دانا و بەرەڤ مێزێ ڤە چوو و ئەو پێنج پارچەیێن کێکێ یێن دوماهیێ هەلگرتن، دگوتە ئامادەبووان دێ چەوا ڤان پارچە کێکان هاڤێنە وی بتلێ بیرێ ئەوێ دانایە بەر ڕەخێ باخچەی."

ئەلبێرتۆی گوت: "ئەڤە دوماهیك هەناسەیە. بەری کو مایجەر خالۆ دوماهیێ بدانیت و هێلد ژی پەڕتووکا خوە بگریت، باشترە ئەم ژ ڤێرێ دەرکەڤین."

- "دادێ دڤێت تو ب تنێ ڤێرێ پاقژ بکەی."

- "چنینە کچا من. هەرچەوا بیت ئەڤ ژیانا تو تێدا دژی نە یا ژ هەژی تە یە، ئەگەر ئەلبێرتۆ بشێت ژیانەکا باشتر بۆ تە دابین بکەت، ئەز دێ گەلەك دلخوش بم. تە گوت وی هەسپەکێ سپی هەیە؟"

سۆفیایێ تەماشەی باخچەی کر نەدنیاسی، چونکی بتل و هەستیکێن مریشکێ و سەمۆنە و پڤدانك هەموو ب سەر باخچەی دا بەلاڤ ببوون.

پشتی دەمەکێ گوت: "ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان ڤێرێ بەهەشتا من یا بچووك بوو."

ئەلبێرتۆی بەرسڤا وێ دا: "نوکە ژی دێ ل ڤێ بەهەشتێ هێیە دەرێخستن."

یەك ژ وان گەنجان چوو دناڤ وێ مارسێدسا سپی ئەوا ل بەر دەرگەهی و سلفەك لێدا و بەرەڤ باخچەی ڤە هات. سۆفیایێ هەستپێکر کەسەکی ملێن وێ ب توندی یێن گرتین.. پاشی ئاگەهـ ژ دەنگێ ئەلبێرتۆی بوو گوتێ: "نوکە!.."

د وی دەمی دا مارسدسێ خوە ل دارەکا سێڤێ دا ئەو سێڤ هەموو ب سەر دا هاتنە خوارێ. شیرەتکاری دارایی گرە هەوار: " ئەڤە زێدەگاڤیەکا مەزنە. دڤێت هەموو وان زیانێن گەهشتینە من بۆ من بڤەگەڕینین."

هەڤژینا وی ژی پشتا وی گرت: "هەموو ژ ئەگەرێ ڤی کەسێ پووچە. ئەرێ ئەو کیڤە چوو؟"

دایکا سۆفیایێ هۆسا بەرسڤا وێ دا" دێ بێژی ئەردی ئەو داعیرا."

پاشی ڕابوو و بەرەڤ مێزێ ڤە چوو، دەست ب پاقژکرنا بەرماییکێن ئاهەنگا فەلسەفی کر و گوت: "کی قەهوەیەکا دی دڤێت؟"

# تێکەلکرنا ئاوازان

...دوو ئاواز یان زێدەتر د یەك دەم دا دهێنە ژەنین..

**هێلد ل سەر جهێن خوە ڕوونشتبوو، ل ڤێرە چیرۆکا سۆفیایێ و ئەلبێرتۆی ب دوماهی هات. لێ پشتی هینگێ چ چێبوو؟**

**بۆچی بابێ وێ ئەڤ بەشێ دوماهیێ نڤیسیبوو؟ ئەرێ مەرەما وی ئەو بوو دەستهەلاتداریا خوە ل سەر جیهانا سۆفیایێ دا دیار بکەت؟**

**پشتی گەرماڤەکا خوش وەرگرتی و جلکێن خوە ژی کرینە بەر خوە، هێشتا ئەڤ هزرە د سەرێ وێ دا دزڤڕین. پاشی بلەز تێشت خوار و بەرەڤ باخچەی ڤە چوو و ل سەر جۆلانکێ ڕوونشت.**

**ئەو یا هەڤڕا بوو دگەل ئەلبێرتۆی کو دناڤ وێ ئاهەنگێ هەموویێ دا ب تنێ گوتارا وی یا ب مفا بوو. ئەرێ تو بێژی بابێ وێ ڤیابیت ب ڤێ ڕێکێ بێژیت جیهانا هێلدێ وەکو ئاهەنگا سۆفیایێ یا گێلەشوك بیت؟ یان ژی جیهانا وێ ژی ب فڕینێ دێ ب دوماهی هێت؟**

**باشە، پا ئەو هەردوو چ لێهاتن، ئەرێ سۆفیا و ئەلبێرتۆ. پلانا وان یا نهێنی چ لێ هات؟ ئەرێ دێ هێلد وێ نڤیسینێ تمام کەت؟ یان ژی ئەو شیان دناڤ ڕۆمانێ دا بیننە دەرێ و برەڤن؟**

**باشە، نوکە ئەو ل کیڤەنە؟ ژ نیشکەکێ ڤە هزرا وێ چوو سەر تشتەکی: ئەگەر ئەلبێرتۆ و سۆفیا شیابن د وێ چیرۆکێ دا برەڤن، چێنابیت چ تشتێ دی دەربارەی وان د ناڤ وێ بالۆلکا کاغەزان دا هاتبیتە نڤیسین، ژ بەر هندێ بابێ وێ گەلەك ب باشی ئاگەهـ ژ وێ نڤیسینێ هەبوو ئەوا دناڤ وێ فائیلێ دا هەی.**

**ئەرێ چێدبیت تشتەك دناڤ وان ڕێزکان دا نڤیسیبیت؟ بۆ وێ دیاربوو کو بەری نوکە ژی ئەڤ دێرە ل جهەکێ دی یێ ڕۆمانێ کەفتیە بەر چاڤێن وێ، ژبەر هندێ تێگەهشت کو دڤێت وێ چیرۆکێ چەندین جارێن دی بخوینیتە ڤە.**

ل وی دەمێ مارسێدس هاتیە دناڤ باخچەی دا، ئەلبێرتۆی سۆفیا دگەل خوە ڕەڤاند و بەرەڤ کۆلکێ وێ ڤە چوون، پاشی دناڤ دارستانێ ڕا بورین هەتا گەهشتینە نێزیکی کۆلکێ مایجەری.

- "بلەز وەرە! بەری ئەو ل مە بگەڕن دڤێت ئەم کارێ خوە ئەنجام بدەین."
- "ئەرێ ئەم ژ بازنەیا ئاگەهیا مایجەری قورتال بووین؟"
- "ئەم هێشتا یێ ل سەر سنووری."

پاشی ب بەلەما بچووك بەرەڤ لایێ دی یێ دەریاچێ چوون و خوە هاڤێتن دناڤ کۆلکێ مایجەری دا. ئەلبێرتۆی دەرگەهێ سەرداڤێ ڤەکر و سۆفیا پالدا د ژوور ڤە، ل دووڤ دا هەموو تشت ڕەش بوون.

**ل ڕۆژێن دووڤ دا هێلدێ کار ل سەر پیلانا خوە دکر. هندەك نامە بۆ ئان کڤامسدالێ ل کوپنهاگنێ فرێکرن، دوو سێ جاران ژی تێلەفۆن بۆ کربوو. ل لیلساندێ ژی داخوازێ ژ ناسیار و برادەرێن خوە کربوو هاریکاریا وێ بکەن. پتریا هەڤالێن پۆلا خوە ژی پشکداری پلانا خوە کربوون.**

**جار جار ژی بەرەڤ ڕۆمانا "جیهانا سۆفیایێ" ڤە دچوو و دخواند، ژبەرکو ئەو چیرۆك نە ژ وی جۆرێ ڕۆمانایە یێ مرۆڤ جارەکێ ب تنێ بخوینیت و تێبگەهیت. هێلدێ بەردەوام هزرێن خوە دکرن کا چ ل چارەنڤیسێ ئەلبێرتۆی و سۆفیایێ هات.**

**ڕۆژا شەمبی ڕێکەفتی 23ێ خزیرانێ، هێلد نێزیکی دەمژمێر نەهـ ژ خەو هشیاربوو، وێ دزانی بابێ وێ ژ لوبنانێ بەرەڤ مال یێ ب ڕێکەفتی. نوکە دڤێت ب تنێ ئەو یا چاڤەڕێ بیت، وی گەلەك ب هشیاری نەخشەیێ دوماهی ڕۆژا بابێ خوە کێشابوو.**

**هەر ل وێ سپێدەیێ، دا ل گەل دایکا خوە کاروبارێ جەژنا ڤەشە یوحەنای بۆ ئێڤاری دکر. هێلدێ هزرێن سۆفیایێ دکرن کا چەوا ل ئاهەنگا جەژنا بوونا خوە هاریکاریا دایکا خوە دکر.**

**لێ ئەڤە هەموو بوو تشتەك ژ ڕابردووی! ئەرێ کی نابێژیت هەتا نوکە ژی ئەو هەر د بەردەوام بن ل سەر خەملاندنا مێزا خوارنێ؟**

ئەلبێرتۆ و سۆفیا دناڤ باخچەی دا و بەرامبەر دوو ئاڤاهیێن مەزن ڕوونشت، ل سەر دیوارێن دەرڤە یێن وان ئاڤاهیان دوو پانکێن مەزن و هندەك کونێن باگوهۆڕینێ هەبوون. ژنەك و زەلامەکێ گەنج ژ ئاڤاهیەکی ژ وان دەرکەفتن و زەڕفەکێ قەهوایی د دەستێن زەلامی دا بوو و ژنێ ژی چانتەیەکا سۆر ل ملێ وێ بوو. و ل پشت وان ژی ترۆمبێلەك دەرباز بوو. سۆفیایێ پرسیار کر: "ئەڤە چیە چێدبیت؟"

- "ئەم ڕزگار بووین!"
- "لێ نوکە ئەم ل کیڤەینە؟"
- "دبێژنە ڤی جهی مایجەر ستوجا."
- "لێ مایجەر ستوجا هەر کۆلکێ مایجەری یە؟"
- "ئەڤە یا ل ئۆسلو."
- "تو یێ پشتڕاستی؟"

- "بەلێ یێ پشتڕاستم. یەك ژ وان ئاڤاهیان ناڤێ وی "كوچكا نوو"یە و د وی ئاڤاهی دا قوتابی موزیكێ دخوینن. ئاڤاهیێ دیتر ژی "كولیژا ئایینی"یە و لاهوتی تێڤە دخوینن، د سەر وان ژی دا كولیژا زانستێن سروشتی و یا سەرداتر ژی كولیژا ئاداب و فەلسەفێ یە."

- "ئەرێ ئەم ب تەمامی د پەڕتووكا هێلدێ و دەستهەلاتا مایجەری دا ڕزگار بووین؟"

- "بەلێ، ئێدی چ جاران ئەو نەشێن مە ل ڤێرێ ببینن."

- "ئەو دەمێ ئەم د ناڤ دارستانێ دا دڕەڤین. وی دەمی ئەم ل كیڤە بووین؟"

- "ل دەمێ مایجەر مژوولی پێكدادانا مارسێدسێ و دارا سێڤێ بوو، مە ئەو وەخت ب دەرفەت دیت و مە خوە د كۆلكێ تەڤە ڤەشارت، ل وی دەمی ئەم د قۆناغا دەستپێكێ دا بووین، سۆفیا. ئەم یێ ب سەر دوو جیهانان ڤە، جیهانا كەڤن و یا نوو. ئەز باوەرناكەم مایجەری هزرا وی جهی كربیت یێ مە خوە تێدا ڤەشارتی."

- "بۆچی نە؟"

- "چونكی وی هند ب ساناهی دەست ژ مە بەرنەددا. تو دزانی هەموو تشت وەكو خەونەكێ دەربازبوون. دبیت كو وی ژی بەشداری د وێ یارییێ دا كربیت."

- "مەرەما تە چیە؟"

- "دبیت وی ترۆمبێل لڤاند بیت. دبیت وی خوە گەلەك وەستاند بیت ژی هەتا ئەم بشێین ل بەر چاڤان بەرزە ببین، ئەز بێژم پشتی ڤان ڕوودانان هەمووان ئەو ب خوە ژی یێ واستیایی."

ئەو ژن و زەلامێن گەنج ب تنێ چەند گاڤەك مابوون بگەهنە نك وان، سۆفیایێ هەست ب شەرمێ كر كو یا دناڤ باخچەی دا و دگەل زەلامەكێ ژ خوە مەزنتر ڕوونشتیە، هەر هۆسا دڤیا ژی كەسەكێ دیتر ئاخفتنێن ئەلبێرتۆی بۆ وێ پشتڕاست بكەت، ژبەر هندێ بەرەڤ وان ڤە چوو و پرسیار ژ وان كر:

- "ببورن.. ناڤێ ڤی جهی چیە؟"

لێ نەك وان ب تنێ بەرسڤ نەدا، دبیت هەر نەدیت بیت ژی. سۆفیایێ هەست ب شەرمێ كر. لێ دووبارە پرسیار ژێ كرەڤە.

- "دڤێت ئەز بزانم. ب هزرا من تشتەکێ ب ساناهییە ئەگەر هوون بەرسڤا پرسیارەکێ بدەن؟"

هۆسا دیار بوو ئەو زەلامێ گەنج یێ مژوولی ئاخفتنێ بوو دگەل وێ ژنێ.

- شێوازێ تێکەلکرنا دوو ئاوازان، ل سەر دوو تەوەران کار دکەن، ئاسۆیی کو دبیتە میلودی، ستوونی ژی دبیتە هارمۆنی، مەرەم ژێ ژەنینا دوو ئاوازان یان زێدەتر د ل سەر یەك میلودی.

- "ببورن دێ ئاخفتنا وە برم، لێ ...."

- "میلودی ب جۆرەکێ تێکەل دبن کو هەتا تو بشێن ب ئازادانەتر و ل ژێر کێمترین کاریگەریا کومەلێ دا دەربکەڤن، دگەل بەرچاڤ وەرگرتنا یاسایێن هارمۆنی. دبێژنە ڤێ چەندێ "تێکەلکرنا ئاوازان" د ڕاستی ژی دا ڕامانا وێ ئەوە کو "نۆتەك دژی نۆتا دی یە."

- "ئەڤە چ تەمسارینە، نێ نە هوون د کەڕن و نە ژی د کورەنە..."

سۆفیایێ جارەکا دی پێکۆل کر، ڤێ جارێ ژی ڕێکا وان برِی، لێ وان ب ئارامی پاڵەك لێدا و د ڕێکا خوە دا ڕاکر.

ئەو کچا گەنج گوت: "هۆسا دیارە دێ باهۆزەکا ب هێز ڕابیت."

سۆفیا بلەز بەرەڤ ئەلبێرتۆی ڤە چوو.

- وان گوهـ ل دەنگێ من نینە.

ل وی دەمی بیرا وێ ل وێ خەونا ب هێلدێ و خاچا زێڕی ڤە دیتی هات.

- "بەلێ. ئەڤە ئەو بهایە یێ دڤێت ئەم بدەین، ڕاستە ئەم د وێ پەرتووکێ دا دەربازبووین، لێ دگەل هندێ ژی نابیت ئەم چاڤەرێی وێ یەکێ بکەین کو ئەم بگەهینە وێ پلەیا نقیسەری هەی. وەکو تو دزانی نوکە ئەم یێ ل ڤێرە. ژ نوکە وێڤە د ڤی ژیێ ئەم تێدا دەرباز نابین، هەروەکو وی دەمی یێ مە ئاهەنگا فەلسەفی ب جهـ هێلای."

- "باشە لێ ئەم چ جاران نەشێین پەیوەندییێ دگەل کەسێن دی دا گرێدەین؟"

- "فەیلەسۆڤ ڕاستەڤینە پەیڤا "چ جاران" بکارنائینیت. نوکە دەمژمێر چەندە؟"

- "هەشتە."

- "هەر ئەو دەمە يێ ئەم ژ ئاهەنگێ ڕەڤين."
- "ئەڤرۆ بابێ هێلدێ دێ ژ لوبنانێ ڤەگەڕيت."
- "باشە، ژبەر هندێ دڤێت ئەم لەزێ بكەين و وەختێ خوە بەرزە نەكەين."
- "تە دڤێت چ بێژی؟"
- "ما تە نەڤێت بزانی دێ چ ڕويدەت دەمێ مايجەر دزڤڕيتە مالا خوە ل بجێركلی؟"
- "بەلێ، بێگومان."
- "باشە پا دا بلەز بچين!"

ئەو هەردوو بەرەڤ ناڤەندا باژێری بڕێكەفتن، د ڕێكێ دا گەلەك كەس دهاتنە سەر ڕێكا وان لێ هۆسا دياربوو هەروەكو يێ دناڤ بای دا دچن.

ترۆمبێل ب درێژاهيا ڕێكێ يەك ل دووڤ يەكێ د ڕاوەستيايی بوون، ژ نيشكەكێ ڤە ئەلبێرتۆ بەرامبەر ترۆمبێلەكا سۆر يا وەرزشی و بێ بن ڕاوەستيا و گوت: "ئەز دبێژم يەك ژ ڤان ترۆمبێلان دێ ب كێر مە هێت، لێ دڤێت دەستپێكێ پشتڕاست بين ئەو ژی يا مەيە."

- "ئێدێ ئەز د چ تشتان ناگەهەم؟"

- "نوكە باشترە ئەز بۆ تە ڕۆهن بكەم، ئەم نەشێين ترۆمبێلا كەسەكێ دی بكاربينين، ب بۆچوونا تە دێ كارڤەدانا خەلكی چ بيت دەمێ دبينن ترۆمبێلەكا بێ شوفێر يا بڕێڤە دچيت؟ ژ بلی وێ چەندێ ژی ئەم نەشێين وێ بدەينە شولی."

- "پا ئەڤ ترۆمبێلا وەرزشی يا تو دبێژی؟"
- "ئەز بێژم من د فلمەكێ كەڤن دا يا ديتی."

- "ل من ببورە، لێ ڤان هێماييێن تە يێن نهێنی ئەز يا بێزار كريم كو هەر يەك ژ يا دی ئالۆزترە."

- "ئەڤە ژی وەكو مە ترۆمبێلەكا ئاشوپی يە. ئەو خەلكێ ل دەردورێن مە دەمێ د ڤی جهی دا دەرباز دبن ب تنێ دێ جهەكێ ڤالاّ بينن، ئەم ژی بەری دەرباز ببين، دڤێت ژ ڤێ خالێ پشتڕاست ببين. پشتی دەمەكێ كێم، وان گەنجەك ديت يێ پايسكلەكێ دهاژووت، پاشی دناڤ جهێ ترۆمبێلا سۆر ڕا دەربازبوو و چوو جاددەيێ.

- "تە ديت، ئەڤە ترۆمبێلا مە يە!"

ئەلبێرتۆ دەرگەهێ ڕاستێ ڤەکر و گوت: "فەرمووو، نوکە تو مێهڤانا منی."

سۆفیا ل جهێ خوە ڕوونشت. ئەلبێرتۆ ژی ل پشت سکانی ڕوونشت و سویچێن ترۆمبێلێ ژی ل جهێ خوە بوون. هەر یەکسەر ئەلبێرتۆی ترۆمبێل دا شولی.

پاشی بەرەڤ کولانا دێرێ ڤە چوون هەتا گەهشتینە ڕێکە درامینا بەرفرەهـ و ژ لیساکر و ساندفیکایێ ژی بورین. هێدی هێدی ڕۆناهیێن جەژنا قەشە یوحەنای پتر گەش دبوون ب تایبەت پشتی ژ درامینێ بورین.

- "ئەڤ شەڤە، ناڤەڕاستا هاڤینێ یە سۆفیا. مانە یا جوانە؟"
- "خوشە ئەم یێ دناڤ ترۆمبێلەکا بێ بان دا و بایەکێ خوش ژی یێ ب دێمێ مە دکەڤیت، ئەرێ ژ ڕاستا کەس نەشێت مە ببینیت؟"
- "ب تنێ ئەو دشێن مە ببینن یێن ژ تۆخمێ مەبن، نوکە دەمژمێر بۆ چەند؟"
- "هەشت و نیڤ."
- "دڤێت ئەز ڕێکەکا کورتر ببینم، ئەم نەشێین هێدی ل پشت ڤێ ترێلێ بچین."

پشتی ڤێ گوتنێ، ئەلبێرتۆ دا دناڤ زەڤیەکا گەنمی دا، چاڤێ سۆفیایێ ب گولێن گەنمی کەفت ئەوێن ماینە ب ئەردی ڤە.

ئەلبێرتۆی گوت: "سپێدێ خوەدانێن وی دێ بێژن باهۆزێ ئەو یێن شکاندین."

**دەمژمێر چوار و نیڤێ ئێڤاری ل 23ێ خزیرانێ، مایجەر ئەلبێرت کناگ ل فرۆکەخانەیا کوپنهاگن هاتە خوارێ، ڕۆژەکا دوور و درێژ بوراندبوو، باژێرێ ڕۆما دوماهی قۆناغ گەشتا وی بوو بەری کو بگەهیتە کوپنهاگن.**

**ب ڤاتا خوە یا سەربازێ کو یا تایبەت بوو ب نەتەوەیێن یەکگرتی ڤە، ب شانازی ڤە ل بەرامبەر ل جهێ پشکنینا پاسپۆڕتان ڕاوەستیا، وی نەک تنێ نوێنەراتیا خوە یان وەلاتێ خوە دکر بەلکو نوێنەراتیا سەد سالێن کەلتورێ داپەڕوەریا نیڤدەولەتی دکر کو گەلەک نەمایە دێ ل هەموو جیهانێ بەلاڤ بیت.**

چانتەیەکا ملی یا بچووك هەلگرتبوو. تشتێن خوە یێن دی هەموو ب رێکا فرۆکخانەیا رۆما فرێکربوونە مال. دەمێ گەهشتیە جهێ پشکنینا پاسپۆرتان، ب تنێ پاسپۆرتا خوە یا سۆر نیشا وان دا.

- "چ تشتێ دی دگەل من نینە نیشا هەوە بدەم."

پێدڤی بوو مایجەر سێ دەمژمێران ل فرۆکەخانەیا کوپنهاگن بمینیت هەتا فرۆکەیا وی بەرەڤ لیلساندێ ب رێدکەڤیت و دفریت، ژبەر هندێ وی ب دەرفەت دیت هندەك دیاریا د وی دەمێ مایی بۆ خێزانا خوە بکریت. بەری دوو حەفتیان وی مەزنترین دیاری پێشکێشی کچا خوە هێلدێ کربوو کو ماریتایا هەڤژینا وی ئەو دیاری دانابوو سەر مێزا ب رەخ جهێ وێ یێ نڤستنێ ڤە داکو دەمێ سپێدێ ل رۆژا جەژنا بوونا خوە ئەو ژ خەو رادبیت یەکسەر ببینیت.

ئەلبێرتی هندەك رۆژنامێن نەرویجی کریبوون. د بارەکێ ڤە روونشت و داخوازا کوپەکێ قەهوێ کر. بەری ئەلبێرت رۆژنامێ بخوینیت دەنگەکێ بلند هات و گازیکر.

"پەیامەکا تایبەت بۆ مایجەر ئەلبێرت کناگی. داخوازێ ژێ دکەین پەیوەندییێ ب نڤیسینگەها س.ا.س بکەت."

چ چێبوویە؟ خوەهەکا تەزی هەموو لەشێ وی گرت. نەکو داخوازێ ژێ بکەن ڤەگەریتەڤە لوبنان؟ یان تشتەك ل مالا وی رووداپە؟ بلەز خوە گەهاندە بەر دەرگەهێ نڤیسینگەهێ.

- "ئەز ئەلبێرت کناگم."
- "باشە. فەرمووو نامەیەکا بلەز یا بۆ تە هاتی."

یەکسەر ئەو نامە ڤەکر دناڤ دا نامەیەکا بچووکتر هەبوو، ل سەر زەرفێ وێ نڤیسیبوو: بۆ دەستێ مایجەر ئەلبێرت کناگی، ب رێکا نڤیسنگەها پێشوازیێ س.ا.س یا فرۆکخانەیا کاستروب کوپنهاگن.

دلی وی بلەز خوە ڤوتا دەمێ ئەو نامەیا بچووك ڤەکری و دەست ب خواندنا وێ کری.

*بابێ من یێ خۆشتڤی:*

*هیڤیا ڤەگەڕیانەکا بەختەوەر بۆ تە دخوازم. ب ڕاستی کەیفخوشیەکا مەزنە دەمێ جارەکا دی تە ل مال دبینم نەخاسم پشتی ڤێ گەشتا درێژ ل لوبنانێ. تو دزانی من نەشیا خوە بگرم هەتا تو بگەهیە مال، ئەز نەچار بووم ب ڕێکا بلندگویێ تە ئاگەهداربکەم، ب ڤی شێوەیی کارێ من ب ساناهیتر بوو.*

*تێبینی: ب لێبورین ڤە شیرەتکارێ دارایی ئەنجبریجستن داخوازا ڤەرەبوویا زیانێن ترۆمبێلا خوە یا مارسێدس دکەت ئەوا بەرزەبووی.*

*تێبینیەکا گرنگ: دەمێ تو ڤەدگەڕێیە مال ئەز دێ دناڤ باخچەی دابم، دبیت ئەز بترسم، لێ ڕەنگە بەری تو بگەهیە مال هندەك دەنگوباسان ل دور من گوهلێببی.*

*تێبینیەکا دی یا گرنگ: ژ نیشکەکێ ڤە، ئەز هەست ب ترسێ دکەم دەمێ بۆ ماوەیەکێ درێژ ب تنێ دناڤ باخچەی دا بمینم. چونکی دبیت مرۆڤ ل جهێن هۆسا ب ساناهی دناڤ ئەردی دا بەرزەببیت.*

*دگەل ڕێزێن کچاتە هێلدێ*

*ئەوا پێشوازیەکا ژ هەژی بۆ هاتنا تە یا ئامادەکری*

مایجەر کناگ نەشیا گرنژینا سەر لێڤێن خوە بڤەشێریت، لێ وی نەڤێت کەس ب ڤی ڕەنگی یاریان دگەل بکەت. وی هەموو دەمان حەز دکر دەستهەلاتەکا ڕەها ل سەر ژیانا خوە یا تایبەت هەبیت، لێ ژ نیشکەکێ ڤە ڤێ کچا شەیتان ئەوا ل لیلسەند ڕوونشتی هەموو لڤینا فرۆکەخانەیا کوپنهاگن تێکبر! لێ وێ چەوا شیا ڤێ چەندێ بکەت؟

وی نامە کرە د بەریکا خوە دا ، چوو دناڤ فرۆشگەهەکا خوارنێن دانیمارکی کو ل سەر دەرگەهێ وێ یێ شووشەی نامەیەکا بچووك پێڤە بوو و ب دەستخەتەکێ ڕەش و مەزن ل سەر نڤیسی بوو "مایجەر ئەلبێرت کناگ". وی ئەو نامە ژی ژێڤەکر و خواند.

نامەیەکا تایبەت بۆ مایجەر ئەلبێرت کناگی، ب رێکا فرۆشگەها دانیمارکی ل فرۆکخانەیا کاستروب. کوپنهاگن.

*بابێ من یێ خۆشتڤی*
*من دڤێت تو دوو یان سێ کیلوییێن باسترما دانیمارکی بۆ مە بکری. بێگومان دایکا من حەز ژ باسترمەیا کۆنیاک دکەت.*
*تێبینی: کاڤیارا لیمفجۆرد ژی یا خراب نینە هەکە تو بکری.*
*دگەل سلاڤێن هێلدێ*

ئەلبێرتی تەماشەی دەوروبەرێن خوە کر، تو دبێژی ئەو هاتبیتە ڤێرێ؟ ئەرێ تو بێژی دایکا وێ دەستووری دابیتێ هاتبیتە ڤێرێ داکو بابێ خوە ببینیت؟ ئەڤە دەستخەتێ هێلدێ یە..

ڤی چاڤدێرێ نەتەوەییێن یەکگرتی هەستپێکر ڤێ جارێ کەسەک یێ چاڤدێریا وی دکەت، دیارە کەسەک یێ ژ دوورڤە چاڤدێریا وی دکەت، وی خوە وەکو بووکەکا دناڤ دەستان دا ددیت.

ئەو چوو ناڤ فرۆشگەهێ و دوو کیلوییێن باسترمەیا دانیمارکی و باسترمەیەکا ب کونیاک و سێ کوپێن کاڤیاری کرین. پاشی بۆ دەمەکی دناڤ وێ فرۆشگەهێ دا گەڕیا و دڤیا دیاریەکا بچووک بۆ کچا خوە هێلدێ بکڕیت.. نزا دێ ئامیرەکێ چاپکرنێ یێ باشبیت، یان ژی رادیویەکا بچووک ئەگەر بچیتە گەشتەکێ ژی دگەل خوە ببەت؟ ل دوماهیێ بڕیار دا رادیویەکا بچووک بۆ بکڕیت.

دەمێ دناڤ فرۆشگەهێ دا چوویە بەشێ ئەلیکترونی، دیسان نامەیاکا دی یا هەلاویستی دیت. دناڤ وێ نامەیێ دا هۆسا نڤیسیبوو:

*بابێ من یێ خۆشتڤی*

*سلاڤێن سۆفیایێ بۆ تە هەنە، هەروەسا سوپاسیا تە ژی دکەت ژ بۆ وی ئامیرێ ڕادیویێ یێ تە ل جەژنا بوونا وێ بۆ کریە دیاری. لێ د ڕاستی دا ئەز ژی وەکو سۆفیایێ حەز ژ دیاریێن بێ بها دکەم.*

*تیبینی: نزانم تە سەرەدانا بازاڕێن خوارن ڤەخوارن گیانی و جگارەیێن ل بازاڕێ ئازاد کریە. دێ هندەك ڕێنماییێن دی ل وێرێ بینی.*

*تێبینیەکا دی: ب هەلکەفتا جەژنا بوونا خوە، پارەیەکێ باش وەك دیاری بۆ من هات، ئەز د شێیم ب **350** کرۆنان بۆ کڕینا ڕادیو و تێلەڤزیۆنەکا بچووك بمەزێخم.*

*هێلد*

*ئەوا هەر نوکە من ئامادەکاریێن باش کرین*

*و زەلاتا کو تو حەز ژێ دکەی ئامادەکری*

تێلەڤزیونەکا بچووك ب **985** کرۆنان بوو، لێ بەرامبەر ڕەوشا دارایی یا مایجەری گەلەك یا ئەرزان بوو، مایجەری هەستپێدکر ب تەمامی یێ کەتیە د بن کۆنترولا هێلدا ڤێلباز، ژ جهەکی دبەتە جهەکێ دی. ئەرێ هێلد ل وێرێ یە یان نە؟ بۆ هەر جهەکێ چووبایە تەماشەی دەوروبەرێن خوە دکر، وی هەستپێدکر د هەمان دەم دا ئەو وەکو بووکەکا شووشەی و وەکو سیخۆرەکی یێ لێ هاتی. ئازادیا وی ب خورتی یا ژ وی هاتیە ستاندن.

ل سەر وی یا پێدڤی بوو بەرەڤ بازاڕێ ئازاد یێ فرۆکخانەیێ بچیت. د ڕێکێ دا نامەیەکا دی ب ناڤێ وی هاتبوو دانان، دیارە هەموو فرۆکخانە وەکو یاریەکا کۆمپیوتەرێ یە، ئەو ژی وەکو ماوسێ کۆپیوتەرێ یێ لێ هاتی.

ل سەر وێ نامێ نڤیسی بوو:

بۆ مایجەر ئەلبێرت کناگی، ب ڕێکا بازاڕێ لێبوری ژ باجێ.

*بابێ من یێ خۆشتڤی*

*ئەو تشتێ د ڤی بازاڕی دا من دڤێت، ب تنێ پاکیتەکا بەنیشتی و هندەک شیریناهیێن ئەنتۆن بێرگینە، بلا ل بیرا تە بیت، ئەڤ جۆرە شیریناهیە ل نەرویج گەلەک دگرانن. ئەگەر ژ بیرا من نەچووبیت، دایکا من حەز ژ کامپاریی دکەت.*

*تیبینی: د ڕێکا هاتنا خوە دا یێ هشیار بە، ئەز پشتڕاستم تە نەڤێت چ پەیام ژ دەستێن تە بچن.*

*سلاڤێن هێلدێ*

*ئەوا فێری گەلەک تشتان بووی*

ئەلبێرتی هەناسەیەک کوور هەلکێشا و چوو دناڤ بازاڕی دا و ئەو داخوازی ژی کرین، ب چانتەیەکا ملی ڤە و سێ کیسێن مەزن د دەستی دا بەرەڤ دەرگەهێ ژمارە **28** بڕێکەت، ل وێرێ دڤیابا چاڤەڕێی ڕابوونا فڕۆکەێ بیت، ئەگەر پەیامەکا دیتر مابیت ژی بلا ل جهێ خوە بیت.

لێ نامەیەکا دی ل سەر ستوونەکا دیواری یا هەلاویستی بوو، .

بۆ مایجەر ئەلبێرت کناگی، ب ڕێکا دەرگەهێ ژمارە **28** یێ فڕۆکەخانەیا کاستروب. کوپنهاگن.

دەستخەت یێ هێلدێ بوو، لێ یێ پشتڕاست نەبوو کو ئەو ژمارە ب دەستخەتێ هێلدێ بیت، وی نە دشیا ب ساناهی نڤیسین و ژمارەیان ژ یەک جودا بکەت. ئەو نامە ژی ڤەکر لێ ب تنێ دێڕەک ل سەر هاتبوو نڤیسین.

"نوکە هەموو تشت ب دوماهی هاتن."

ئەلبێرت ل سەر کورسیەکێ ڕوونشت، ئەو تشتێن کڕین دانانە سەر چوکێن خوە. ئەو مایجەرێ دفن بلند نوکە وەکو زارۆکەکێ کو یەکەم جارە گەشتەکێ بکەت بەردەوام یێ

**ل دوور خوه دژڤڕیت، ترسا وێ چەندێ کو هێلده ل وی جهی بیت، ئەگەر ل وێرێ بیت هەر ب کێمی ناهێلیت ئەو هەست ب وێ خوشیا بەری نوکه دبر بکەت.**

**وی ب هووری تەماشەی دێمێ هەموو گەشتیاران دکر. بۆ دەمەکێ هۆسا هەستپێکر کو ژ لایێ ئاسایشێ ڤە وەك دوژمنەکی چاڤدێریا وی بهێتەکرن. ب تنێ ل هینگێ ئارام بوو دەمێ رێك ب وان هاتیەدان بچنە دناڤ فرۆکەیێ دا. خەیالێن وی ئارام بوون و چەند هەناسەیێن کوور هەلکێشان، ئەو دوماهیك کەس بوو کو چوویە دناڤ فرۆکەیێ دا. دیسان نامەیەکا دیتر ژی ب مێزەیا ل بەر سینگێ وی هاتبوو دانان، ئەو ژی ژێڤە کر.**

سۆفیا و ئەلبێرتۆ ل سەر پرا "بریفیك" را دەربازبوون، پشتی دەمەکێ گەهشتنە چواریانا "کراجیرو"،

سۆفیایێ گوت: "تو یێ ل سەر لەزاتیا 180ێ یێ دچی."

- "دەمژمێر یا نێزیکی نەهێ دبیت، گەلەك نەمایە دێ ل فرۆکەخانەیا کجیفیك دادەت، هەر چەوا بیت پولیسێن هاتنوچوونێ ژی ژبەر زێدەگاڤیا لەزاتیێ نەشێن مە دەستەسەر بکەن."

- "ئەگەر مە خوە ل ترۆمبێلەکێ دا؟"

- "ئەگەر ترۆمبێلەکا ئاسایی بیت، چ تشت ڕوونادەن، لێ ئەگەر وەکو یا مەبیت دێ...."

- "دێ چ ڕوودەت؟"

- "دڤێت ئەم گەلەك د ئاگەهدار بین."

- "لێ زەحمەتە نوکە ئەم بشێین ب ڕەخ ڤێ پاسا نەفەرهەلگر دەرباز بین، چونکی ژ هەردوو لایان ڤە دارستانە."

- "تشتەکێ ئاساییە سۆفیا، دڤێت تو ل سەر ڤێ چەندێ ڕا بهێی."

ئەلبێرتۆی ڕوویێ ترۆمبێلێ وەرگێڕا بۆ ناڤ وێ دارستانێ و دناڤ وان هەموو دارێن مەزن و ستوور دا دەرباز بوون. سۆفیایێ هەناسەیەك هەلکێشا و گوت: "تە ئەز ترساندم."

- "ئەگەر خوە ئەم دناڤ دیوارەکێ پولاییی ژی دا دەرباز ببین، ئەم هەر هەست ب چ تشتان ناکەین."

- "ڕامانا وێ چەندێ ئەوە ئەم ب تنێ هندەك گیانین دناڤ ڤێ جیهانێ دا."

- "نەخێر، ب ڤی ڕەنگی تو یا بەروڤاژی تشتان دبینی، بەلکو د ڕاستی دا دەوروبەرێن مە وەکو چیرۆکەکا سڤکن بەرامبەر مە."

- "کا ڕاوەستێ. ئەز نەشێم گوهداریا تە بکەم."

- "باشە، باش گوهداریا من بکە. هەروەکو تو دزانی ئەڤ ئاخفتنە یا بەرنیاسە دناڤ خەلکی دا کو ڕۆح وەکو هەلمێ یا سڤکە، لێ دڕاستی دا بەروڤاژی دروستە، ڕۆح ژ بەستیێ ڕەقترە."

- "بەری نوکە من چ جاران هزر د ڤی تشتی دا نەکربوو."

- "باشە، ئەز دێ چیرۆکەکێ بۆ تە ڤەگێڕم، ڕۆژەکێ زەلامەك هەبوو باوەری ب فریشتەیان نەبوو، جارەکێ دناڤ دارستانەکێ دا فریشتەیەك هاتە دەڤ وی."

- "ێ.. و پاشی؟

- "بۆ دەمەکی پێکڤە دچوون، پاشی وی زەلامی بەرێ خوە دا فریشتەی و گوتێ: ئەز یێ نەچارم باوەر بکەم کو فریشتە هەنە، لێ وەکو مە هەبوونا خوە نینە. فریشتەی پرسیار ژێ کر: "مەرەما تە چیە؟". وی زەلامی ژی د بەرسڤا خوە دا گوت: "دەمێ ئەم گەهشتینە دەڤ وی بەرێ مەزن، ئەز یێ نەچاربووم خوە بدەمە ڕەخەکی، لێ من سەحکرێ تو یێ دناڤ وی بەری ڕا دەرباز دبی. دەمێ ئەم گەهشتینە دەڤ وێ دارا مەزن ژی هەر تە ب ساناهی خوە دناڤ وێ دارێ ڕا دەربازکر و ب ساناهی تو دەرباز بووی. بەرسڤا وی زەلامی فریشتە حێبەتی کر. پاشی گوت: "ئەرێ تە نەسەحکرێ دەمێ ئەم دناڤ وێ گومێ دا چووین؟ ل وێرێ دا ئەم هەردوو پێکڤە دناڤ وێ هەلمێ دا دەرباز بووین، چونکی پێکهاتەیا مە هەردووکان ژ وێ هەلمێ ب هێزترە."

- "هەر ئەو تشت ب سەرێ مە ژی دهێت، سۆفیا. ڕۆح دشێت دناڤ دەرگەهێن ئاسنی ڕا دەرباز بیت، چ چەك نەشێن ڕۆحا تە بکوژن و ژناڤببەن."

- "هزرکرن د ڤی بابەتی دا بۆ من گەلەك یا سەیرە."

- "نوکە دێ گەهینە "ڕیزور"ێ. ل وی دەمێ ئەم ژ کۆلکێ مایجەر ستوجای دەرکەفتین و هەتا نوکە هێشتا دەمژمێرەك دەرباز نەبوویە، من دڤێت ئەز قەهوەیەکێ ل بلنداهییێن دەڤەرا "ڤیان" ڤەخوم.

بەری بگەهنە سوندرلید، دەستێ چەپێ قەهوەخانەیەك هەبوو و ناڤێ ساندرێلاییێ ل سەر بوو. ئەلبێرتۆ بەرەڤ وێرێ ڤە چوو و ترۆمبێل ل سەر گیای ڕاوەستاند.

سۆفیا دناڤ وێ قەهوەخانێ ڤە دا پێکۆل کر شووشەکا کولاییێ هەلبژێریت، لێ بێ مفابوو، هۆسا دیاربوو یا ب مێزێ ڤە هاتیە چەسپاندن، پشتی دەمەکی ئەلبێرتۆی کوپەك ژ ترۆمبێلێ دا ئینادەر، ب هەمموو هێزا خوە پێکۆل کر دا کوپێ خوە تژی قەهوە بکەت لێ نەشیا چ کارەکێ بکەت.

ئەلبێرتۆ گەلەك تۆڕە بوو. تەماشەی خەلکی کر و ب دەنگەکێ بلند داخوازا هاریکارییێ ژێ کر، لێ کەسێ بەرسڤا وی نەدا، ب دەنگەکێ بلندتر گازی کر کو سۆفیا ژبەر دەنگێ وی یێ بلند ترسیا و هەردوو گوهێن خوە گرتن.

- "من قەهوە دڤێت."

دەمێ بۆ وی دیاربووی نەشێت چ بکەت، پیچەك داهات و دەست ب کەنییێ کر.

- "وان ئاگەهـ ژ مە نینە. بێگومان ئەم نەشێین قەهوەیا وان ڤەخوین."

دەمێ دا دەرکەڤنە ژ دەرڤە، پیرەژنەك ل سەر کورسیکەکا ب ڕەخ وان ڤە ڕابووڤە و بەرەڤ وان ڤە هات، تەنۆرەیەکێ سۆر و بلۆزەکێ سۆڤ یێ شین کو ژ دەستی هاتبوو دروست کرن ل بەر بوو و شالەکا سپی ل سەر سەری بوو.

ڕەنگێ جلکێن وێ و کەسایەتیا وێ دگەل هەمموو وان مرۆڤێن د قەهوەخانێ ڤە یا جودابوو،

- "تە چیە کوڕێ من تو هۆسا دکەیە گازی؟
- "ببوورە."
- "تە گوت تە قەهوە دڤێت، مانە؟"
- "بەلێ، لێ..."

- "مە دەزگەهەكێ بچووك ل ڤان نێزیكان یێ هەی."

دگەل وێ چوونە ژ دەرڤە. ل دەمێ چوونێ دا پیرەژنێ پرسیار ژێ كر: "دیارە هوون ژ نوو هاتینە ڤێرێ؟"

ئەلبێرتۆی بەرسڤا وێ دا: :بەلێ، ئەم دشێین وەبێژین."

- "باشە، هوون بخێر هاتن بۆ شاهنشینا هەتا هەتایی، نەڤییێن من."

- "ئەرێ پا تۆ؟"

- "ئەز دناڤ چیرۆكا برایێن "گریم" دا هاتیم، زێدەتری دووسەد سالان هەیە ئەز ل ڤێرێ، هوون ژی برایێن من یێن بچووكن. هوون ژ كیڤە هاتینە؟"

- "ئەم ژی یێن دناڤ پەرتووكەكا فەلسەفی دا هاتین، ئەز مامۆستایێ فەلسەفێ مە و ئەڤە ژی قوتابیا من سۆفیا یە."

- "بەلێ ڕاستە، ئەڤە تشتەكێ نوویە!"

پشتی دەمەكی، گەهشتنە گورەپانەكا ڕۆهن، ل وێرێ هندەك خانییێن ب ڕەنگێ قەهوایی و دلڤەكەر هەبوون، دناڤ حەوشا وان خانییان دا ئاگرەكێ مەزن ژ بۆ جەژنا قەشە یوحەنای هەلكربوو، هندەك سەماكەر ژی ل دەردورێن وی ئاگری هەبوون. سۆفیایێ پڕانیا وان كەسان دنیاسین: چیكا خوناڤێ و هەر حەفت بەژن كورتك، سەندرێلا، شارلوك هۆلمز، پیتەر بان، جەنانا خوەدانا گورەیێن درێژ. ژ بلی ڤان كەسان ژی چەندین كەسێن دی یێن ئەفسانەیی ژی ئامادەبوون.

ئەلبێرتۆی ب حێبەتی ڤە گوت "جوانە! لێ ئەڤە چ قەرەبالغە!"

- "وەكو تو دزانی نوكە شەڤا جەژنا قەشە یوحەنایە. ل ڕۆژا "فالبۆرگ"ێ وەرە مە چ شەڤبیرییێن هۆسا نەبوون، وی دەمی ئەم ل ئەلمانیا بووین، نوكە ب تنێ بۆ سەرەدان ئەز یا هاتیمە ڤێرێ. تە گوت دێ قەهوێ ڤەخوی مانە؟"

- "بەلێ، گەلەك سوپاس."

سۆفیایێ زانی كو ئەو خانی هەموو ژ كێك و شەكرێ هاتینە چێكرن، هندەك ژ وان مێهڤانان كێك و شیرینی ژ وی خانی دخوارن، ژنەك ژی ل دورماندوری خانی دزڤڕی و

ئەو جهێن ئامادەبوویان ژێ دخوار دووبارە چێدکرنەڤە، سۆفیایێ لەڤەکا بچووك ل ڕەخەکێ خانی دا و تاما وێ ژ هەموو ئەو تشتێن کو بەری نوکە وێ خوارین خوشتر بوو.

پشتی دەمەکێ پیرەژن ب قەهەوە ڤە زڤڕی. ئەلبێرتۆی گوتێ: گەلەك سۆپاس."

- " ل بەرامبەری قەهوێ دێ چ دەنەمە؟"
- "چ بدەینە وە؟"
- "ل ڤێرێ ل شوونا وەرگرتنا تشتەکی، دڤێت چیرۆکەکێ ڤەگێڕی، بۆ قەهوەیەکێ سەرهاتیەکا کورت ژی باشە."
- "د ڕاستی مە دشیا هەموو چیرۆکێن سەیر یێن مرۆڤاتیێ بۆ هەوە بێژین، لێ ب لێبورین ڤە دەمێ مە گەلەك یێ کێمە، ئەرێ دروستە جارەکا دی ئەم بهێین و چیرۆکەکێ بۆ هەوە ڤەگێڕین؟"
- "بێگومان دروستە، لێ بۆچی دەمێ هەوە یێ کورتە؟"

ئەلبێرتۆی بابەت بۆ ڤەگێڕا و پیرەژنێ گوت: "ڕاستە، هوون ژ نوو یێن ژ دایکبووین، لێ دڤێت ژ نوکە پێڤە خوە ژ تەڤایا مرۆڤان ببڕن، ئەم ئێدی سەر ب گوشت و خوینا مرۆڤان ڤە نینین، نوکە ئەم سەر ب وی خەلکی ڤەینە یێن نەهێنە دیتن."

پشتی دەمەکی، سۆفیا و ئەلبێترتۆ بەرەڤ قەهوەخانەیا سەندرێلایێ و ترۆمبێلا خوە یا سۆر ڤەگەڕیان، ب ڕەخ ترۆمبێلا وان ڤە، ژنەکێ هاریکاریا زارۆیێ خوە دکر بمیزیت. پشتی کو ڕێکا خوە کورتکری و د چەندین بیستان و دارستانێن بچووك ڕا دەرباز بووین، بلەز گەهشتنە "لیلساند".

**دەمژمێر نەهـ و نیڤێ شەڤێ، فرۆکەیا س.ك 876 یا ژ کوپنهاگنێ دهاتی دادا.ل وی دەمی مایجەری دوماهیك نامە دیتبوو ل سەر پەنجەرا جهێ پشکنینا کارتەیان دیت و دەست ب خواندنا وێ کر.**

**بۆ مایجەر ئەلبێرت کناگی، ژ دەڤ مێزا بۆردین کارتا فرۆکەخانەیا کوپنهاگن، ئێڤارا جەژنا ڤەشە یوحەنای 1990.**

بابێ من یێ خۆشتڤی

دبیت تو هزر بکەی ژ نیشکەکێ ڤە ئەز ل فرۆکەخانەیا کوپنهاگن بووم ، لێ دەستهەلاتا من ل سەر هاتنوچوونا تە دا پترە، ئەز ل هەموو جهان تە دبینم باب، د ڕاستی دا من سەرەدانا مالا وێ ژنێ کر ئەوا بەری چەندین سالان خودیکا برۆنزی فروتیە داپیرا من یا مەزن. وێ تەپەکا کریستال ژی یا دایە من. نوکە ئەز یا تە دبینم تو یێ کورسیکا خوە یا ڕوونشتنێ دروست دکەی، ژبیرنەکە ڤایشا خوە باش بگرێدە، ل جهێ خوە بمینە هەتا گلۆپێن دناڤ فرۆکەیێ دا دهێنە ڤەمراندن، هەردەمێ ڕۆناهی هاتنە ڤەمراندن بێهنا خوە ڤەدە ئەز یا دبینم تو یێ وەستیای. سەڤایێ لیلسەند گەلەك یێ خوشە لێ پلا گەرماتییێ وێ پیچەکێ ژ یا لوبنانێ نزمترە، ب هیڤیا گەشتەکا خۆش بۆتە.

سلاڤێن کچا تە یا سێرەبەند بو تە، شاه ژنا خودیکێ.

سێرەبەندا تە یا بچووك و خوشتڤی

د ڕاستی دا ئەلبێرتی نەدزانی یێ وەستیایە یان یێ تۆڕەیە، پاشی ژ نیشکەکێ ڤە ب دەنگەکێ بلند کرە کەنی تا وی ڕادەی کەسێن دەوروبەرێن وی هەمووان تەماشەی وی کر. پاشی فرۆکە ڕابوو.

هێلدێ هەر ئەو یاریا بابێ خوە بکاردئینا، لێ د سەر هندێ ژی ڕا جوداهیەکا مەزن هەبوو. یاریا ئەلبێرتی ب تنێ ل سەر ئەلبێرتۆی و سۆفیایێ بوو، کو ئەو ژی ب تنێ هندەك کەساتیێن ئاشوپی و بەرهەمێ هزرا وی بوون.

ئەلبێرتی شیرەتا کچا خوە ل بەر بەرچاڤ وەرگرت، دەمەکێ پاڵڤەدا و چاڤێن خوە دانانە سەر یەك. دەمێ گەهشتیە خالا کۆنترۆلکرنا پاسپۆڕتان، هەر دناڤ وێ هۆلێ دا کەڤتە بەر سینگێ خۆنیشاندانەکا ڕاستەڤینە.

**نێزیکی دەهـ کەسێن د ژییێ هێلدێ دا بوون، ل سەر لافیتەیێن خوە نڤیسیبوو؛ "تو بخێرهاتی بۆ مال، بابێ من"، "هێلد دناڤ باخچەی دا چاڤەرێی تەیە"، "گێلەشوك هێشتا یا بەردەوامە".**

**یا ژ هەمووان خراپتر ئەو بوو نەدشیا یەکسەر بەرەڤ تەکسیەکێ ڤە بچیت، چونکی پێدڤی بوو چاڤەرێی چانتەیێن خوە بکەت. ب ڤی ڕەنگی نەچاربوو دناڤ هەڤالێن هێلدێ دا بمینیت و وان نڤیسینان دووبارە و سێبارە هەمووان بخوینیتەڤە. پشتی دەمەکێ حێبەتی ما دەمێ کچەك ب دەستکەکێ گولان ڤە هاتیە پێشوازیا وی. وی دەستێ خوە هاڤێتە بەریکا خوە و چکلێتەك پێشکێشی وێ کر، ب تنێ دوو چکلێت بۆ هێلدێ مان. دەمێ چانتەیێن وی گەهشتین، کورەك هاتە بەر سینگێ وی و گوتێ ئەم یێن د خزمەتا شاهژنا خودیکێ دا، فەرمان یا ب مە کری هەتا بجێرکلی تە بگەهینین، خونیشاندەرێن دی ژی دناڤ وی قەرەبالغێ دا ژێکڤەبوون..**

**ئەو سوواری ترۆمبێلێ بوون. ل هەر جهەکێ گەهشتبانێ بەرامبەر کونێن تۆنێلا و پرین هاتنوچونێ لافیتە دهەلاویستیبوون؛ "بخێر بهێی بۆ مال"، "ئەم چاڤەرێی تەینە"، "باب ئەژ دێ شێم تەبینم".**

**دەمێ ل دوماهیێ گەهشتینە بجێرکلی، ئەلبێرتی بێهنا خوە کوور درێژ و 100 کرۆن و سێ شووشەیێن مەزن یێن بیرێ دانە شۆفێری. مارینا یا هەڤژینا وی ل بەر دەرگەهی یا چاڤەرێ وی بوو، پشتی بۆ دەمەکێ هەمبێزکری پرسیار ژێ کر؛ "کانێ هێلد؟"**

- **"یا ل خوارێ ل نك بەلەمێ چاڤەرێی تەیە."**

ئەلبێرتۆ و سوفیایێ ترۆمبێلا خوە یا سۆر ل گۆڕەپانا بازێرێ ل لیلسەند ل نێزیکی ئوتێلا "نورج" ڕاوەستاند، دەمژمێر دەهـ کێم چارێکەك بوو، ل وی جهی تەماشەی ڕۆناهیا یارییێن ئاگری ل لایێ دی ل گزیرتەکا نێزیکی دکر.

سۆفیایێ پرسیار کر: ئەم دێ چەوا گەهینە بجێرکلی؟"

- "ئەم دێ لێگەڕیێن، بیرا تە ل تابلویا ل کۆلکێ مایجەری ڤە دهێت؟"

- "دڤێت ئەم لەزێ بکەین، من دڤێت بەری ئەو بگەهیت ئەز ببینم."

ئەو بەرەڤ ڕێکەکا بچووک ل نێزیکی دول و ئەڤرازیان چوون، د پشتڕاست بوون کو بجێرکلی یا ل سەر کنارێ دەریاچێ. ژ نیشکەکێ ڤە سۆفیایێ ب دەنگەکێ بلند گوت: "یا ل ڤێرێ! مە دیت."

- "تو ڕاست دبێژی، لێ دەنگێ خوە بلند نەکە."
- "بۆچی؟ کەسێ ئاگەهـ ژ دەنگێ مە نینە!"
- "خوشتڤیا من سۆفیا، ئەڤ دەرئەنجامێن تە یێن بلەز پشتی ڤی کورسێ فەلسەفی یێ من بێزار دکەت."
- "بەلێ پا..."
- "تو هزر دکەی کو ئەڤ جهە یێ ڤالاْیە ژ بەژن کورتلە و گیانێن ناڤ دارستانێ و ئەجنەییێن باش؟"
- ئاها، ببورە!"

د بەر دەرگەهێ باخچەی ڕا دەربازبوون و گەهشتنە سەر ڕێکا بەران، ئەلبێرتۆی ترۆمبێل ل گۆڕەپانا نێزیکی باخچەی ڕاگرت. وێڤەتر مێزەیەك بۆ سێ کەسان یا ڕازاندی بوو.

- "ئەز دشێم هێلدێ ببینم! هەروەکو چەوا من د خەونێ دا دیتبوو، ئەوا هەیە ب ڕەخ بەلەمێ ڤە یا ڕوونشتییە."
- "ئەرێ تو دبینی، باخچەی وان ژی هەروەکو باخچەی هەوەیە."
- "ئەرێ تو ڕاست دبێژی، جۆلانکا وان ژی وەکو یا مەیە، هەموو تشتێن ڤێرە وەکو یێن مەنە، ئەرێ دروستە ئەز بچمە نك هێلدێ؟"
- "بێگومان ، ئەز ب خوە دێ ل ڤێرە چاڤەڕێی تە بم."

سۆفیا بلەز بەرەڤ خوارێ چوو، هەر چ نەمابوو خوە ل هێلدێ بدەت، پاشی خوە کۆنترۆلکر و ب جوانی ب ڕەخ وێ ڤە ڕوونشت. هێلد یا ڕوونشتی بوو و یاری ب وەریسکێ بەلەما گرێدایی دکرن. کاغەزەکا بچووك د دەستێ وێ یێ چەپێ دا بوو، چەند جارەکان ژی تەماشەی دەمژمێرا خوە کر هەروەکو دا بێژی یا ل هیڤیا کەسەکی. هێلد د چاڤێن

سۆفیایێ دا گەلەك یا جوان بوو، پرچەکا زەر و خەلەك و دوو چاڤێن کەسەك هەبوون و کراسەکێ زەر ل بەردا بوو، پیچەك وەکو جوانایێ بوو. هەر چەندە سۆفیایێ دزانی یا بێ مفایە ئەو دگەل بئاخڤیت، لێ پێکۆل کر دگەل باخڤیت.

- "هێلد. ئەڤە ئەزم سۆفیا."

لێ هێلدێ بەرسڤا وێ نەدا. سۆفیا ل سەر چوکێن خوە ڕوونشت و پێکۆل کر بچیتە بن گوهێ وێ و بکەتە هەوار.

- "هێلد تە ئاگەهـ ژ من هەیە؟ ئەرێ ما تو یا کەڕ و کورەی؟"

سۆفیایێ هەستپێکر چاڤێن هێلدێ حێبەتی مان، دبیت ئەو نیشانەك بیت کو هێلدێ ئاگەهـ ژ تشتەکێ بوو هەرچەند یێ کێم ژی بیت. هێلد بۆ ڕەخێ ڕاستێ زڤڕی. چاڤێن وێ ب چاڤێن سۆفیایێ کەفتن، لێ هەروەکو ئەو یا دناڤ سۆفیایێ دا تشتەکێ دی دبینیت و ب هیچ ڕەنگەکێ سۆفیا نەدیت.

- "دەنگێ خوە گەلەك بلند نەکە سۆفیا."

ئەلبێرتۆ کو ب ڕەخ ترۆمبێلێ ڤە بوو. ئەو چەندە گوتێ: "من نەڤێت باخچە تژی ببیت ژ ئەجنەیێن دەریایێ."

سۆفیا ب بێدەنگی ب ڕەخ هێلدێ ڤە ڕوونشت، ل دەڤ وێ ڕوونشتن ژی ب ڕەخ هێلدێ ڤە هەر یا خۆش بوو. ژ نیشکەکێ ڤە دەنگێ زەلامەکێ هات.

- ""خۆشتڤیا من، هێلد!"

ئەو مایجەر بوو ب جلکێن خوە یێن لەشکەری و کولاڤێ خوە یێ شین ل هنداڤ دەرگەهێ باخچەی. هێلد بلەز بەرەڤ وی ڤە چوو، دناڤبەرا جۆلانکێ و ترۆمبێلا سۆر گەهشتنە هەڤدوو. پاشی بابێ وێ ئەو بەرەڤ ئەسمانی بلندکر و هەمبێزکر.

**ل دوماهیێ، هێلدێ بڕیار دا ل سەر بەندەرێ بەلەمێ چاڤەڕێ بابێ خوە بکەت. ژ وی دەمی بابێ وێ ل فرۆکەخانەیا کوپنهاگن هاتیە خوارێ، هێلدێ ددلێ خوە دا دگوت**

ئەرێ دێ هەلویستێ بابێ من چ بیت بەرامبەر نامێن من. هەر ژ دەمێ سپێدێ وەرە هەموو ئەو تشتێن وێ کرین ل سەر وێ کاغەزێ نڤیسابوون.

یا هەکە ئەو تۆرە بوو؟ نە یا ب ساناهیە ئەو پەرتووکەکا پڕی نهێنی بۆ کچا خوە بنڤیسیت و چاڤەڕێ نەبیت چ تشتێن هۆسا ڕووبدەن؟

جارەکا دی تەماشەی دەمژمێرێ کر. نوکە دەهـ و چارێکەکە، دڤێت ڤان نێزیکان ئەو بگەهیت. ئەرێ ئەڤە چیە؟ هەروەکو وێ خەونەك ب سۆفیایێ ڤە دیتی، ئاگەهـ ژ دەنگەکێ هەبوو، دەنگەکێ کێم.. ئەو دەنگێ چیە؟

هێلد ل دور خوە زڤڕی. یا پشتڕاست بوو کو تشتەك یێ ل وان دەوروبەران، بەلێ یا ئەو تشت چیە؟ دبیت ب تنێ جوانیا ئێڤارەکا هاڤینێ بیت و نەك زێدەتر.

بۆ چەندەکێ هەستپێکر کو یا دشێت تشتێن نەدیتی ببینیت.

- "خوشتڤیا من، هێلد."

هێلد ل دور خوە زڤڕی، ئەو بابێ وێ بوو کو یێ دناڤ باخچەی دا چاڤەڕێی وێ دکەت. بلەز بەرەڤ بابێ خوە چوو و ب رەخ جۆلانکێ ڤە گەهشتنە هەڤدوو. بابێ وێ ئەو هەمبێز کر دوو سێ جاران بەرەڤ ئەسمانی بلند کر. هێلدێ دەست ب گرییێ کر، بابێ وێ ژی نەشیا ڕۆندکێن خوە کۆنترول بکەت.

- "تو یا مەزن بووی، تو یا بوویە ژنەکا بچووك!"
- تو ژی یێ بوویە نڤیسەرەکێ ڕاستەقینە!"

هێلدێ ب کراسێ خوە یێ زەر ڕۆندکێن خوە پاقژکرن.

- " نوکە ئەم د وەکهەڤین؟"

ئەو هەردوو ل سەر مێزێ ڕوونشتن، بەری هەر تشتەکێ هێلدێ د ڤیا بابێ وێ وان ڕووادنێن ل فرۆکەخانەیا کوپنهاگن چێبووین بۆ وێ بڤەگێڕیت. پاشی هەردووکان پێکڤە کرە کەنی.

- "ئەرێ تە ئەو نامەیا دناڤ قەهوەخانێ دا نەدیت؟"

**- "بۆچی تە وە کر ئەز ل سەر مێزێ ب ڕوونم و چ تشتان نەخۆم! نوکە ژی ئەز گەلەك پێ برسیمە."**

**- "بابێ من پێ هەژار."**

**- "چیرۆکا ڤاژا حەشاندی چ ڕاستی بۆ نینن، مانە؟"**

**- "نەخێر، هەموو تشت ڕاستینە، لێ دایکا من ئەڤرۆکە دێ خوارنێ ئامادە کەت."**

**پاشی ئەو چوونە سەر بابەتێ فائیلێ دا و سحبەتا ئەلبێرتۆی و سۆفیایێ. د وی دەمی دا دایکا هێلدێ هات و ڤاژا حەشاندی دگەل زەلاتێ و شەربەتێ و نانی ئینان.**

**بابێ وێ بەحسێ ئەفلاتۆنی دکر دەمێ هێلدێ ئاخفتنا وی بڕی.**

**- "هششششش..."**

**- "چیە؟"**

**- "من گوهـ ل دەنگێ تشتەکی بوو، وەکو دەنگێ مشکی بوو. ئەز یا پشتڕاستم؟"**

**- "لێ ئەز دبێژم هێشتا وانەیێن فەلسەفێ ب دوماهی نەهاتینە."**

**- "مەرەما تە چیە؟"**

**- "ئەڤ شەڤە دێ بۆ تە بەحسێ گەردوونی کەم."**

**بەری ئەو دەست ب خوارنێ بکەن، بابێ هێلدێ گوت: "ئەز دبێژم هێلد یا مەزن بووی و نەشێم بدانمە سەر چوکێن خوە، لێ تو هێشتا نەهاتیە گوهۆڕین."**

**دگەل گوتنا ڤان پەیڤان وی هەڤژینا خوە مارین هەمبێزکر.**

**- "ئەز دبێژم تو یا نێزیکی چل سالیێ بووی."**

دەمێ سۆفیایێ دیتی هێلد یا بەرەڤ بابێ خوە ڤە دچیت و وی هەمبێز دکەت، ڕۆندك ژ چاڤێن وێ هاتنە خوارێ! سۆفیای دزانی چ جاران وەکو وێ لێناهێت و چاڤێن وێ پێنەڕادبوون ژبەرکو ئەو مرۆڤەکا ڕاستەقینەیە.

دەمێ هێلد و بابێ خوە ل سەر مێزێ ڕوونشتین، ئەلبێرتۆی هۆڕنەك لێدا و سۆفیا بەرەڤ وی ڤە چوو و دناڤ ترۆمبێلێ دا ب ڕەخ ڤە ڕوونشت. سۆفیایێ سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی هێلدێ کر، لێ هێلدێ ئاگەهـ ژ وێ نەبوو.

ئەلبێرتۆی گوت: "دێ بێهنەکێ خوە گرین دا بزانین دێ چ چێبیت."

سۆفیایێ سەرێ خوە ب بەلێ هەژاند.

- "تە دکرە گری؟"

جارەکا دی ژی سەرێ خوە ب بەلێ هەژاند.

- "بۆچی ما چ چێبوویە؟"

- "ئەو یا بەختەوەرە، چونکی ئەو مرۆڤەکا ڕاستەقینەیە. هێدی هێدی مەزن دبیت و دبیتە ژنەکا تەمام، بێگومان دێ وێ زارۆك ژی هەبن."

- "زارۆکێن وێ دێ د بچووك ژی بن، سۆفیا. هەر تشتەکێ دوو لایەن هەنە. هەر ژ دەستپێکا کۆرسێ فەلسەفێ من دڤیا تە فێری ڤێ چەندێ بکەم."

- "تو هزرا چ دکەی؟"

- "ئەز ژی وەکو تە دانپێدانێ دکەم کو ئەو یا بەختەوەرە. لێ هەر کەسێ بەختێ ژیانێ هەبیت دڤێت تام بکەتە مرنێ ژی، چونکی مرن و ژیان پێکڤە دگرێداینە."

- "ئەرێ ما ئەو ژیان باشتر نینە ژ وێ یا کو ئەم چ جاران ب ڕاستی نەژین؟"

- "ئەم نەشێین چ جاران د ژیانەکا وەکو ژیانا هێلدێ دا بژین، یان ژیانا مایجەری، لێ ل بەرامبەر وێ دا ئەم چ جاران نامرین. بیرا تە دهێت وێ پیرەژنا دناڤ دارستانێ دا چ گوت بوو؟ ئەم سەر ب وی خەلکی ڤەینە یێ نەهێتە دیتن. هەردیسان وێ گوت ژیێ من نێزیکی دوو سەد سالایە. لی د ئاهەنگا ڤەشە یوحەنای دا من هندەك کەسایەتی دیتن ژیێ وان پتر بوو ژ سێ هزار سالان"

- "دبیت پترین تشتێ ئەز حەسیدیێ ب هێلدێ ببەم، ژیانا وێ یا خێزانی بیت."

- "لێ پا تە ژی خێزان هەیە. تە پشیکەك و کیسەلەیەك و دوو چووچك ژی هەنە.

- "لێ مە ئەو کەتوار ژی بجهـ هێلا."

- "نەخێر، ب تنێ مایجەر ژ وی کەتواری یێ دەرکەفتی. ئەڤە تشتەکێ جودایە. وی خالا ڕاوەستیانا دوماهیێ دانا، کچا من. ئەو چ جاران نەشێت مە ببینیتەڤە."

- "مەرەما تە ئەوە ئەم دشێین بزڤڕینەڤە دەف وی؟"

- "ئەگەر مە ڤیا ئەم دشێین وەبکەین. لێ دڤێت بزڤڕینە ناڤ دارستانێ و هەڤالینیێ دگەل هندەك كەسایەتیێن ل پشت قەهوەخانێ دروست بکەین."

خێزانا کناگی ل سەر مێزا خوارنێ ڕوونشتن، سۆفیا تڕسیا خوارنا وان ژی وەکو ئاهەنگا دناڤ باخچەی ل تاخێ کلۆڤەر لێبهێت، مایجەری دڤیا هەڤژینا خوە بدانیتە سەر مێزێ لێ پاشی زڤڕاندەڤە د هەمبێزا خوە دا.

ئەلبێرتۆ و سوفیایێ ترۆمبێلا خوە پیچەك دووری وێ خێزانێ ڕاوەستاندبوو یا مژوولی خوارنا شیڤێ بووین، وان زێرەڤانیا ل باخچەی دکر و بیرهاتنێن ئاهەنگا خوە د ئینانە بەر چاڤێن خوە.

دەم نێزیکی نیڤا شەڤێ بوو، ئەو خێزان ژ سەر شیڤێ ڕابوون. هێلد و بابێ خوە بەرەڤ جۆلانکا دناڤ باخچەی دا چوون. هێلدێ دەستێ خوە بۆ دایکا خوە بلند کر:

- "دادێ، تو هەڕە بنڤە! چونکی هێشتا مە گەلەك بابەت هەنە دڤێت دانوستاندنێ ل سەر بکەین."

# پەڤینا مەزن

...ئەم ژی تۆزا ستێراینە...

هێلد ب ڕەخ بابێ خوە ڤە ل سەر جۆلانکێ خوە دێژ کر. دەمژمێر نێزیکی دوازدێ شەڤێ بوو. بۆ دەمەکێ درێژ وان تەمەشەی دەریایێ دکر، ل وی دەمی ستێرێن ئەسمانی دبرسقین و پێلێن دەریایێ ژی هێدی هێدی بەرەڤ بەلەما بچووک ڤە دهاتن.

بابێ هێلدێ بێدەنگی شکاند و دەست ب ئاخفتنێ کر.

- "تشتەکێ سەیرە دەمێ ئەم هزر دکەین ئەم یێن ل سەر ئەختەرەکا بەرزەبووی دناڤ ڤی گەردوونی دا دژین."

- "بەلێ."

- "ئەرد یەکە ژ وان ئەختەرێن ل دور ڕۆژێ دزڤرن، لێ دگەل هندێ ژی ئەڤ ئەختەرە ب تنێ یا زیندی یە و ژیان ل سەر هەیە."

- "دناڤ گەردوونی هەموویێ بەس ئەو یا زیندی یە؟"

- "ما کی دزانیت؟ چێدبیت دناڤ گەردوونی دا گەلەک ئەختەرێن دی یێن زیندی هەبن چونکی ئەڤ گەردوونە گەلەک یێ مەزنە، مەودایێ وان هند یێ درێژە کو "خولەکێن ڕۆناهیێ" و "سالێن ڕۆناهیێ" دهێتە پیڤان."

- "مەرەما تە ژ ڤێ چەندێ چیە؟"

- "خولەکێن ڕۆناهییێ، ئەو دووراتیە یا ڕۆناهی د ماوەییێ خولەکەکێ دا دبڕیت. ئەم دشێین ڤێ دووراتی بپیڤین ژبەرکو ئەم دزانین لەزاتیا ڕۆناهیا ڕۆژێ د هەر خولەکەکێ دا 300 هزار کیلومەترن. ئانکو هەکە 300 هزارێ لێکدانێ 60 چرکەیان بکەین دێ بۆ مە دەرکەڤیت کو ڕۆناهی د هەر خولەکەکێ دا 18 ملیون کیلومەتران دبڕیت."

- "ئەرێ ڕۆژ چەند یا ژ مە دویرە؟

- "پیچەکێ کێمتر ژ هەشت خولەکێن ڕۆناهییێ. ئانکو ئەو تیشکا د وەرزێ هاڤینێ دا مە گەرم دکەت، هەشت خولەکان دبڕیت هەتا ژ ڕۆژێ دگەهیتە سەر ئەردی."

- "یێ بەردەوام بە."

- "لێ دوورترین ئەختەر د کومەلا ڕۆژێ دا کو ئەختەرا پلوتویە، نێزیکی پێنج دەمژمێرێن ڕۆناهییێ یا ژ مە دوورە."

- "ئانکو ئەم دشێین بێژین دەمێ فەلەکناس بەرێ تێلسکوپێن خوە ددەنە ڤێ ئەختەرێ، ئەو وێنەیەکێ بەری پێنج سالان دبینن. یان ژی ب ڕەنگەکێ دی بۆ تە بێژم، هەر وێنەیەك ژ ئەختەرا پلوتوییێ پێدڤی پێنج سالایە هەتا بگەهیتە مە."

- "ئەز دبێژم ئەڤە پیچەکێ یا ب زەحمەتە، لێ ئەز د ناڤەرۆکا بابەتی گەهشتم."

- "گەلەك باشە هێلد، ئەم هێدی هێدی چینە دناڤ بابەتی دا."

- "ئەڤ ڕۆژا ئەم ل ئەسمانێ دبینین، ستێرەکە ژ 400 ملیار ستێرێن گالاکسیەکێ کو دبێژنێ گالاکسیا "ڕێکا شیری" و شێوەییێ وێ وەکو یێ لولەکێ یە و هژمارەکا بازنەیێن بادای یێن ل دور هاتینە ئالاندن و ل سەر یەك ژ ڤان بادانان، ستێرا مە یا ڕۆژێ هەیە.

- "ئەگەر د شەڤەکا یا زڤستانێ یا ڕۆهن دا ئەم تەماشەی ئەسمانی بکەین، دێ شێوەییێ ستێران وەکو ڤایشەکا بەرفەرهـ بینین، چونکی دیتنا مە ڕاستەخو بەرەڤ سەنتەرێ ڤێ ڕێکا شیری دچیت."

- "ژبەر هندێ ب زمانێ سویدی دبێژنە ڕێکا شیری "ڕێکا زڤستانێ"

- "دووراتیا نێزیکترین ستێرا ڤێ گالاکسیێ بۆ مە نێزیکی چوار سالێن ڕۆناهییێ نە. ما کی دبێژیت ئەو ستێرا هە ئەوا نوکە ئەم دبینین نەمایە و مریە. دناڤ ڤێ گزیرتا ستێران دا. هزر بکە ئەگەر نوکە فەلەکناسەك ل وێرێ یێ ڕوونشتی بیت و ب تێلسکوبێ

تەماشەی بجێرکلی بکەت، دبیت ئەو دیمەنێن بەری چوار سالان و کچەکا د ژیێ یازدە سالیێ دا ببینیت کو ل سەر جۆلانکێ یا پێن خوە د هەژینیت."

- "ئەڤە یا بالکێشە."

- "سەرەرای کو ب تنێ ئەڤ ییێ بەحسێ نێزیکترین ستێر بۆ ئەختەرا مە دکەم، هەموو گالاکسی یان یان وەکو دبێژنێ "مژا ستێران" ب درێژاهیا نۆت هزار سالێن ڕۆناهیێ د گەردوونی دا دبەلاڤەنە. ئەڤە ئەو ماوەیە ییێ ڕۆناهی ژ ڤی سەرێ گالاسیان بۆ سەرێ دی دبڕیت. دەمێ ئەم تەماشەی ستێرەکا ڕێکا شیری دکەین پێنجی هزار سالێن ڕۆناهیێ یا ژ هەتاڤێ دوورە، ڕامانا وێ ئەوە ئەم ییێ وێنەییێ تشتەکێ بەری پێنجی هزار سالان دبینین.

- "ب تنێ هزرکرن د ڤێ چەندێ دا من تووشی سەرئێشانێ دکەت."

- "دەمێ ئەم ژێرەڤانیا گەردوونی دکەین، ئەم ییێ تەماشەی ڕابردووی دکەین. ئەم نەشێین چ تشتێن دی بکەین، چونکی ئەم چ جاران نەشێین بزانین گەردوون نوکە ییێ چەوایە بەلکو ب تنێ دزانین بەری نوکە ییێ چەوابوو. ئانکو دەمێ ئەم تەماشەی ستێرەکێ دکەین کو هزار سالێن ڕۆناهیێ یا ژ مە دوورە، هەروەکو ئەم ڤەدگەڕینە بەری هزار سالان و گەشتەکێ دناڤ دەمی دا دکەین."

- "یا ب زەحمەتە ئەم د ڤی تشتی بگەهین."

- "ئەم هەست ب وان تشتان دکەین یێن ئەم ب چاڤ دبینین، چونکی پێلێن ڕۆناهیێ دگەهنە چاڤێن مە لێ ئەڤ پێلە ژی پێدڤی ب دەمەکی نە هەتا ڤالاهیا ئەسمانی دبڕن و دگەهنە مە. ئەم دشێین ڤێ چەندێ دگەل بریسیان هەڤبەر بکەین، هەردەم ئەم ڕۆناهیا بریسیان دبینین پشتی هینگێ ژ نوو مە گوهـ ل دەنگێ وان دبیت، چونکی پێلێن ڕۆناهیێ ژ یێن دەنگی بلەزترن. دەمێ مە گوهـ ل وی دەنگی دبیت، د ڕاستی دا بەری هینگێ ب ماوەیەکی ئەو بریسی یا ڕوودای. دەمێ ئەڤ ستێرەکا ب دووراتیا هزار سالێن ڕۆناهیێ دبینم، هەروەکو هندێ یە ئەڤ بریسیەکا بەری هزار سالان دبینم."

- " تێگەهشتم."

- "لێ هەتا نوکە ب تنێ مە بەحسێ گالاکسیا خوە کریە. ڤەلەکناس د وێ باوەرێ دانە کو ملیاران گالاکسی د ناڤ ڤی گەردوونی دا هەنە و هەر یەك ژی ژ ملیاران ستێران پێکهاتینە. نێزیکترین گالاکسیا نێزیکی ڕێکا شیری، گالاکسیا "ئەندرومید"ە کو نێزیکی

میلون سالێن ڕۆناهیێ ژ گالاکسیا مە یا دوورە. ڕامانا ڤێ چەندێ ژی ئەوە ڕۆناهیا وێ پێدڤی ب میلون سالێن ڕۆناهیێ یە هەتا دگەهیتە مە، ژبەرهندێ دەمێ ئەم تەماشەی پنیێن وەکو عەوری یێن گالاکسا ئەندرومیدی ل ئەسمانی دکەین، هەروەکو ئەم یێ تەماشەی تشتەکێ بەری ملیون سالان دکەین. ئەگەر نوکە کەسەك ل وێرێ ب ڕێکا تیلسکوبێ تەماشەی ئەردی بکەت، ئەو نەشێت مە ببینت، بەلکو دبیت ئەو هندەك مرۆڤێن دەستپێکی یێ من مەژییێ وان بچووك ببینیت."

- "ئەڤە یا بترسە."

- "دویرترین گالاکسا هەتا نوکە هاتیە دیتن، نێزیکی دەهـ ملیار سالێن ڕۆناهیێ یا ژ مە دوورە، ئانکو ئەگەر ڕۆناهیەك ل وێرێ بگەهیتە مە، ل وی دەمی ئەم دێ تشتەکێ بەری دەهـ ملیار سالان، ئەڤە ژی دوو جاران هندی ژیێ دروستبوونا سیستەمێ ڕۆژێ یە."

- "ڤێ چەندێ سەرێ من گێژ کر."

- "دبیت پیڤانا ڤان یەکەییێن مەزن و زڤڕین بۆ ڤان سەردەمێن دیرۆکێ یێن کەڤن گەلەك یا ب زەحمەت بیت، لێ فەلەکناسان تشتەکێ گرنگتر دیت کو هاریکاریا مە بکەت باشتر د گەردوونی بگەهین."

- "ئەو چ تشتە؟"

- "هۆسا دیارە چ گالاکسیێن جێگیر د گەردوونی دا نینن. هەموو ئەڤ گالاکسیە بلەزاتیەکا مەزن ژ هەڤدوو دوور دکەڤن و ژ جهەکی دچنە جهەکێ دی. هەرچەند ئەڤ گالاکسیە ژ مە دوور بکەڤن، بلەزاتیەکا مەزنتر دلڤلڤن، ئانکو دووراتیا دناڤبەرا ئەختەران دا هێدی هێدی زێدە دبیت."

- " دێ پێکۆلێ کەم بینمە پێشچاڤێن خوە."

- "ئەگەر تو پفدانکەکێ بینی و هندەك خالێن ڕەش ل سەر وێنە بکەی و پاشی بای بکەیە تێدا، دێ بینی ئەو خالێن ڕەش دێ ژ هەڤدوو دوور کەڤن، ئانکو ئەم دشێین بێژین گەردوون ژی هۆسا درێژ دبیت و ژێك دهێتە دەرێ."

- "ئەگەرێ ڤێ چەندێ چیە؟"

- "پترییا فەلەکناسان ل سەر یەك شرۆڤەکرن بۆ درێژبوونا گەردوونی ڕێکەفتینە. بەری پازدە ملیار سالان، هەموو ئەو مادەیێن دناڤ گەردوونی دا د ڕووبەرەکێ بچووك بوون،

چریا وێ هند یا مەزن بوو مرۆڤ ب چ ڕەنگان نەشێت هزرا خوە تێدا بکەت. ژبەر هێزا ڕاکێشانێ، ماددەیێن دناڤ ڤی ڕووبەرێ بچووک بەردەوام گەرم بووینە هەتا ژ نیشکەکێ ڤە بوویە ئەگەرێ پەقینا وێ، ژبەر هندێ دبێژنێ پەقینا مەزن The Big Bang."

- "ب تنێ هزرکرن د ڤێ چەندێ دا، تەزینك ل سەر لەشێ من دا دچیت."

- "ئەڤ پەقینا مەزن بوو ئەگەرێ بەربەلاڤبوونا ڤان ماددەیان بەرەڤ هەموو ئاڕاستەیان، پشتی هێدی هێدی سارِ بووین، بوونە ستێر و گالاکسی و هەیڤ و ئەختەر..".

- "لێ تەگوت گەردوون بەردەوام ژێکدهێتە کێشان."

- "هەلبەت، ئەڤە ژی هەر ژبەر وێ پەقینێ یە ئەوا بەری چەندین ملیار سالان ڕوودای، چونکی گەردوونی چ توپۆگرافیایێن جێگیر نینن، بەلکو ژ ئەنجامێ پەقینەکێ یێ پەیدابووی و بەردەوام ئەختەر بلەزاتیەکا مەزن ژێکدوور دکەڤن."

- "ئەڤ ژێککێشانە بۆ هەتا هەتایێ دێ یا بەردەوام بیت؟"

- "ئەڤەژی پێشبینیەکە ژ هژمارەکا پێشبینیان. دبیت بیرا تە بهێت کو ئەلبێرتۆی بەحسێ دوو هێزان بۆ سۆفیای دکر. ئەگەر ئەڤ هەردوو هێزە پێکڤە کومبوون، دێ بنە ئەگەرێ وێ چەندێ ستێر ب هێلەکا نەگوهۆڕ ل دور ڕۆژێ بزڤڕن."

- "هێزا ڕاکێشانێ و هێزا سستیێ ؟"

- "بەلێ، دناڤ گالاکسیان ژی دا ئەو پەیوەندی هەیە. ژبەر هندێ چەند گەردوون پتر ژێکبهێتە کێشان، کاریگەریا هێزا ڕاکێشانێ بەرەڤ ئاڕاستەیەکێ بەروڤاژی دچیت. د هەیاما چەند ملیار سالەکان دا، دەمێ کاریگەریا پەقینا مەزن بەرەڤ کێمبوونێ ڤە دچیت، جارەکا دی دێ هێزا ڕاکێشانێ گشت تەنێن ئەسمانی نێزیکی هەڤدوو کەت و جارەکا دی ڕوودانەکا بەروڤاژی پەقینێ دێ ڕوودەت، ئانکو ئەڤ جارە هەموو تەن دێ هەڤگرتنێ کەن. لێ ئەڤ ڕوودانە ل دەمەکێ نێزیك پەیدانابیت، نەخاسم ئەگەر ئەم پیڤەرێن سالا ڕۆناهیێ ل بەرچاڤ وەربگرین. ئانکو وەکو فلمەکێ یە دەمێ ڕویدانێن وی هێدی هێدی دەرباز دبن. یان ژی پفدانکەکێ بینە پێشچاڤێن خوە دەمێ ئەم بایێ وێ بەردەین، دێ بینی کا چەوا هێدی هێدی بچووك دبیت."

- "ئەرێ هەموو گالاکسی دێ کومبن و تەنەکێ مەزن پێکئینن؟

- "بەلێ، تو باش تێگەهشتی، لێ پشتی وێ دێ چ ڕویدەت؟"

- "ئانكو دێ جارەكا دی پەقینەكا دی چێبیت و گەردوون جارەكا دی دێ بەربەلاڤ بیت، ژبەر هندێ یاسایێن سروشتی هەروەكو خوە دمینن، ب ڤی ڕەنگی گالاكسیێن نوو دروست دبن."

- "ئەڤە شڕۆڤەكرنەكا باشە. ڤەلەكناس دەربارەی پاشەڕۆژا گەردوونی، دوو ئەگەران ددانن، یان ئەڤ گەردوونە هەتا هەتاییێ ل سەر ژێككێشانا خوە دێ بەردەوام دبیت، ب ڤی ڕەنگی دووریا دناڤبەرا گالاكسیان بەردەوام دێ د زێدەبونێ دابیت، یان ژی گەردوون دیسان دێ كومبیتەڤە. ئەڤ ڕوودانە ژی ل سەر گرانی و چڕیا گەردوونی دمینیت، هەتا نوكە ڤەلەكناسێن ڤیزیایی زانیاریێن تەمام ل سەر ڤێ چەندێ نینن."

- "باشە ئەم دشێین هزر بكەین ئەگەر گەردوون هند یێ چڕ بیت كو ئەگەرێ وێ چەندێ هەبیت ڕۆژەكێ ژ ڕۆژان كومببیتەڤە، ئانكو دبیت بەری نوكە چەند جارەكان ئەڤ گەردوونە كومببیت و پەقیبیت؟"

- "هزركرنەكا بالكێشە، لێ ل ڤێرە دیسان بۆچوونەكا دی دهێتە پێش. ئەو بۆچوون ژی ئەوە كو گەردوون جارەكێ ب تنێ دێ ژێكهێتە دەر، چونكی ئەگەر بێژین دێ بۆ هەتا هەتاییێ بەردەوام د ژێككێشانێ دا بیت، ل وی دەمی مژارا پەیدابوونا بنیاتێ جیهانێ دێ پێدڤی ب چاڤخشاندنەكا دی بیت."

- "باشە پا ئەو ماددەییێن پەقین بەری هینگێ ژ كیڤە هاتبوون؟"

- "ل دەڤ باوەردارێن مەسیحی، ڕوودانا پەقینا مەزن ل دەمێ دروستبوونێ پەیدابوویە. د پەڕتووكا پیرۆز دا خودا دبێژیت "ڕۆناهی دروست ببە". بیرا تە دهێت دەمێ ئەلبێرتۆی گوتیە سۆفیایێ كو ئایینێ مەسیحی دیتنەكا هێلەكی بۆ دیرۆكا مرۆڤایەتیێ هەیە. ئانكو دیرۆك ژ خاڵەكێ دەستپێدكەت و ل خاڵەكێ دێ ب دوماهی هێت. ژبەر هندێ تشتەكێ بەرئاڤلە كو ل دووڤ دیتنا ئاینێ مەسیحی ژی گەردوون بەردەوام ژێكدهێتە كێشان."

- "ێ باشە."

- "لێ د ڕۆژهەلاتێ دا، دیتنەكا دی بۆ دیرۆكا مرۆڤایەتیێ هەیە كو ئەو ژی دیتنەكا بازنەیی یە. ئەو دبێژن دیرۆك بۆ هەتا هەتاییێ بەردەوام خوە دووبارە دكەت، ل هندستانێ

**بۆچوونەکا کەڤن هەیە دبێژیت، گەردوون بەردەوام ژێکدهێتە کێشان هەتا ل دوماهیێ جارەکا خوە لێکددەتە ڤە. دبێژنە ڤێ بیروباوەرێ "ڕۆژا براهما" و "شەڤا براهما".**

هێشتا ئەلبێرتۆ و سۆفیا دناڤ ترۆمبێلێ دا مابوون و گوهێ خوە ددا سحبەتا مایجەری ل دور گەردوونی. پاشی وی پرسیار ژ سۆفیایێ کر.

- "ئەرێ تە ئاگەهـ ژێ هەبوو، نوکە ڕۆلێن مە لێکهاتنە گوهۆڕین؟"
- "مەرەما تە چیە؟"
- "بەری نوکە وان زێرەڤانیا مە دکر بێ کو ئەم وان ببینین، لێ نوکە ئەم زێرەڤانیا وان دکەین بێ کو ئەو مە ببینن."
- "نە بەس ئەڤ چەندە ب تنێ."
- "تو هزرا چ دکەی؟"
- "بەری نوکە مە نەدزانی کەتوارەکێ دی هەیە کو مایجەر و کچا خوە هێلد تێدا دژین، لێ نوکە وان ئاگەهـ ژ کەتوارێ مە نینە."
- "ئاها، باشە ئەم ژی پیچەکێ تۆلێن خوە ژێ ڤەکەین."
- "لێ مایجەر دشێت جارەکا بهێت مایێ خوە د جیهانا مە بکەت."
- "من ژی هیڤی هەنە کو ئەم ژی دشێین مایێ خوە د جیهانا وان بکەین."
- "بەلێ یا ئەڤ چەندە تشتەکێ دەگمەنە. ما بیرا تە ل وی دیمەنێ ل قەهوەخانەیا ساندرێلایێ ناهێت. هێشتا تو یا دهێیە پێشچاڤێن من دەمێ تە پێکۆل دکری شووشەکا کوکاکولایێ بۆ خوە ڕاکەی و تو نەدشیای."

سۆفیا بێدەنگ بوو، مایجەر ژی هێشتا ل سەر سحبەتا خوە ل دور پەقینا مەزن یێ بەردەوام بوو. ژ نیشکەکێ ڤە هزرەك هاتە د سەرێ وێ دا.

سۆفیا چوو ترۆمبێلێ بپشکنیت. ئەلبێرتۆی پرسیار ژێ کر: "تو چ دکەی؟"

- "چ نە."

سۆفیایێ ڤالکا کەلوپەلان ڤەکر و کلیلکەکا ئینگلیزی ژێ ئینا دەرێ. پاشی چوو ل هەمبەری هێلدێ و بابێ وێ ڕاوەستیا و پێکۆل کر سەرنجا هێلدێ بۆ خوە بڕاکێشیت لێ پێکۆلێن وێ د بێ مفا بوون. ژبەر هندێ وێ کلیلک بلند کرە بەر ئەسمانی و دەمێ کەفتیە خوارێ ب هێز ب ئەنیا هێلدێ کەفت.

هێلدێ کرە ڤیژی: "ئای..."

وێ بلەز ئەڤ کارە دگەل مایجەری ژی کر، لێ چ ڕەنگڤەدان ژ وی دیار نەبوون. کچا وی پرسیار ژێ کر: "چ چێبوو؟"

- "ئەز دبێژم پێشیەکێ لەقەك ل من دا."
- "ما کی نابێژیت ئەو سۆکراتە یێ پێکۆلێ دکەت تە ژ بێگەهیا تە بینتە دەرێ."

سۆفیا ل سەر گیایی ڕوونشت و پێکۆل کر ب پێ خوە جۆلانکێ بلڤلڤینیت، لێ خوە نەشیا پێنگاڤەکێ ژی بلڤلڤینیت. لێ چێدبیت شیابیت ملیمەترەکا ب تنێ بلڤلڤینیت. دێ هەر چەوا بیت نە ئاریشەیە.

هێلدێ گوت: "پێن من سارە."

- "بەلێ پا سەقایێ دنیایێ ئەڤ شەڤە یێ خوشە."
- "مەرەما من سەقا نینە، ئەز یا هەست ب هەبوونا تشتەکی دکەم."
- "ل ڤێ شەڤا هاڤینێ یا خوش، کەس ژ بلی مە ل ڤێرێ نینە."
- "نەخێر. ئەز دبێژم تشتەکێ دناڤ بای دا هەی."
- "تو بێژی ئەو چ تشت بیت؟"
- "ئەرێ بیرا تە ل پلانا ئەلبێرتۆی یا نهێنی دهێت؟"
- "ما دێ چەوا ژبیرکەم؟"
- "ل ڕۆژا ئاهەنگا سۆفیایێ ئەو بەرزەبوو، دێ بێژی ئەردی داعوورا."
- "بەلێ پا..."
- "دا بێژی ئەرد شەق بوو و ئەو داعووران."
- "دڤێت چیرۆك هەر ل جهەکی بهێتە ڕاوەستاندن، چونکی ئەو ب تنێ هندەك پەیڤێن ڕۆمانەکێ بوون."

- "پەیف... باشە. باشە پا پشتی هینگێ چ چێبوو. پا بەلکو نوکە ئەو ل ڤێرێ بن؟"
- "تو هۆسا هزر دکەی؟"
- "بەلێ ئەز یا هەست ب هەبوونا وان دکەم، باب."

سۆفیا بلەز بەرەڤ ترۆمبێلێ ڤە چوو.

- "تشتەکێ کاریگەرە!"

ئەلبێرتۆی ئەڤ چەندە ب زمانێ دانپێدانێ گوت و پاشی ئەو ژی سوواری ترۆمبێلێ بوو و ئەو کلیلکا ئینگلیزی ژی د دەستان دا بوو. پاشی گوت: "چ پێنەڤێت ڤێ کچێ هندەك بەهرەیێن تایبەت هەنە."

**مایجەری دەستێ خوە دانا سەر ملێ کچا خوە.**

- **"تە ئاگەهـ ژ وێ ڤەرەبالغێ هەیە یا ئەڤ شەڤە ژ پێلێن بای دەردکەڤیت."**
- **"بەلێ."**
- **"پێدڤیە سۆباهی بەلەمێ بکەمە د دەریاچێ دا."**
- **"تە ئاگەهـ ژێ هەیە. با یێ پت پتەکێ دکەت؟"**

**پاشی تەماشەی دار چناران دکر کا چەوا دلەرزن.**

- **"ئەو ئەختەرەکا ژیندی یە."**
- **"تە تشتەك نڤیسابوو کو تشتەك "دناڤبەرا دێران دا" هاتیە نڤیسین."**
- **"باشە؟"**
- **"دبیت دناڤ ڤی باخچەی ژی دا تشتەك دناڤبەرا دێران دا هاتبیتە نڤیسین."**
- **"هەرچەوا بیت، سروشت یێ پرە ژ تشتێن نهێنی. بەری نوکە مە بەحسێ ستێرێن ل ئەسمانی دکر."**
- **"هندەك ستێر د ئاڤێ ژی دا هەنە."**

- "دەمێ تو یا بچووك تە دگوتە وان ستێرێن د ئاڤێ دا، ڕۆناهیا ستێران. ل وی دەمی تو یا شاش نەبووی، چونکی هەموو ئەو تشتێن نوکە ل سەر ئەردی هەین، ژ وان کەرەستەیێن خاڤ و دەستپێکی هاتینە بێن ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان ئەڤ ستێرە پێکئینایین."

- "هەتا ئەم مرۆڤ ژی؟"

- "بەلێ، ئەم ژی تۆزا ستێراینە."

- "ئەڤە ئاخفتنا هوزانڤانایە."

- "دەمێ ڕوانەگەهێن ئەسمانی بێن هەرەباش وان تیشکان دگرن بێن ژ گالاکسیێن ب ملیاران سالێن ڕۆناهیێ ژ ئەردی د دوور دهێن، ئەو دشێن نەخشەیێ گەردوونی هەر ژ دەستپێکا پەیدابوونی وی وەرە بگرن ب تایبەت ڕاستەخو پشتی ڕوودانا پەقینا مەزن. هەموو ئەو تشتێ نوکە مرۆڤ دشێتن ل ئەسمانی ببینن، ب تنێ هندەك ڤالاهیێن ئەسمانی نە کو دیرۆکا وان بۆ هزاران و ملیاران سالێن بەری نوکە دزڤڕیت."

- "تشتێ یەکانە یێ فەلەکناس و فیزیازان دشێن بکەن، خواندنا تشتێ بوری یە."

- "نوکە ستێر هند ژێکدوور کەفتینە بەری کو ڕۆناهیا وان بگەهیتە مە."

- "ئەو چەندە بەسە ئەم بزڤڕینە بەری چەند هزار سالان داکو بزانین کو ستێرێن ل ئەسمانی بەری نوکە ل جهەکێ جودابوون ژ وی جهێ نوکە لێ هەین."

- "من ئەڤ چەندە نەدزانی."

- "دەمێ شەڤ یا ئارام و بێدەنگ بیت، ئەم دشێین تێدا بزڤڕینە بەری ملیاران سالێن دیرۆکا گەردوونی. پاشی تەماشەی وی ئاڕاستەی بکەین یێ ئەم ژێ هاتین."

- "بۆ من پتر ڕۆهن بکە."

- "ئەم ژی ژ ئەنجامێ ڕوودانا پەقینا مەزن یێن دروست بووین، ژبەرکو هەموو ماددەیێن گەردوونی ماددەیێن ئەندامی نە. دەمێ ئەم تەماشەی ئەسمانی دکەین، ئەم یێ پێکۆلێ دکەین وان جهان ببینین یێن ئەم لێ ژ دایکبووین."

- "ئەڤە ڕێکەکا سەیرە بۆ دەربڕینا تشتان."

- "هەموو ئەختەر و گالاکسی ژ هەمان ماددەیێن وەکهەڤ پێکدهێن. دبیت ژی دناڤبەرا گالاکسیەکێ بۆ گالاکسیەکا دی ملیاران سالێن ڕۆاهیێ هەبن، لێ ژێدەرێ هەموویان هەر یەکە و هەموو سەر ب یەك خێزان ڤەنە."

**- "ئەز تێگەهشتم."**

**- "باشە ئەو چ ماددەیێن گەردوونی نە؟ ئەو چ ماددە بوون یێن ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان بەری ملیاران سالان پەڤین؟ باشە ئەو ماددە ژ کیڤە هاتبوون؟"**

**- "ئەڤە دێ مینیت نهێنیەکا مەزن."**

**- "بەلێ ئەڤ تشتە بۆ مە یێ گرنگە. چونکی ئەم ژی ژ ڤان ماددەیان پێکهاتینە، ئەم تیشکێن ڤی ئاگرێ مەزنین ئەوێ بەری ملیاران سالان گەردوون ڕۆهن کری."**

**- "ئەڤە ژی پەیڤێن هوزانڤانانە."**

**- "لێ نابیت ئەم خوە ب ڤان ژمارەیان ڤە بگرین. ئەم دشێین بەرەکی بهەلگرین کو ڤەبارێ وی هندی یێ پڕتەڤالەکێ بیت و هزرا خوە تێدا بکەین و بێژین ئەم نەشێین د جیهانێ بگەهین خو هەکە ڤەبارێ وی هندی یێ ڤی بەری بیت. لێ پرسیارا سەرەکی هەر دێ مینیت، ئەرێ ئەڤ بەرە ژ کیڤە هاتیە؟"**

ژ نیشکەکێ ڤە سۆفیایێ ب دەستێ خوە ئاماژە کرە دەریاچێ.

- "من دڤێت ئەز بچمە د بەلەمێ دا."
- "بەلێ پا ئەو یا ب بەندەری ڤە گرێدایە و ئەم نەشێین ڤەکەین."
- "باشە ما ئەم نەشێین پێکۆلێ بکەین."
- "یەلا.. ئەڤ شەڤە جەژنا ڤەشە یوحەنایە. ئەم دشێین بچینە د دەریاچێ دا."

ئەو ژ ترۆمبێلێ هاتنە خوارێ و دناڤ باخچەی دا دەرباز بوون و پێکۆل کر وەریسکێن بەلەمێ یێن ب شووشکێن ئاسنی ڤە گرێدای ڤەکەن، لێ ئەو نەشیان خو وەریسکی ژی بلند بکەن.

ئەلبێرتۆی گوت: "هۆسا دیارە ئەو یێ ب ئەردی ڤە گرێداینە."

- "لێ مە دەم یێ هەی ڤی کاری بکەین."
- "فەیلەسۆفێ ڕاستەقینە چ جاران دانپێدانێ ب شکەستنا دوماهیێ ناکەت... ئاه خوزی ئەم شیابااین ڤی وەریسکی بلند بکەین..."

- هێلدێ گوت: "هێشتا هندەك ستێرێن نوو یێ ل ئەسمانی.

- "بەلێ. چونكی ل نیڤا شەڤێ، شەڤ تارێتر لێ ناهێت."

- "لێ ل وەرزێ ژڤستانێ بریسقینەكا تایبەت هەیە. ئەرێ بیرا تە ل وێ شەڤێ دهێت یا بەری تو بچیە لوبنانێ."

- "ئەو شەڤا یەكێ یا هەیڤا كانوونا دووێ بوو."

- "ل وێ شەڤێ، من بریار دا بۆ تە پەرتووكەكا فەلسەفی بنڤیسم. چونكی ئەز چوومە پەرتووكانا مەزن یا كریستیانساند و پاشی پەرتووكخانا گشتی، لێ من چ پەرتووكێن ب ڤی رەنگی بۆ گەنجان نەدیتن."

- "هەروەكو ئەم یێ ل سەر دوماهیا داڤەكا هوور یا فەروویێ كێڤریشكا سپی روونشتین."

- "ئەرێ تو بێژی كەسەك ب دووراتیا چەندین سالێن رۆناهیێ یێ ژ مە دووربیت."

- "سەحكێ سەحكێ، كەسەكی وەریسكێ بەلەمێ ڤەكر."

- "و پاشی."

- "نەخێر. بەری نوكە ئەز چووبوومە وێرێ و ئەز یا پشتراستم كو بەلەم یا ب وەریسكی ڤە گرێدایە."

- "ژ راست؟"

- "ئەڤ چەندە بیرا من ل سۆفیایێ دئینیت دەمێ بەلەما ئەلبێرتۆی بكارئینای و پاشی هێلایە ل سەر لێڤێن دەریاچێ هەتا چوویە د نیڤەكا ئاڤێ دا. بیرا تە دهێت؟"

- "كی دبێژیت ما نوكە ژی وێ وەنەكریە؟"

- "تو ترانەیان دكەی؟ ب درێژاهیا ڤێ شەڤێ من هەست ب هەبوونا تشتەكی دكر."

- "پێدڤیە ئەز بچمە د ئاڤێ دا و بەلەمێ بزڤرینم."

- "باشە باب دا پێكڤە بچین مەلەڤانیان بكەین."

# دوماهیك

# پرۆفایلێ نڤیسەری

## دیان جەمیل ساڵح

- ل باژێرێ دهۆکێ هاتیە سەر دونیایێ
- دەرچوویێ کۆلیژا زانست پشکا بایۆلۆژی ل زانکۆیا دهۆکێ سالا 2010
- هەلگرێ باوەرنامەیا ماستەرێ یە د زانستێ بۆماوەزانیا خانەیی دا ل سالا 2015
- مامۆستایە ل زانکۆیا دهۆك، کۆلیژا پزیشکی هەر ژ سالا 2012
- ئەندامێ کارا یێ سەندیکا بایۆلۆژییێن کوردستانێ یە/ لقێ دهۆك
- ئەندامێ کارا یێ سەندیکا ڕۆژنامەڤانێن کوردستانێ یە/ لقێ دهۆك
- سەرپەرشتێ بەرپەرێن زانستی و ساخلەمی بوویە ل چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەیان تایبەت گوڤارێن کوردزووم و پێرومەگەزین.
- کارکریە د کار و چالاکیێن چەندین ڕێکخراوێن نە حکومی دا
- پشکدار بوویە د چەندین کۆڕ و سمینار و وۆرك شۆپێن زانستی و ڕەوشەنبیری و ئەدەبی دا کریە، هندەك ژ وان ژی ژ پێشکێشکرنا نڤیسەری ب خوە بووینە
- ڕابوویە ب ڕێڤەبرنا چەندین پۆستێن ڕۆژنامەڤانی مینا "ڕێڤەبەرێ نڤیسینێ و دەستەکا نڤیسەران، هتد).
- بۆ ماوەیەکی ب وەکالەت ڕێڤەبەرێ ڕێڤەبەریا تەندروستی و سەلامەتی یا سەر ب زانکۆیا هۆکێ ڤەبوویە.

**بەرهەمێن چاپکری و نەچاپکری:**

**1- وەرگێڕانا پەرتووکێن زانستی ژ زمانێ ئینگلیزی بۆ زمانێ کوردی**

| ناڤێ پەرتووکێ | دەزگەهێ چاپکرنێ | سال |
|---|---|---|
| 1. بایۆلۆژیا گەردی و خانەیی | وەزارەتا ڕەوشنبیری و لاوان | 2012 |
| 2. مایکرۆبایۆلۆژی | وەزارەتا ڕەوشنبیری و لاوان | 2012 |
| 3. فرمانزانی و کەلاشتنا لەشێ مرۆڤی | ئێکەتیا ڤوتابیێن کوردستانێ | 2014 |
| 4. بۆماوەزانی | ئێکەتیا ڤوتابیێن کوردستانێ | 2014 |
| 5. مشەخۆرزانیا پزیشکی | ئێکەتیا ڤوتابیێن کوردستانێ | 2014 |
| 6. ناڤرێژزانی | ئێکەتیا ڤوتابیێن کوردستانێ | 2014 |

2- وەرگێرانا پەرتووکێن زانستی و چیرۆکان یێن زارۆکان:

| ناڤێ پەرتووکێ | دەزگەهێ چاپکرنێ | سال |
|---|---|---|
| 7. گەریانەک بۆ ناڤ لەشێ مرۆڤی | ——— | ——— |
| 8. بۆچی گیانەوەر بەرەڤ نەمانێ دچن؟ | ——— | ——— |
| 9. سەیروسەمەرێن جیهانا گیانەوەران | ——— | ——— |
| 10. دیاریا سەرێ سالێ | وەزارەتا ڕەوشنبیری و لاوان | 2013 |
| 11. هیڤیا ماسیێ | وەزارەتا ڕەوشنبیری و لاوان | 2013 |
| 12. بۆچی بۆبی نەوێریت بفڕیت؟ | وەزارەتا ڕەوشنبیری و لاوان | 2013 |
| 13. ڕەوشتێ سلاڤێ | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |
| 14. ڕەوشتێ پێکڤە کارکرنێ | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |
| 15. ڕەوشتێ کرنا یاریان | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |
| 16. ڕەوشتێ سوپاسیکرنێ | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |
| 17. زەحمەت نەبیت | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |

3- ئامادەکرن و وەرگێرانا پەرتووکێن گشتی:

| ناڤێ پەرتووکێ | دەزگەهێ چاپکرنێ | سالا چاپکرنێ |
|---|---|---|
| 18. 100 کاریگەرترین کەسایەتی د دیرۆکێ دا و ل پێشیا وان محمد (س.خ) | ——— | ——— |
| 19. سێکس د چوارچۆڤەیەکێ ڕەوشەنبیری دا | پەرتووکخانا جزیری | 2016 |
| 20. ڤێ بەڤێ بخۆ! | دەزگەهێ نالبەند | 2016 |
| 21. ئەو مریشکا دڤیای بفڕیت (ڕۆمان) | کەسایەتی | 2016 |
| 22. ڕەجماندنا سوڕەیایێ (ڕۆمان) | کەسایەتی | 2016 |
| 23. ڕۆژانێن گوهدرێژەکی (ڕۆمان) | ——— | ——— |
| 24. هزار رۆژێن گەش (ڕۆمان) | ——— | ——— |
| 25. دەمژمێرا بەغدا (ڕۆمان) | ——— | ——— |
| 26. جیهانا سۆفیایێ (ڕۆمان) | پەرتووکخانا جزیری | 2017 |

# ناڤەرۆك

# تو کی؟
# جیهان چەوا پەیدابوویە؟

ئەڤە ئەو هەردوو پرسیارن یێن کچەکا چواردە سالی ب ناڤێ سۆفیا پشتی ژ قوتابخانێ دزڤڕیت، ل سەر کارتەکێ دناڤ سندوقا پۆستەیێ بەر دەرگەهێ مالا خوە دا دبینیت کو ژ لایێ فەیلەسۆفەکێ نەدیار ڤە بۆ وێ هاتبوونە هنارتن. ل دەستپێکێ سۆفیا حێبەتی دمینیت و بەردەوام دگەل ناخێ خوە دانوستاندنێ ل دور ڤان پرسیاران دکەت هەتا ل ڕوژا ل دووڤ دا ئەڤ فەیلەسۆفە نامەیەکا دی بۆ فڕێکەت و ب درێژاهی بەحسێ دیرۆکا پەیدابوونا فەلسەفێ بۆ دکەت. ب ڤی ڕەنگی سۆفیا دگەل ماموستایێ خوە دەست ب گەشتەکێ بۆ ناڤ جیهانا فەلسەفێ دکەن.

د ڤێ رۆمانێ دا، جوستاین کاردەرد چوارچۆڤەیەکی فەلسەفی یێ بالکێش و ب زمانەکێ ئەدەبی یێ سادە چەندین مژارێن فەلسەفەیا رۆژئاڤای هەر ژ پەیدابوونا ئەفسانەیان و فەیلەسۆفێن گریکی یێ کەڤن هەتا سەردەمێ مە یێ ئەڤرۆکە شرۆڤە دکەت، ب تایبەت مژارێن گرێدای ل دور بنیاتێ پەیدابوونا گەردوونی و هەبوونا خودای و ئەگەرێن ئافراندنا مرۆڤان ل سەر ڕوویێ ئەردی، زێدەباری مژارا ئەقلێ مرۆڤی و بنەمایێن هزرکرنەکێ و حەز و خواستێن مرۆڤی یێن ئازاد.

